رۆمان

# سەناریا

## لەنێوان فریشتە بوون و شەیتان بووندا

محەمەد لەحسین حوسێن



چاپی یەکەم
2019

# پێناسەی کتێب

**ناوی کتێب: سەناریا لەنێوان فریشتەبوون و شەیتان بووندا**

**نووسینی: محمد تحسین حسین**

**بابەت: ڕۆمان**

**نۆبەتی چاپ/ یەکەم چاپی 2019**

**چاپخانە: هێڤی**

**نرخ: 3500**

**بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (165) ساڵی 2019 پێدراوە**

- ڕوونکردنەوەیەکی پێویست لە بنەڕەتدا ئەوە ڕۆمانە ناوی ئافرەت لە نێوان فریشتە بوون و شەیتان بووندا بوو بەلاَم بە هۆی ئەوەی زیاتر باس لە ڕۆڵی دوو کەسایەتی جیاوازی ئافرەت بەناوی سەناریا دەکات، ئەوا ناوەی بۆ دانراوە کە کەسایەتیەکیان وەك فریشتە دەبێتە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی خەڵکی ئەوەیتریان وەك شەیتان هۆکارێکە بۆ لەناووچوونی ژیانی کەسانێك.
- ئەو ڕۆمانە بەشێکی زۆری لە ڕووداوی ڕاستەقینەی ژیانی چەند کەسێك وەرگێردراوە بەتایبەتی ئەو ڕووداوانەی پەیوەندیان بە قەزاو قەدەروە هەیە هیچ خەیاڵێکی نووسەری تیادا بەکار نەهاتووە.

بەدرێژای ژیانم بیرم لەوە دەکردەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕۆمانێك سەبارەت بە ژیانی خۆم بنووسم و بڵاوی بکەمەوە، ڕۆمانی ژیانی کەسێك کە پڕاو پڕە لە ناخۆشی دەردەسەری، پێم وابوو هیچ کەسێك لە دوونیادا وەك من بەدبەخت و چارە ڕەش نیە، کەسێك بەدرێژای ژیانی نەخاوەنی باوکێکی بەسۆز و نەخاوەنی خوشك و برایەکی خنجیلانەیە چۆن دەتوانێت لەو دوونیا پان و بەرینە بەتەنها بژێت، من خۆم تەنیا و تەنیا لەگەڵ دایکێکی پیر ژیانێکی پڕ لەدەردەسەری دوور لە سۆزی بێ باوکی بەسەر دەبەم.

زۆرجار پێم وابوو ئەگەر ژیانی خۆم بنوسمەوە و بیکەم بە ڕۆمانێك ئەوا خوێنەرێکی زۆری دەبێت و لە بازاردا ناوبانگێکی باش دەردەکات.

لەبەر ئەوەی من باوکم نەدیووە و خوشك و برام نەبووە لەژیاندا، وام هەست دەکرت تەنها نەبوونی ئەوانە دەبنە هۆکاری بەدبەختی و چارە ڕەشی بۆ مرۆڤ، بۆیە دەمگووت ئەگەر ژیانی خۆم بکەم بەڕۆمانێك بێگومان خوێنەرێکی زۆری دەبێت، بەڵام دوایی ئەوەی ژیانی چەند کەسێکی ترم بینی ژیانی خۆم لە چاو ئەواندا زۆر لەلا ژیانێکی سادە و خۆش بوو، لەبەرئەوە بڕیارمدا واز لەژیانی خۆم بهێنم و دەست بە نووسین و باسکردنی ژیانی ئەوان بکەم،کە چیرۆکی ژیانی ئەوانیش بەژیانی منەوە پەیوەستە.

بیرۆکەی نووسینی ڕۆمانەکەم لە زستانێکی زۆر سارد و ناخۆشەوە دەستی پێکرد، لەو زسانەی کە تەواوی ژیانم تیایدا پێچەوانە بوویەوە و گۆڕدرا.

ئەم ساڵ بەراورد بە ساڵەکانی تری ژیانم زستانێکی زۆر سارد و ناخۆشە، هەورەکان بەری ئاسمانیان گرتووە ڕێگە نادەن تەنها یەك تروسکی تیشکی خۆر بگاتە سەر زەوی، منیش زۆر ڕقم لە جۆرە کەش و هەوایەیە، بەجۆرێك لەم جۆرە کەش و هەوایەدا هەست بە هیچ تروسکێکی ئومێد و خۆشی ناکەم، بەتایبەتی لەو زستانەدا من دڵتەنگیەکەم لەڕادەبەدەرە.

ئەگەرچی زۆر کەس خۆزگە بەو ژیانەی من دەخوازێت و هیوایەتیان ئەوەیە هاوشێوەی من جۆرە ژیانێکیان هەبێت، جگەلەوەی من قوتابی کۆلێژی پزیشکیم و دایکێکی زۆر دەوڵەمەندیشم هەیە، بەڵام بە هۆی ئەوانەوە هیچ هەست بەدڵ خۆشی ناکەم، لەبەرئەوەی تاوەکو ئێستا من باوکی خۆم نەبینیوە و نازانم باوکم کێە، تەنانەت هیچ خزم و کەس و کارێکی نزیکیشم نیە، هەرکاتێك لە کۆلێژ هاوڕێیەکانم باوکیان دیت بەدوایان دەبینم بەچ جۆرە دڵخۆشییەکەوە لەگەڵ باوکیان  بۆ ماڵەوە دەگەڕێنەوە، گەرچی ئەوان لە رووی مادییەوە هەزار و یەك کێشەیان هەیە، بەڵام هەموو خەمێکی دوونیایان هەر لەگەڵ بینینی یەك خەندەی باوکیان بەلادا دەچێت و خۆشیەکانیان دەست پێدەکات، ئەوا ئەوکاتی من لەگەڵ ئەو هەموو سەروەت و سامانەی هەمە هەست بە دڵتەنگ بوون و  بێنازبوون لە سۆز و بەزەی باوك دەکەم.

هەر لەگەڵ دەست پێکردنی یەکەم رۆژی قوتابخانەم من هەستم بە بۆشاییەکی زۆر گەورە لە رۆحم و لەژیانمدا کردووە، لەگەڵ هەرساڵێك لە تێپەڕبوونی ژیانم زیاتر و زیاتر هەست بە تەنیا و کەلێنی بێ باوکی و کەس و کاری دەکەم.

لەم چەند رۆژەی بەر لەئێستا دڵتەنگیەکەم زۆر زیاتری کردووە، بەتایبەتی دوایی ئەوەی تاکە کەسی ژیانم و پشت و پەنایی من دایکم بارودۆخی زۆر خراپ بووە و نەخۆشیەکی کوشندەی گرتووە.

بۆیە بەجۆرێك دڵ تەنگم مامۆستا و تەنانەت هاوڕێەکانیشم هەستیان پێم کردووە، نورجان کە خۆشەویسترین هاوڕێی منە دوایی دەرسەکان هاتە لام گووتی سەناریا گیان تۆ بۆچی دڵی خۆت تەنگ کردووە؟، پێم بڵێ چ کەسێك وەك تۆ بەچانسە ئەوەتا تۆ قوتابی کولێژی پزیشکیت و خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆریت و بۆچی وا لەخۆت دەکەیت و دڵی خۆت بەو جۆرە تەنگ دەکەیت.

نورجان گیان تۆ ئاگاداری بارودۆخی من نیت، دایکم ماوەیەکە زۆر نەخۆشە و دکتۆرەکان هیچ هیوایەکی مانەوەیان لەژیاندا پێی نەداوە، خۆت دەزانیت من جگە لە دایکم هیچ کەسێکی تر نیە، دایکیشم بەردەوام پێم دەڵێت سەناریا کچی شیرینم دەمەوێت بەر لەوەی بمرم ببینم کە تۆ بەدڵی خۆت لەگەڵ کورێك هاوسەرگیری دەکەیت، لەتەواوی ژیانم تەنها تاکە داوایی من لە تۆ ئەوەیە بەر لەمردنم هاوسەرگیری بکەیت و بکەویتە ژیانی خۆشی خۆتەوە.

سەناریا گیان چۆن دەبێت تۆ جگە لە دایك کەسێکی تر نەبێت؟، هەربەڕاستی چۆن تۆ خاڵ یان مام یاخود کەسێکی نزیکت نیە؟، ئەوە شتێکی زۆر سەیرە من پێم وایە نهێنیەکە لەو کارەدا هەیە دایکت لێت دەشارێتەوە، ئایا تۆ هیچ کاتێك ئەو پرسیارەت لە دایکت کردووە کە باوکت و کەس و کارت لە کوێن و چیان بەسەر هاتووە؟.

بەڵێ نورجان زۆر جار ئەو مەسەلەیەم لەگەڵ دایکم باس کردووە، بەڵام هەرکاتێك ئەو پرسیارە لەو دەکەم زۆر تورەدەبێت دەڵێت جارێکی تر باس لەو بابەتە نەکەیتەوە.

ئەوەی لەلای من سەیرە ئەوەیە لەوکاتەوەی دایکم تووشی ئەو نەخۆشیە بووە، بەردەوام دەڵێت بەڕاستی ئۆندەر دووعاکانت قبوڵ بوو هەقی خۆمە تووش بە دەردێکی وا قورس ببم!.

منیش نازانم ئۆندەر کێیە کە بەردەوام دایکم ناوی ئەو دەهێنێت و دەست بەگریان دەکات، بەجۆرێك دەگریت وەك بڵێت منداڵێکە لە برسان بۆ شیری دایکی دەگریت بەڵام ئەو منداڵە دایکی نەماوە شیری پێبدات و گریانەکەی بوەستێت، زۆرجار هاوار و ناڵە و نووزانەوەی دایکم دەگاتە ئەو پەڕی ئاسمان وەك بڵێت تاوانێکی زۆر گەورەی کردبێت، منیش کاتێ دایکم بەوبارودۆخەوە دەبینم ناچار لەگەڵ ئەو دەست بەگریان دەکەم.

نورجان گیان ئێستاش دایکم زۆر بارودۆخی خراپە تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە، بەداخەوە نەخۆشییەکەشی لە جۆرە قورسەکەیە، هیچ شك و گومانێکی تیادانیە

لە ماوەیەکی زۆر کەمدا گیانی دەسپێرێت، منیش زۆر لەو رۆژە دەترسم بەتەنیا چۆن ژیانی خۆم بەڕێ بکەم و دوایی ئەو چۆن بژیم؟.

کچە فریشتەکە بۆچی هاوسەرگیری ناکەیت؟، ئەوە چەندین جارە بارشی هاوپۆلمان داوای تۆ دەکات، بەڵام تۆ بەبێ ئەوەی هۆکارێك هەبێت رەتی دەکەیتەوە، ئەو کوڕێکی زۆر جوان و رێك و پێك و باشە، هیوای هەموو کچێکی ئەم کۆلێژەیە ئەو کوڕە بچێتە داوای، کەچی تۆش بەبێ هۆکار رەتی دەکەیتەوە، دڵنیام ئەو کوڕە بۆ تۆ دەبێتە پشت و پەنا.

نورجان گیان منیش ئەوم پێ کوڕێکی زۆر رێك و پێك و باشە بەڵام خۆت دەزانی لە رووی داراییەوە بنەماڵەی ئەوان زۆر لە خوار ئێمەن، هەرچەندە دایکم کەسێکی زۆر باشە بۆ خەڵکانی هەژار، بەڵام دەترسم من رازی بم کەچی دایکم رەتی بکاتەوە و رێگە نەدات هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کوڕە بکەم، ئەوەی ڕاستی بێت من نامەوێت دڵی ئەو کوڕە باش و چاکە بشکێنم بۆیە هیچ بیرم لێنەکردۆتەوە بەدایکم بڵێم، خۆدەزانی من چۆن کەسێك ناتوانم هیچ کەسێك ئازار بدەم بەتایبەتی خەڵکانی هەژار، تاوەکو ئێستا نەمتوانیوە دڵی هیچ کەسێك بشکێنم هەربۆیە ئێوە بە کچە فریشتەکە بانگم دەکەن.

بەڕاستی تۆش زۆر سەیریت سەناریا گیان جارێك تۆ بە دایکت نەگووتوە چۆن دەزانیت رەتی دەکاتەوە و ناهێڵێت لەگەڵ ئەو کوڕە هاوسەرگیری بکەیت؟، تۆجارێك هەوڵبدە قسە لەگەڵ دایکت بکەیت ئەوکات بۆت بەدیار دەکەوێت.

ئەو کوڕە جارێکی تر بەمنی گوتۆتەوە کە بە تۆبڵێم بیرێکی تر لەو بابەتە بکەێتەوە.

زۆرباشە نورجان گیان بەڕاستی من بارشم زۆر بەدڵە و زۆریشم خۆش دەوێت، بۆیە تاوەکو ئێستا نەمویستووە ئەو کوڕە دڵی لێم بشکێت، دەترسم دایکم رازی نەبێت لەلای ئەو ببمە کەسێکی خراپ. بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەو شەو لەگەڵ دایکم دادەنیشم و ئەو بابەتەی لەگەڵ باس دەکەم.

ئەو رۆژە زۆر بەسەرقاڵی و بیر پڕی گەڕامەوە ماڵەوە، بینیم ئەگەرچی دایکم خۆی باروودۆخی زۆرباش نیە بەلاّم زۆر بەجوانی مێزی نانخواردنی رازاندۆتەوە.

نازانم چۆن وەسفی دایکم بکەم بلێم کەسێکی باشە وەك فریشتەیە، چۆن دەبێت مرۆڤ هیچ کاتێك نابێت بە قریشتە تەنها دەمارێکی شەیتانی لەدڵدا هەر هەیە، هەرلەبەر ئەوەیە دایکم هەندێك کات رەفتاری فریشتەکانی نیە، یاخود وەسفی دایکم بکەم و بلێم کەسێکی زۆر توڕە و توندە، لەبەرئەوەی لەسەر هەندێك بابەت بە شێوەیەك لێم توڕە دەبێت وەك بلێت کچی ئەو نەبم، لەگەڵ ئەوەشدا بەگشتی دایکم بۆ من کەسێکی زۆرباشە و وەك فریشتە دێتە بەرچاوم ئەگەرچی هەندێك کاتیش زۆر لێم توڕە دەبێت کاتێ باسی باوك و خزم و کەسەکانمان دەکەم، بەلاّم بەهیچ شێوەیەك رێگەی نەداوە هیچ کەم و کورپییەکی ژیانم هەبێت.

هەندێکجاری زۆر لە هەڵس و کەوتەکانی توڕەدەبم، بەتایبەتی ئەوکاتەی پرسیاری دەربارەی باوکم و کەس وکارەکەمانی لێدەکەم، زۆر بەتوڕەی وەك جەلادێکی دیکتاتۆر وەلاّمم دەداتەوە و ناهێلێت نە هیچ لەبارەی ئەوانەوە بزانم نە هیچ پرسیارێکیش بکەم.

ئەوەی لەلای من زۆرسەیرە تاوەکو ئێستا بەهیچ شێوەیەك گوێبستی ئەوە نەبووم دایکم رۆژێك لە رۆژان بە خراپی باسی باوکم و کەس و کارەکانمان بکات، تەنها ئەوە نەبێت زۆربەی کاتەکان گوێ بیستی ئەوە دەبم دەڵێت ئۆندەر گیان بمبەخشە هیچ گوناهی من نەبوو هەمووی دایکم بوو پێی کردم، منیش نازانم لەوەیان مەبەستی چیە و جورئەتی ئەوەشم نیە پرسیاری لێبکەم.

بەهەرحاڵ ئەو رۆژە هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە بلێم کوڕێکی پۆلەکەی خۆمان هاتۆتە داوام، خۆیی و خیزانەکەی دەیانەوێت بێنە ماڵمان بۆ ئەوەی خوازبێنی من بکەن، بەهۆی سەرقاڵیم بەو بیرکردنەوانە نەمدەزانی چۆن نانەکەم دەخۆم.

دایکم هەستی پێمکردوو گووتی ئەوە چیتە بۆچی بە جوانی نانەکەن ناخۆی بیرت لەکوییێە؟.

گووتم هیچ دایکە گیان هیچ نیە.

گووتی من دایکی تۆم هەستت پێدەکەم و دەزانم تۆ شتێکت لە نێو دڵە ترست لە درکاندنی هەیە، ئێستا نانەکەت بخۆ دوایی نان خواردن بۆم باس دەکەیت چی روویداوە؟.

منیش تەنها بۆئەوەی کەمێك دوابکەوێت گووتم باشە دایکە گیان دواتر هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم.

دوایی ئەوەی نانمان خوارد و سەرمیزەکەمان کۆکردەوە، من زۆر بەبێ دەنگی لە کوچێکی ژوورەوە دانیشتم و خۆم بە پەرتووك خوێندنەوە خەریك کرد، دەمووویست دایکم جارێکی تر لێم بپرسێتەوە کە چی روویداوە نەوەك خۆم ئەو باسەی لەگەڵ بکەمەوە، بەڵام کات گەیشتە درەنگانێکی شەو دایکم هیچ قسەیەکی دەربارەی دڵتەنگییەکەم لەگەڵ نەکردم.

کاتێك کات بەرەو نیوەی شەو رێدەکرد منیش شتەکانم کۆکردەوە و وویستم بۆ ژوورەی کەی خۆم برۆم بخەوم، هەرکە هەڵسامەوە دایکم گووتی سەناریا دانیشە کارم پێتە، بۆچی هیچت باس نەکرد وادەزانیت من لە بیرم کردووە، من دایکی تۆم هیچ شتێکی تۆ لەبیر ناکەم لەکەیەوە بیرم بەتۆوە سەرقاڵە بۆم باس بکە بیرت لەچی دەرکردەوە؟.

منیش لەدڵی خۆمدا گووتم هەرچی دەبێت با ببێت کاتی ئەوە هاتووە هەموو شتێکی پێبلێم، دوایی ئەوەی باسی هەموو شتێکم لەگەڵی کرد، گووتی زۆرباشە مادەم تۆ بەدڵی خۆتە منیش زۆر زۆرم پێ خۆشە دەزانم زۆرم لە ژیان نەماوە تەنها تاکە ئومێدی من بینینی هاوسەرگیری کردنی تۆیە دوایی ئەوە منیش زۆر بەئاسوودەیی دەمرم.

گووتم دایکە ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت مردنی چی تۆ حاڵت زۆرباشە چاك دەبیتەوە و بەیەکەوە ژیانێکی زۆر خۆش بەسەر دەبەین.

نەخێر کچی شیرینم ئەگەر ئەو کوڕە بەدڵی خۆتە و دەزانیت لەگەڵ ئەو ژیانێکی خۆشت دەبێت و ژیانێکی ئاسودە و خۆشت بۆ دروست دەکات تا زووە پێیان بڵێ بێنە داوات، لەبەر ئەوەی من دەزانم کاتێکی زۆرم لە ژیان نەماوە و دەمەوێت هاوسەرگیری تۆ ببینم ئەو کات بەئاسوودەی چاوەکانم لەو ژیانە نەفرەتیە دابخەم و بمرم.

منیش زۆر لەلا سەیر بوو دایکم هیچ باسی حاڵ و گوزەرانی ئەو کوڕەی نەکرد، گووتم زۆرباشە دایکە گیان پێیان دەڵێم بەزووترین کات بێنەماڵمان.

زۆری نەبرد دایکم هەر خۆی هەموو کارەکانی مارەبڕینی منی ڕێکخست، نازانم هۆکاری چی بوو دایکم پەلەیەکی زۆری لەکارەکە دەکرد.

دوایی ئەوەی مارەبڕینی من ئەنجامدرا بارش بە هۆی ئەوەی لە دەروەی وولات بانگهێشت کرابوو، دوایی مارەکردنی من بە چەند رۆژێك گەشتی دەروەی وولاتی کرد.

ئیتر دوایی ئەوەی من و بارش بووینە دەست گیرانی یەکتر، لەگەڵ هاتنی بارش بۆ نێو ژیانمەوە من تاڕادەیەکی باش دڵم خۆش بوو هەندێك خەمی بێ باوکی وکەس و کاریم لەیاد کرد، بەڵام زۆری نەبرد دایکم بە هۆیی نەخۆشییەکەیەوەی باروودۆخی تێکچوو بۆ نەخۆشخانەمان گواستەوە، ئیتر دوایی ئەوە زۆر نەفرەتم لە چانسی خۆم دەکرد، بەردەوام دەمگووت نازانم بۆچی ژیانی من وایە لەدوایی هەر خۆشییەکی من دەبێت ناخۆشیەك بەدوایی دابێت.

هەرجارێك کە دەچوومە نەخۆشخانە بەترس و لەرزێکی زۆرەوە بۆ لای ژوورەکەی دایکم هەنگاوم دەگرت، پێم وابوو لە ناکاوێك دکتۆرەکان هەواڵی ئەوەم پێدەدەن ئیتر دایکت تەمەنی دریژی بۆ ئێوە بەجێهێشت و هیوادارین ئەمە دواین ناخۆشی ژیانتان بێت.

بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر دایکم بمرێت من چۆن بتوانم لەسەر رووی ئەو زەویە بەتەنها ژیان بەسەر ببەم، جگەلەوەش هێشتا کۆمەڵێك نهێنی هەن سەبارەت بەژیانی من تەنها دایکم پێی ئاگادارە، من هیچ دەربارەی ئەو شتە شاراوانە نازانم هیچ هەوالێکم دەربارەیان نیە.

ئیتر لە ئێستاوە تەنها یەك کەسیی نزیکم هەیە دڵمی پێ خۆش بکەم ئەویش بارشی دەست گیرانمە بەڵام لەچانسی من ئەویش بەهۆی کارە بەپەلەکەیەوە چۆتە دەرەوەی وولات، لەو کاتەدا هیوای ئەوەم دەخواست بەرلەوەی دایکم شتێکی بەسەر بێت بارش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەرچی نەبێت دڵنەوایم بکات و کەمێك لەو ئازارە زۆرەم کەم بکاتەوە.

دوایی ئەوەی دایکم بەو ئازارە زۆرەیەوە چەند رۆژێك لە نەخۆشخانە مایەوە، بەرلەوەی بەتەواوەتی چاوەکانی لەیەك بنێت و کۆچی یەکجاری بکات دکتۆرکان منیان بانگ کرد.

گووتیان دایکت دەیەوێت لە کۆتا ساتەکانی ژیانی کەمێك قسەت لەگەڵ بکات، ئەوەی راستی بێت بەداخەوە دایکت هیچ هیوایەکی لە ژیاندا نەماوە.

دوایی ئەوەی چوومە تەك دایکم چاوم بەو باروودۆخەی دایکم کەوت و خۆم پێ نەگیرا دەستم کرد بە گریانێکی زۆر بەکوڵ، بینم ئەو کەسەی سالآنێکە لەگەڵم دێت دەچێت و دەستەکانم دەگرێت پێم دەڵێت کچی شیرینم تا من بمێنم تۆ هیچ خەمێك نەبێت، ئێستا خۆی وەك منداڵێکی بێدەسەلآتی لێهاتووە، منداڵێك کە توانایی هیچی نیە بۆ خۆشی بکات، بەڵام لەگەڵ سەیرکردنی چاوەکانی هێزێکی شاراوەی تیایە و پێدەبەخشێت، بەڕاستی دایکم وەك فریشتە وابوو گەرچی من فریشتەکان نەبینووە دڵنیام ئەگەر ئەوانیش وەك دایکم بەسۆز بن ئەوا هیچ گومانم نیە کە زۆرباشن.

دايكم بانگی كردم سەناريا كچی شيرينم مەگری زياتر ليم نزيك بەوە، توانام نيە دەنگم زۆر بەرز بكەمەو، جگەلەوەش كاتێكی زۆرم لەبەر دەستدا نەماوە هەندێك وەسييەتم هەيە دەمەوێت پێت بڵێم.

بە فرمێسكە ميهرەبان و گريانە بەكۆڵەكەمەوە لەدايكم نزيك بوومەوە و لە باوشم كرد، بڵێ دايكە گيان گوێم لێتە چيت هەيە بەگوێی كچە بێكەسەكەتدا بچرپێنە.

دايكم بەدەستە چرچ و لۆچ و لەرزۆكەكانی وەك هەموو جارێك دەستی بە سەر رووخسارم داهێنا و فرمێسكەكانی سڕیّ و گووتی كچی شيرينم كەی من تۆم فێركردووە لەبەرامبەر ناخۆشييەكاندا چۆك دابدەيت و بگريت، كچە بێنازەكەم پێبكەنە دەمەوێت بەرلەوەی بە يەكجاری چاوەكانم لە يەك بنێم پێكەنينی كچە جوانەكەم لەگەڵم بێتە ژێر گڵ و بە ئاسوودەی و ويژدانێكی رەحەتەوە سەر بنێمەوە، ئەوەی هيوايەتی ئەو بوو بۆ تۆ بەڵكو هێنابێتمە دی و خۆشم لە ئازاری ويژدانم رزگاربكەم.

هيوايەتی كێ پێم بڵێ...

هيچ كەسێك كچم...كاتی زۆرم بەدەستەوە نيە هەموو شتێكت بۆ باس بكەم بەلاّم رۆژێك دادێت خۆت لەهەموو شتێك دەگەيت، كچی شيرينم من زۆر داوای لێبووردن لەتۆ دەكەم بۆ ئەوەی هەندێك كات بە خراپە مامەڵەم لەگەڵ تۆ كردووە دڵنيابە ئەوەشم تەنها لەبەر چاكەی تۆ بووە.

دەزانم ئێستا كاتێكی زۆرم بەدەستەوە نەماوە، لەبەر ئەوە تكات لێدەكەم بە باشی گوێ بۆ قسەكانم بگرە، لەدوايی مردنم نەكەيت هيچ دڵت بۆمن تەنگ بكەيت، پشتی خۆت بە بارشی دەستگيرانت ببەستە، لەبەر ئەوەی لەدوايی من لەو زياتر كەسێكی تر نامێنێت ئاگاداری تۆ بێت و لەگەڵت بێت، بەزووترين كات هەوڵبدە كاری گواستنەوەكەت بۆ ئەنجامبدرێت دەزانم من ئەو رۆژە نابينم بەلاّم وەسيەت بێت هيچ دڵی خۆت تەنگ نەكەيت وابزانە من هەردايكی تۆ نەبوويمە هيچ دڵت بۆم تەنگ مەكە.

ئاخر چۆن دایکە من دەتوانم وابکەم؟...

وەك هەموو جارێك بە تووڕەییەوە گووتی پێت دەڵێم قسەکانم پێمەبڕە کاتێکی زۆرم لەبەر دەست نەماوە، جگەلەوەش من لەو گۆڕستانە بنێژە کە هەموو جارێك بۆتم باس دەکرد، لەوێ شوێنی گوڕێکم بۆ خۆم حازرکردووە هەر لەوێش من بەخاك بسپێرن، هەروەها کچی شیرینم من تۆم وەك فریشتەیەك پەروەردەکردووە، هیوایەتم ئەوە بوو ببیت بەدکتۆر بۆ ئەوەی یارمەتی خەڵکانی هەژار بدەیت و بە بێبەرامبەر نەخۆشییەکانیان چارەسەربکەیت، دڵنیام لە کچێکی فریشتەی وەك تۆ کاری خراپ نابینرێت.

منیش بەدەم گریانێکی بە کۆڵەوە دەمگووت باشە دایکە گیان هەرچی تۆ بیڵێت ئەو دەکەم هەرچی بڵێت ئەو دەکەم دەبێ تەنها کار بۆ چارەسەری گرفتی هەژارەکان بکەم...

ئەها کچی شیرینم با ئەوەش لە یاد نەکەم ئەو قوتووی هەموو کاتێك لە دەستمدا دەتبینی، ئەویش بخەرە نێو رووبارێکەوە با هیچ کەسێك نەیکاتەوە، من خۆم ئەو کارەم دەکرد بەڵام بە هۆی تێکچوونی بارودۆخم ناتوانم هەڵستمەوە و ئەو کارە ئەنجامبدەم.

زۆرباشە دایکە گیان هەرچی تۆ بڵێت من ئەنجامی دەدەم دڵنیابە...

دڵنیابم کچی شیرینم...

بەڵی دایکە گیان دڵنیابە هەموو وەستەیەتەکانت بەبێ کەم وکوڕی ئەنجامدەدەم.

دایکم بە زەردەخەنەیەکەوە من لە تۆ دڵنیام کچی شیرینم دڵنیام، بەڵام لەلام روونە هەمووی جێ بەجێ ناکەیت لەیەکێك لە وەسیەتەکانم دوو دڵی داتدەگرێت و وەسییەتەکەم جێ بەجێ ناکەیت...

لەوكاتەدا دەموویست بڵێم دایکە گیان چۆن دەزانیت کە وەسیەتێکت جێبەجێ ناکەم و کامە وەسیەتە جێبەجێی ناکەم؟، لە ناکاو دکتۆرێك خۆی بە ژوورەکەداکرد و گووتی ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بچیتە دەروە و دایکت کەمێك پشووبدات و ئێمەش بە کارە پێویستییەکانی خۆمان رابگەین.

بەناچاری چوومە دەروە و ئەو شەوە تاوەکو بەیانی لەسەر کورسیەکانی نێو سالۆنەکەدا پاڵکەوتم و هەر بیرم لەوە دەکردەوە دەبێت کامە وەسیەت بێت دایکم دەڵێ جێبەجێی ناکەی، جگەلەوەش بەهۆیی ئەوەی چەند رۆژێك بوو خەوم لێنەکەوتبوو خەو منی بردەوە کەوتمە خەوێکی قووڵ، تائەو کاتەی لەگەڵ دەنگە دەنگی بەرزی دکتۆرەکان کە بۆ ژوورەکەی دایکم رایاندەکرد خەبەرم بوویەوە.

زۆر ترسام لەوەی دایکم شتێکی بەسەر هاتبێت، بۆیە بەڕاکردن بۆلای ژوورەکەی دایکم چووم و دکتۆرەکان رێگەیان نەدام بچمە ژوورەوە، وەك شتێك هاوارم دەکرد رێگەم بدەن چاوم بەدایکم بکەوێت، لەو کاتەدا دکتۆر هاتە دەروە و گووتی بەداخەوە دایکت نەیتوانی لە ژیاندا بەردەوام بێت.

منیش وەك ئەوەی بڵێت خەنجەرێك بە دڵم دابچێت هاوارێکم لێهەڵسا تەواوی خەڵکانی نەخۆشخانە لەدەوری من کۆبوونەوە و لەو کات بەدواوە لە هۆش خۆم چووم کە چاوم کردەوە دایك و باوك کەس و کاری بارش لەدەورم کۆبوبونەوە.

گوێم لە دایکی بارش بوو هاواری کرد و گووتی سوپاس بۆ خوا خەبەرت بوویەوە تۆ بۆ ماوەی سێ رۆژە لە هۆش خۆت چوویت و خەبەرت نەبۆتەوە...

دایکم دایکم کوانێ بەو بڵێن بێتە لام پێویستە قسە لەگەڵ دایکم بکەم...

لەکاتەدا دکتۆرێك هات و دەرزییەکی ئارام کەرەوەی لێدام ئاگام لە باس و خواستی دوونیا نەما...

دوایی ماوەیەك مانەوەم لە نەخۆشخانە دایك و باوكی بارش منیان بۆ ماڵە خۆیان بردەوە و پێیان گووتم كچی شیرینم تاوەكو بارش لە دەروەی وولآت دێتەوە تۆ لێرە لەگەڵ ئێمە بژی و مەگەڕێیەوە ئەوخانووەی لەگەڵ دایكت بووی.

ئەوكات زانیم كە من ماوەیەكی زۆرە هیچ ئاگام لە باس و خواستی دوونیا نەبووە تەنانەت لاشەی دایكمیشان ناشتووە...

خێرا گووتم دایكمتان لە كوێ شاردۆتەوە، ئەو حەزی دەكرد لە فلآنە جێگادا بە خاك بسپێردرێت...

دایكی بارش گووتی هیچ دڵ لە دڵ مەدە بەرلەوەی بمرێت بەمنی گووتبوو كە حەزدەكات لە كوێ بەخاكی بسپێرین ئێستا گۆڕەكەی هەر لەو جێگایەیە كەخۆی حەزیدەكرد.

دوایی ئەوەی گوێم لەوە بووم كەمێك دڵم ئارام بوویەوە گووتم سوپاس بۆ خوا لەبەر ئەوەی یەكەم وەسیەتی دایكمم پشت گوێ نەخست وجێبەجێ بوو.

دوایی ئەوەی ماوەیەك بەسەر كۆچی دوایی دایكم تێپەری، بڕیارمدا سەردانی گۆڕی دایكم بكەم، هەرچەندە ئەوكات دایك و باوكی بارش زۆر پێداگرییان لەوەكرد بەتەنها نەچم، بەلآم گووتم حەزناكەم هیچ كەسێكم لەگەڵ بێت و حەزدەكەم تەنیا بم كەمێك چێژ لەو تەنیایە وەربگرم، بەلآم چ چێژێك!... كچێك ئیتر دەبێت لەسەر گۆی زەوی ژیان بەتەنهایی بەرێبكات تا ئەوكاتەی لە ژیاندایە جارێكی تر كەسێكی نزیكی خۆی نابینێتەوە دەردە دڵی لەلا بكات.

دوایی ئەوەی چوومە سەر گۆڕی دایكم وام هەست دەكرد كە ئەو دەمبینێت بۆیە دەموویست وەسیەتێكی تر ئەو بهێنمە دی كە دەیگووت ئەگەر هاتیتە سەر گۆڕی من نامەوێت فرمێسكەكانی چاوت ببینم، وەك هەموو جارێك چۆن بە پێكەنینەوە منت لە

باوەش دەکرد ئاواش گۆڕەکەم بە پێکەنینەوە لە باوەش بگرە، ئەوەش وەسیەتی دایکە دڵ سوتاوەکەتە بۆ تۆ.

بە زەردەخەنە درۆییەکانی سەر لێوەکانم و فرمێسکەکانی چاوم لە گۆڕی دایکم نزیك بوومەوە، ئەمجارە جیاواز لەجاران جگە لە دوو تاشە بەرد و گۆمەتە خۆڵێك زیاتر هیچی ترم نەبینی، جگەلەوە لەسەر خۆڵی گۆڕەکەیدا رووخساری ئافرەتێکی دڵ سووتاوم دەبینی، ئافرەتێك کە بە کۆڵێك خەم و نهێنی شاراوە سەری نایەوە، پێم وابوو دایکم لە ژیاندا زۆر ئازاری چەشتووە.

ئەگەرچی کات دەمەو ئێوارە دەروات و هەواکەشی زۆر سارد و هەورە رەش و چڵکنەکانیش بەری ئاسمانیان داگرتووە، لەگەڵ ئەوانەشدا دەمەوێت زیاتر و زیاتر لەسەر گۆڕی دایکە بێ کەس و کارەکەم بمێنمەوە، کاتێك کە بڕیاری ئەوەم دا هەڵسم بۆ ماڵی باوکی بارش بگەڕێمەوە سەیری گۆڕەکەی تەك دایکم کرد ناوی ئۆندەری لەسەر نووسرابوو،ئەوکات بیرم لەوە کردەوە ئەو گۆڕە دەبێت هەمان ئەو کەسەیە کە بەردەوام دایکم باسی دەکات.

گووتم دەبێت پێوەندی نێوان دایکم و ئەو گۆڕە چی بێت؟،تۆ بڵێیت بۆچی دایکم وەسیەتی کرد لەتەك ئەو گۆڕە بەخاك بسپێردرێت؟.

ئەو پرسیارانەو چەندین پرسیاری تر لە مێشکم دەهات و دەچوون، لەبەر ئەوە بڕیاری ئەوەم دا بگەڕێمەوە ماڵی خۆمان و هەرچۆنێك بێت سەرەداوێکم بەدەست بکەوێت بە دوایی راستیەکاندا بگەڕێم.

زۆر بەخێرایی گۆڕستانم جێهێشت و گەڕامەوە ماڵەوە، ئەوە ماڵەی کە بەخۆشەویستی و نازێکی زۆرەوە تیادا گەورە بووم، بەڵام ئەوجارە ئەو ماڵە وەك ماڵی بێگانەیەك دەهاتە بەرچاوم،لەگەڵ کردنەوەی دەرگای ژوورەوە هەستم بەوە دەکرد لەگەڵ مردنی دایکم هەموو شتێکی ماڵەوەش مردووە.

دەستم ئەوەی نەدەگرت گلۆپەکانی ژوورەوە هەڵبکەم، دەترسام لەوەی ئەمجارە لەگەڵ هەڵکردنی گلۆپەکان روخساری دایکم نەبینم، هەربۆیە بۆ ماوەیەك بەمشێوە لە نێو خەیاڵی دوور ودرێژ مامەوە تا ئەو کاتەی هەموو جورئەتی خۆم کۆکردەوە و گلۆپەکانم داگیرساند.

بەرەو ئەو ژوورە رۆیشتم کە هیچ کاتێك دایکم رێگەی نەدەدام بچمە ئەو ژوورەوە، لەبەر ئەوەی هەموو شتێکی تایبەت بە خۆی لەو ژوورە هەڵدەگرت، جگەلەوەش هەموو رۆژێك چەند کاتژمێرێك کاتی خۆی لەو ژوورە بەسەر دەبرد، هەرکە لەو ژوورە دەهاتە درەوە چاوەکانی وەك خۆێن سوور هەڵدەگەڕان، منیش هەموو کاتێك دەمگووت دایکە گیان بۆچی تۆ بەو جۆرە خۆت ئازار دەدەیت ئەو ژوورە چی لێیە هێندە گرنگ بێت تۆ تاخۆت هێندە ئازار بدەیت؟.

هیچ کچی شیرینم تۆ نازانیت کە من چ تاوانێکی گەورەم کردووە تا دەمرم ناتوانم باجی ئەو تاوانە بدەمەوە.

دایکە گیان دڵنیام کەسێکی وەك تۆ میهرەبان هیچ تاوانێکی لەدەست نایێت ئەنجامی بدات، تۆ بۆ هەموو خەڵکی وەك فریشتەیەکی یارمەتییەکی زۆر زۆری خەڵکانی هەژار دەدەیت.

نەخێر تۆ هیچ نازانیت کچی شیرینم دڵنیام ئەگەر ئەوە بزانیت تۆش نەفرەتم لێدەکەیت، رۆژێك دادێت دوای نەمانم هەر دەشی زانیت من چ کارێکی قێزەوەنم ئەنجامداوە.

بەرلەوەی بچمە نێو ژوورەکەوە زۆر بیرم لەو قسانەی دایکم دەکردەوە تۆبڵێت ئەوە نهێنیە بزانم کە دایکم تاوەکو مرد بەدەستیەوە دەینالآند.

بەترس و لەرزێکی زۆرەوە دەرگای ژوورەکەم کردەوە و بەرلەوەی گڵۆپەکان دابگیرسێنم، رووناکی بروسکەکان خۆیان بە ژوورەکەدادەکرد، لەنێوان تاریك بوون و رووناك بوونی ژوورەکە شتێکی ئەوتۆ لە ژوورەکە بەدیار نەدەکەوت، تەنها ئەوەی دەمبینی مێزێك و وێنەیەك بوو، بەڵام بەهۆی تاریکی ژوورەکەو بچوکی پەنجەرەکان زۆر بە جوانی نەمدەتوانی ژوورەکە ببینم و ترسێکی زۆریش لەدڵم بوو بۆیە گڵۆپەکانم دانەدەگیرساند.

هەرچۆنێك بێت گڵۆپی ژوورەکەم داگیرساند و جگە لەو میزێك و کورس و وێنەی کوڕێك زیاتر هیچم نەبینی، ئەی خودایە ئەو وێنەبە هی کێیە؟... پێشتر من ئەو کوڕەم لە هیچ شێوێنیك نەبینیوە...شێوە هەندێك لە من دەکات تۆ بڵێیت ئەوە باوکم نەبێت؟،نەخێر هەرگیز ئەوە باوکم نیە ئەگەر وابووایە تاوەکو ئێستا دایکم جارێك هەر بۆمی باس دەکرد.

بەداخەوە لەو ژوورەش هیچم دەستگیر نەبوو، من ماوەیەکە بیر لەوە دەکەمەوە هەرچی نەبێت لەو ژوورەدا سەرەداوێکم دەست بکەوێت، بەڵام ئیتر وەك منداڵێکی بێدەسەڵات دەمویست لە ژوورەکە بچمە دەرەوە، بەر لەوەی بۆ دەرەوە هەنگاو هەڵبگرم سەیرێکی ژێرەوەی میزەکەم کرد ئەوە قوتووەم بینی کە دایکم وەسیەتی کردبوو لەدوای ئەو ئەوە قوتووە نەکەمەوە وفڕێی بدەمە نێو رووبارێك.

کاتێك قوتووەکەم هەڵگرت زۆر قورس نەبوو بەڵام پرسیاری ئەوەم لەلا دروست بوو بۆچی دایکم وەسیەتی ئەوەی کردووە ئەو قوتووە بخەمە نێو رووبارێکەوە، بۆچی دەبێت ئەوە بکەم دەبێت ئەو قوتووە چی تیادابێت؟، چ نهێنیەك لە نێو ئەوەدا هەبێت دایکم دەیەوەێت لێمی بشارێتەوە.

ئەو پرسیارانە لە ناو مێشکمدا دەخولانەوە، بۆیە بڕیاری ئەوەمدا قوتووەکە بکەمەوە و سەیری نێو قوتووەکە بکەم، تاوەکو بزانم کە چ شتێکی گرنگ لەنێو ئەو قوتووەدا شاردراوەتەوە، هەرکە ویستم قوفلی قوتووەکە بشکێنم زەنگی مۆبایلەکەم لێدا و زۆر

ترسام سەیرمکرد دایکی بارشە پێوەدەکات، کاتی وەڵامم دایەوە گووتی ئەوە تۆ لەکوێت کات زۆر درەنگ بووە دڵمان بۆت قەلەق بوو گوتمان نەکا شتێکت بەسەر هاتبیّ.

گووتم نەخێر هیچ شتێکی خراپ رووینەداوە و ئەو ماوەیە دەمەوێت بەتەنها لە ماڵەوە بم و کەمێك خەمی گیانم دەربکەم.

گووتی چۆن دەبێت بەتەنیا لە نێو ئەو خانووە دابیت؟، رێگەم بدە من بێمە لاّت یاخود هەرچی نەبێت با هاورێیەکت بێتە لات.

نەخێر من دەمەوێت بەتەنیا لەماڵەوە بم بۆئەوەی ئەو رووداوانەی روویانداوە کەمێك لە بیری بکەم.

زۆرباشە تۆ چۆنت پێباشە باوابێت پێویستت بە هەرشتێك بوو خێر هەواڵی ئێمە بدە.

هیچ خەمت نەبێت هەر شتێکم پێویست بێت هەواڵی ئێوە دەدەم.

دوایی ئەوەی تەلەفۆنەکەم داخست قوتووەکەم دانایە سەر مێزەکە و دەستم بە شکاندنی قوتووەکە کرد و قوفلی قوتووەکەم شکاند، سەیری ناو قوتووەکەم کرد لە دەفتەرێکی یادگاری زیاتر هیچی تری تیادا نیە.

لەسەر بەرگی دەفتەرەکە وێنەی هەمان ئەو کوڕەی لە ژوورەەوە هەڵواسرابوو هەبوو، هەربۆیە زیاتر بیرم بۆ ئەوە چوو کە ئەو وێنەیە باوکی من بێت دایکم لە منی شاردبێتەوە.

لەوکاتەدا نەمدەویست ئەو دەفتەرە بخوێنەوە، لە دڵی خۆم دەمگووت چۆن رێگە بەخۆت دەدەیت دەفتەر یاداگاری کەسێکی تر بخوێنتەوە، جگەلەوەش دایکم وەسیەتی ئەوەی بۆ کردووم کە ئەو قوتووە بخەمە نێو رووبارێکەوە، بەلاّم لە هەمان کاتدا پرسیاری

ئەوەم لە خۆم دەكرد تۆ بڵێت شتێكی لەباری باوك و كەس و كارەكەمانی تیادا نەبێت؟، یاخود سەرەداوێكی نهێنی ژیانی خۆمانم دەست نەكەوێت؟، بەردەوام ئەو جۆرە بیانوانەوە بۆ خۆم دەهێنایەوە بۆ ئەوەی دەفتەرەكە بخوێنمەوە، لەگەڵ ئەوە هەموو دوو دڵییەی هەمبوو بڕیارپیارمدا دەست بەخوێندنەوەی دەفتەرە كە بكەم و دواتر وەسیەتەكەی دایكم بەجێ بگەیەنم.

كاتێ پەڕی یەكەم هەڵدایەوە نووسرابوو:كچی شیرینم سەناریا گیان ئەوە ئەو وەسیەتەیە كە گووتم دڵنیام یەكێك لەو وەسیەتەكانم جێبەجێ ناكەیت، ئیتر ئێستا كاتی ئەوە هاتووە لەگەڵ خوێندنەوەی ئەو نووسراوانە هەموو شتێك سەبارەت بە ژیانی من و خۆت بزانیت، بەڵام هیوادارم لە گەڵ زانینی راستیەكان نەفرەت لە دایكت نەكەیت و وەك ئافرەتێكی شەیتان دایكت نەێتە بەرچاو، هیوادارم لە دوایی خوێندنەوە ئەو دەفتەرە لەلات هەمان ئەو دایكە فریشتەیە بم كە پێشتر بووم، من تاوەكو ئێستا هەرچم لە توانادا بووە بەبێ دریخی كردن بۆتم ئەنجامداوە، دەزانم لە ژیانتدا تۆش منت زۆر خۆش ویستووە، لێرەدا وەك دایكێك نا بەڵكو وەك هاوڕێیەك داوات لێدەكەم دوایی تەواو بونت لە خوێندنەوە منت هەروەك جارن خۆش بووێت و نەفرەت لە دایكە مردووەكەت نەكەیت.

بەڕاستی ئەو ووتانەی دایكم زۆر سەیرە بۆچی دەبێت لە دوایی خوێندنەوەی ئەو دەفتەرە من رقم لەدایكی خۆم بێت، ئەو دایكەی لە جێگای باوكم و برا و خوشك بوو بۆم دەبێت چی كردبێت ببێتە جێگای تووڕەبوونی من و رقم لێیبێت؟.

بەسەرسوڕمانییەكی زۆر و هەڵەداوانەوە دەستم بە خوێندنەوەی پەڕەكانی تر كرد بۆ ئەوەی لە نهێنی ئەو قسانەی دایكم تێبگەم، ئیتر لەیەكەم پەڕی دەفتەرەكەدا نووسرابوو:

من ناو ئاریانەیە لە خێزانێكی دەوڵەمەند و ناسراوی شاری هەولێرم خوێندنی بەكالۆریۆسم بەسەركەوتووی تەواو كردووە و ئێستا لە وولاتی بەریتانیا خەریكی خوێندنی ماستەرم لە هەمان ئەو بەشەی كە خوێندنی بەكالۆریۆسم تیایدا تەواو كردووە.

ئێستا ساڵی(2128)ە مرۆڤەکان لە عێراق دووچاری دەردەسەری بێزاری و گرفتی زۆر زۆر بوون، بەتایبەتی لە شارە کوردییەکان، کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا گەورەترین شەیتان لە سەر رووی زەوی مرۆڤەکانن، ئەو کارەی مرۆڤ بە مرۆڤی دەکاتن شەیتانی داماو هەر رێگەشی پێنابات، بەڕاستی ژیان زۆر سەخت بووە، لەبەر ئەوە کۆمەلگا دابەش بۆتە سەر دووبەش چینی هەژار و چینی دەوڵەمەند ئیتر چینێك بە ناوی چینی ناوەند لە گۆڕێ دا نەماوە تەوە.

ژیان تەنها لە پێناو دەوڵەمەندەکان بەردەوامی هەیە، تەنانەت هەموو یاساو رێساکانیش لە پێناو دەوڵەمەندەکان و کاربەدەست و کەس و کارەکانییانە.

ئەگەرچی لە مێژوودا بەرچاوم کەوتووە کە کاربەدەستەکانی پێشتر زۆر خراپ بووینە، بەلاَم ئێستا کاربەدەستەکان زۆر زۆر خراپترن و کەسیش بۆی نیە تەنانەت یەك رەخنەشیان لێبگرێت.

بەڕاستی ژیان بۆ خەڵك زۆر سەختە بووە، گریان لە هەموو کوچەو کۆلانێکدا بوونی هەیە، دەنگی ناڵەو گریان و نووزانەوەی منداڵە برسییەکان بەری ئاسمانی گرتووە، کەچی منداڵە دەوڵەمەندەکانیش لە شاری یاری و بازارەکاندا قاقای پێکەنینیان دەگاتە چلێ وپۆپی ئاسمان و هەندیك جاریش تەبەقی یەکەمی ئاسمان دەبڕێت و تەنانەت فریشتەکانیش هەراسان دەبن پێیەوە.

لەم رۆژگارەی ئەمڕۆدا کەسێك دەست گیرنابێت کەسێکی باش وچاك بێت، زۆرجار لە کۆلاَنەکانی هەژارەکان مرۆڤ بەو هەموو گەورەییەی هەیەتی لەسەر تیکێك نان دەکوژرێت.

حاڵی هەموو کەسێ رووخاوە هیچ کەس بە کەس نیە، تەنانەت پۆلیسیش لێکۆلینەوە لەناوچە هەژارەکاندا ناکات، خوێنی خەلکانی هەژار وەکو ئاو وایە و رۆژ نیە خوێنی چەندین کەس بەبێ هۆ نەڕژێندرێت.

هیچ کەسێکیش لە دەوڵەمەند و کاربەدەستەکان هەست وسۆز و بەزەیی و میهرەبانیان نیە، وەك بلێت ئەو کەسانەی لە نێو خانەوادەی دەوڵەمەند و کارەبەدەستەکاندا دەژێن خودا هیچ هەست و سۆزێك وبەزەی لە دڵی ئەواندا درووست نەکردووە، تەنانەت ئەوانە مردنی خەڵکانی هەژارییان زۆر لەلا باشترە لەوەی ئەوسەگەی لەگەڵ خۆیان بە شەقامەکان دا دەیگێڕن نەخۆش بکەوێت یا خود نارەحەت بێت، تەنانەت خەڵکی هەژار وەك کۆیلەش مامەڵەی لەگەڵ ناکرێت، بەڵکو زۆر لە ئاژەڵە چوارپێیەکان لەلای کاربەدەست و دەوڵەمەندەکان بێ نرخترن.

من زۆر کەس دەناسم بۆ ئەوەی تەنها منداڵەکانیان دڵخۆش بێت خەڵکانی هەژار بە پارە دەگرێت بۆ ئەوەی وەك چوار پێ منداڵەکەی سواری سەر پشتی خۆی بکات.

لەبەر ئەوەی من لە خانەوادە دەوڵەمەندەکانم زۆرجار لە ناو کەسانی دەوڵەمەند و کاربەدەستەکان گوێبیستی ئەوە دەبم دەڵێن (هەژاری چوارپێ بۆچی باشە کە هەر خۆیانن ئێمە دەگەینە ئەو پلەو پۆستە هەر خۆشیان دەبێت وەك چوارپێ سواری سەرشانییانمان بکەن).

بەهەرحاڵ لە ئێستادا کەس نابێتە کەسی کەس، هەرکەسێك بە دەردو ئازارەکانی خۆیان دەناڵێنێت، تەنانەت لەو رۆژگارەدا دایکەکانیش توانای هەڵگرتنی خەمی کۆرپەلەکانیان نیە.

فرمێسك بۆتە پیشەی رۆژانەی منداڵە هەژارەکان، ئەگەر هەر رۆژێك منداڵەکان تیایدا نەگرین ئەوا بۆ ئەوان وەك جەژن وایە، لەبەر ئەوەی ئەوان یا لە برسان دەگرین یاخود بۆ شتێك دەگرین کە هەوەسیان بۆ چووە، کەواتە ئەو رۆژەی ناگرین ئەوا دیارە برسی نین و تاڕادەیەك پێویستیەکانیان بۆ جێ بەجێ کراوە.

لەپاڵ ئەوەدا هەژارەکان بە جۆرێك بیر دەکەنەوە وەك بڵێت لە دادگای خودادا قاقاو پێکەنین تەنها بۆ کاربەدەستەکان و منداڵەکانیان و کەس و کارەکانیان و

دەوڵەمەندەکان حوکمی لە سەر دراوە، هەروەها هەرچی ناخۆشی وناسۆری هەیە بەسەر ئەواندا بڕاوەتەوە.

لەگەڵ ئەو هەموو مەینەتی ئازارەی ئەوان هەیانە لەبەرامبەر بڕە پارەیەکی کەم کە هێندەی ئەو پارەیە نیە مانگانە لە سەگەکانیان خەرجی دەکەن کچەکانیان و ژنەکانیان لە ماڵە دەوڵەمەندەکان کارییان پێدەرکرێت یاخود بوونەتە گەمەیەکی شەوانەی دەستی پیاوە دەوڵەمەندکان و کاربەدەستەکان، تەنانەت ئەو کارەش بە هەموو کەسێك نەبڕاوەتەوە تەنها ئەوانە دەگرێتەوە کە خودا جوانیەکی بێ وێنەی پێداون، ئەگەرچی ئەو دەوڵەمەندانە خۆشیان خاوەنی خێزانن بەلام خێزانەکانیشان ئەو بەزمەیان پێ قبوڵە، چونکو ئەوان پێیان وایە خەڵکانی هەژار تەنها بۆ ئەو جۆرە کارانە دروست کراون، بە هۆی ئەوەی لە خێزانێکی دەوڵەمەند و ناسراوی شارەکەی خۆمان بووم منیش هەمان بیر وباوەڕم هەبوو.

هەربۆیە ئەو کەسەی ئەمڕۆ لە نێو خانەوادە هەژارەکاندا دەژێت هەزار خۆزگە بە مەرگ دەخوازێت، ئەو کەسەشی ئەمڕۆ لە دایك دەبێت هیوای لە دایك نەبوونی هۆی دەخوازێت، ئیتر بۆ هەژارەکان ژیان بە جۆرێك سەخت بووە خۆشترین جێگا بەلایانەوە گۆڕستانە، تەنانەت پێیان وایە لە ئێستادا مردنێکی ئارام و بێ ئازاریش بۆ ئەوان دەست گیر نابێت، بەم هۆیەشەوە گرانترین شت لەلای هەژارەکان مردنێکی ئاسوودەیە، لە ئەمرۆدا هەموو هەژارێك لە بوونی خۆی بێزارە، هەموو بوونێکیش خۆزگەی نەبوونی دەخوازێت.

من هیچ کاتێك لەو ئازارانەی ئەوان تێنەدەگەیشتم، لەبەر ئەوەی خانەوادەکەم هیچ کاتێك ڕێگەی تێکەڵ بوونیان لەگەڵ هەژارەکان نەدەدام، ئەوە لەلایەك لەلاکی تر بازار و خوێندن و تەنانەت گەڕەکەکانیشمان لە گەڵ ئەوانەی هەژارەکان جیاوازبوو، هەتا دوایی مردنیشمان لەگەڵ هەژارەکان تێکەڵ نەدەبووین بەڵکو گۆڕستانەکانمان لە گۆڕستانەکانی هەژارەکان جیاواز بوو.

جیاوازییەکانمان لە ئێستادا بە جۆرێکە تەنانەت هەژارەکان وا بیردەکەنەوە کەمردنی کەسانی دەوڵەمەند لەگەڵ مردنی ئەواندا جیاوازە، واباشترە بڵێم پێیان وایە رۆح کێشانی ئێمە لەچاو هی ئەوان زۆر ئاسانترە.

لە رۆژگاری ئێستا وابیردەکرێتەوە کە خوێندن و مەعریفەت تەنها بۆ دەوڵەمەندەکانە، هەربۆیە لەگەڵ ئەوەی هەژارەکان منداڵەکانی خۆیان نانێرنە بەر خوێندن لە زۆرێك لە گەڕەکە هەژار نشینەکان قوتابخانە هەربوونی نیە.

زۆر کەمن ئەو کەسانەی لە نێو خانەوادە هەژارەکان دەتوانێت لە دەرەوەی وولآت لە پاڵ دەوڵەمەندەکان بخوێنیت، تەنانەت ئەو جۆرەکەسانە لە گەڵ ئەوەی دەبێت زۆر زیرەك بن ژمارەیانە زۆر کەمەو بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن.

من کە ئێستا لە وولاتی بەریتانیان ماستەر لە سەر ئەرکی خانەوادەکەم دەخوێنم، ئەو کەسانەی لە عێراق هاتوون بە هەمان شێوەی من لە خانەوادە دەوڵەمەندەکانن.

هەرچەندە من زۆر حەز بە خوێندن لە وولآتە ناکەم بەلآم باوکم منی بە زۆر بۆ ئێرە رەوانکردووە، تاوەکو خوێندنی ماستەر تەواو بکەم.

لەگەڵ دەستکردنمان بە یەکەم رۆژی خوێند و کۆبوونەوەی قوتابییەکان لە پۆلدا، کوڕێکی زۆر سەرنج راکێشم بینی لە پێشەوەی هەمووان دانیشتبوو، رەنگ و رووی هەر لە خەڵکی ئێرە دەچێت، رەنگە خەڵکی ئێرە بێت وبیەوێت ماستەر بخوێنیت، هەر لەو بیرکردنەوانەدابووم مامۆستایەك خۆیی کردە پۆلەوە دەستی بە ناساندنی خۆی کرد.

دواتر گووتی حەزدەکەم ئێوەش خۆتان بناسێنن هەروەها بڵێن لە کامە شار و وولآت هاتوون، منیش لەبەر ئەوەی زۆر مەرەقی ئەوەم دەرکر کە بزانم ئەو کوڕە خەلکی کوێیە گوێیەکانی خۆم شل کردبوو تاوەکوو بە جوانی تێبگەم، کاتی نۆبەتی ئەو هات گووتی ناوم (ئۆندەرە) خەڵکی عیراقم ولە شاری هەولێر هاتووم.

کاتێ گوێبیستی ئەوە بووم زۆر دڵم خۆش بوو، لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئەو لە هەمان شارەوە هاتووین، کەواتە دەرفەتی ئەوەم دەبێت کە ئەو زیاتر بناسم.

لەکاتە بەدواوە زۆر پەلەی ئەوەم بوو دەس زوو تەواو بێت و بچمەلای و لە نزیکەوە خۆیی وتەنانەت خانەوادەکەشی بناسم.

بەلاَم لە دوایی تەواو بوونی دەرس بە هۆیی ئەوەی ئەو لە دەرگاوە نزیك بوو، خێر چووە دەروە و نەمتوانی لە نزیکەوە زیاتر ئەو بناسم و خۆمی پێ بناسێنم.

ئیتر بە هۆی بوونی ئەو لە پۆلەکەمان ئەو رۆژە زیاترە لە رۆژەکانی تر زۆر بە دڵخۆشی گەڕامەوە شوێنی مانەوەم.

لەڕێگادا هەر خەیاڵی ئەوەم دەکرد تۆبڵێی ئەم کوڕە کێ بێت کە تاوەکو ئێستا لە کۆلێژی خۆمان فرسەتی ئەوەم نەبووە بیبینم؟،دەبێت لە چ بنەماڵەیەکی هەولێر بن؟،بەڕاستی کوڕێکی زۆر سەرنج راکێش بوو.

ئیتر هەتا گەیشتمەوە شوێنی مانەوەم هەر بەو خەیالاَنە بەدەم ڕێگاوە بەردەوام بووم، تەنانەت هێندە خۆم لەبیر کرد ئەو رۆژە بۆۆ چوونەوە سواری تەکسیش نەبووم و بە پیادە گەیشتمەوە ماڵەوە.

کە گەیشتمەوە جیاواز لە رۆژانی تر بە رەنگ و رووێکی خۆشەوە سلاَوم لە هاورییەکانم کرد، ئەوە لە بیرنەکەم کە من دوو هاوڕێم لەگەڵە بەناوەکانی (گوڵبەهار)کەخەڵکی وولاَتی تورکیایە، (ماریا)خەڵکی وولاَتی ئیسپانیایە هەر دووکیان بۆ خوێندن هاتوونەتە ئیرە، ئەوانیش لەو رەنگ و رووخسارەی کە من ئەو رۆژە پێمەوە دیاربوو زۆر بەسەر سوڕمانیەوە سەیری منیان دەکرد، لەبەر ئەوەی من بەردەوام لە لای ئەوان دەمگوت قسە لەگەڵ باوکم دەکەم بگەڕێمەوە من لێرە ناتوانم درێژە بە خوێندن بدەم.

بەڕاستی ئەوانیش هەقی خۆیانە سەریان لەو رەنگ و روخسارەی و پێکەنینەی من بسورمێت، چونکو لەو کاتەوەی منیان ناسیوە و بینیوە منیان نەدیووە پێبکەنم.

خەریکە خۆر ئاوادەبێت وتاریکی رووی زەوی دەگرێت، نازانم بۆچی وەك رۆژەکانی تر نیم و تەنانەت هەوەسی هیچ جۆرە خواردنیکم نیە، بەڵی لەگەڵ خۆم دوام و گووتم دەزانم ئەو کوڕە مێشکی داگیر کردووم، ناتوانم بۆ ماوەیەکی کەمیش لە مێشکی خۆم دەری بکەم نازانم بۆچی وام بەسەر هاتووە، وەك بلێت ئەو کوڕە بۆ من کەسێکی بێگانە نیە، بەڵکو زۆرجاری تر ئەو بینیوە بەلأم لەکوێ نازانم.

ئەوە شەوە تاوەکو خۆر لەدایك بوو نەمزانی چۆن کاتەکانم بەڕێکرد، هەر لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم تروسکی خۆر خێرا لە جێگاکەم هەڵستام و بۆ کۆلێژ دەستم بە خۆئامادەکردن کرد، لەو کاتەدا بە هۆی چرپە چرپی خۆ ئامادەکردنم هەر دوو هاوڕێیەکەم لە خەو خەبەرییان بوویەوە، بەیەکەو گوتیان چی روویداوە بەو کاتە زووە بۆ کوێ خۆت ئامادەدەکەیت؟

منیش گووتم کات زۆر درەنگە پێویستە خێرا بچمە کۆلێژ نەبادا درەنگ بکەوم، گوتیان خۆ تۆ خۆشیت لە خوێندن نەدەهات، بەردەوام دەڵێت باوکم منی بەزۆر رەوانەی ئێرە کردووە، ئێستا چی روویداوە بەو کاتە زووە خۆت بۆ کۆلێژ ئامادەکەیت.

منیش گووتم هەڵسن تەمبەڵینە لەبری ئەو قسە فەلسەفیانەتان یارمەتییەکی من بدەن تاوەکو لە کاتی خۆم دەرنگ نەکەوم.

لەڕاستیدا ئەوان ئەو هەلس و کەوتەی منیان زۆر لەلاسەیر بوو، بۆیە زۆر پرسیارییان لێدەکردم کە من چۆن هێندە بە جۆش وخرۆشم بۆ چوونە کۆلێژ، بەلأم من هیچ شتیکم لە بارەی ئۆندەروە لەلایان نەدرکاند.

ئەو رۆژە کامە جلم لەلاوە پێ لە هەمووان جوانتر بوو ئەوم پۆشی، دوایی ئامادەبوونی تەواوم بە خەیاڵێکی زۆر خۆش و قووڵ بەرەو زانکۆ بەڕێکەوتم، لەرێگادا وورەیەکی زۆرم بە بەر خۆم ئەدا و بە دەم خۆمەوە ئەمگوت هەر چۆنێك بێت ئەمڕۆ دەبێت لەگەڵ ئەو کوڕە قسەبکەم.

هەر بەدەم ئەو خەیالآنەوە بووم تاوەکو گەیشتمە دەرگای کۆلێژ، کە چوومە ئەو پۆلەی دەرسی تیادا دەخوێنم، سەیرمکرد هەموو قوتابییەکان دانیشتوون، خێرا سەیری ئەو شوێنەمکرد کە ئۆندەر رۆژی پێشتر لیی دانشتبوو، بینیم ئۆندەر لە هەر هەمان شیوێنی خۆی دانیشتووە، هەر لەوکاتەدا دەمویست بچمەلای و قسەی لەگەڵ بکەم، بەلاّم مامۆستا هاتە ژوورەوە و نەمتوانی تەنانەت سلاّویشی لێبکەم.

لەوکاتەوە تاوەکو وانە تەواو بوو من چاوم لە سەر ئۆندەر هەڵنەدەگرت و هەرسەیری ئەوم دەکرد، ئەو کوڕە بەجۆرێك دڵ و مێشکی داگیر کردووم لە خەیاڵی خۆم دەمگوت هەرچۆنێك بیت دەبێت ئەمڕۆ قەسەی لە گەڵ بکەم، بەلاّم هێندە پەرۆش و قەلەق بووم وانەکە بەلامەوە زۆر درێژ بوویەوە بە هیچ جۆرێك تەواو نابێت، هەروەك بڵێت کات هیچ جوولەیەك ناکات و وەستاوە، هەر بەم جۆرە خەیالآنەوە بەردەوام بووم تاوەکو کاتی وانەکەمان تەواو بوو.

ئەمجارە جیاواز لە جاری پێشوو زۆر بە خێرایی خۆم گەیاندە ئۆندەرو سلاّوم لێکرد.

چۆنیت باشیت؟

وابزانم تۆش هەر خەڵکی هەولێریت؟

سوپاس من باشم هیوادارم تۆش هەرباش بیت بەڵێ منیش خەڵکی هەولێرم.

من ناوم ئاریانەیە.خۆشحالم بە ناسینت.

منيش ناوم ئۆندەرە خۆشحالبووم بە ناسینی بەڕێزتان، ئەگەر ئێوە فەرمایشتەکتان نەبێت بمبورن کەمێك بە پەلەم کارم هەیە دەبێت بڕۆم.

گووتم زۆرباشە خوات لەگەڵ بیت یەکتر دەبینینەوە، ئەو رۆژە تاوەکو ئۆندەر لەبەرچاوم وونبوو هەر سەیرم دەرکرد، بەلاّم بەو جۆرە کە قسەی لەگەڵ من کرد پێم وایە کە ئەو کەسێکی زۆر لە خۆباییە، لەگەڵ ئەوشدا نازانم بۆچی  من ناتوانم ئەو لە بیری خۆم دەربکەم.

حەزم دەکرد زیاتر لەگەڵی قسەبکەم و بیدوێنم و لەگەڵی رابووەستم،کەچی خۆ ئەو مۆڵەتی منی نەدا، تۆبڵێت ئەو هێندە کەسێکی لە خۆبایی بێت، لە خەیاڵی خۆم دەمگووت هەقی خۆیەتی رەنگە ئەو لە بنەماڵەیەکی یەکجار دەوڵەمەند بێت، یاخود بنەماڵەیەکی زۆر بەناوبانگی هەولێر بن، هەر بۆیە بەم شێوەیە لە خۆباییە، ئەوە بەلاّمەوە رەفتارێکی سەیر نەبوو، لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندەکان لە ئێستادا هەروان، رەنگە ئەویش من بە کەسێکی زۆر هەژارو لە بنەماڵەیەکی هەژار تێبگات هەر بۆیە وا رەفتاری کرد.

لەگەڵ هەموو ئەوانەش من هیچ کۆڵنادەم و هەوڵی  خۆم دەدەم، هەر دەبێت سەبارەت بە  ژیانی تەواوی بەڵگەم دەست بکەوێت، دەی خۆ هەر ئەمڕۆ نیە ئەو دەبینم بەڵکو تاوەکو دووساڵی تر ئەو لەگەڵ من دەبێت، کاتێکی باشم لە بەردەستە بۆ ئەوەی بە تەواوەتی ئەو و تەنانەت بنەماڵەکەشی بناسم.

ئەوەی ئێستا من بێزارە دەکاتن ئەویە کە تا هەفتەیەکی تر وانەکانمان دەست پێناکاتەوە، بیر لەوە دەکەمەوە چۆن هەتا هەفتەیەکی تر دەتوانم چاوەڕوان بم؟.

ئەگەرچی سەرەتا لێرە  نەفرەتم لە خوێندن دەرکرد، لە خەیاڵی خۆم وام دانابوو کە خوێندن تەواو نەکەم وبگەڕێمەوە عێراق، کەچی ئێستا بەهۆی ئۆندەروە حەزدەکەم هەموو رۆژێك دەرسمان هەبوایە، تاوەکو هەموو رۆژێك تێر بەدڵی خۆم ئەو ببینم، ئێستا

بە هۆی ئەوەوە هەموو وانەکان و تەنانەت مامۆستا و ئەو کورسییەشی ئەو لەسەری دادەنیشێت خۆشم دەوێت.

ٍ لەلایەکی تر بیرم لە سارد و سووڕییەی ئۆندەر دەکردەوە کە لەگەڵم دوا، وای بۆ دەچم کە ئەو لە بنەماڵەیەکی زۆر دەوڵەمەند و بەناوبانگ بێت، هەر ئەوش هۆکاری ئەو رەفتارەی ئەوە بوو.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەش تەنها بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن تاوەکو هەفتەیەکی تر بتوانم ئارام بگرم، تاو ناتاوێکیش خۆم سەرزەنشت دەکرد کە بۆچی رەقەمەکەی یاخود فەیسبووکەکەیم وەرنەگرت، تاوەکو هەرچی نەبێت لەو رێگەیەوە بمتوانیبا زیاتر قسەی لەگەڵ بکەم.

هەر بەدەم ئەو خەیاڵانەوە بووم ئاگام لەوە نەبوو کە شوێنی مانەوەم دەمێکە بە جێهیشتووە، مێشکم هێندە پڕبوو لە بیرکردنەوەکان بە جۆرێك لە هەر دەقەیەك سەد خەیاڵم بۆ خۆم دروست دەرکرد و لە بیرم دەکرد.

نازانم بۆچی مرۆڤ کە رووبەڕووی شتێکی لەو جۆرە دەبێتەوە بەردەوام دەکەوێتە نێو خەیاڵاتەوە، بەجۆرێك هەزار خەیاڵ و ئومێد بۆ خۆی دروست دەکات، تەنانەت لەو هەزار خەیاڵ وئومێدی هەیەتی رەنگە یەك دانەشی نەیێتە دی، بەڕاستی ژیانی مرۆڤەکانیش هەر لەسەر ئەو خەیاڵ و جۆرە بیرکردنەوانەوە وەستاوە.

لەوساتەدا خەیاڵی ئەوەم دەکرد کە دوێنێ ئەوم ناسیوە و لە قاوەخانەیەك دانیشتووین و قاوە دەخۆینەوە، بەدەم قاوە خواردنەوە باسی ژیانی خۆمی بۆ دەکەم، دەمەوێت هەموو شتێکی خۆمی بۆ باس بکەم، لەبەرئەوەی من کچی بچووکی ماڵەوەم لە دوایی من کەسی تر نیە و کەسیش لە خوشك و براکانم لەوەماڵەوە نەماوە قسەکانی دڵی خۆمی بۆ بکەم، بۆیە لە خەیاڵی خۆم ئەو بۆتە هاوبەشم و ووتەکانی دڵی خۆمی بۆ باس دەکەم کە پێشتر لەلای هیچ کەسێك جورئەتی درکاندنیم نەبووە، خەیاڵم وابوو ئەو

دەبێتە خۆشەویست وپشت وپەنای من بۆیە هەموو شتێکی سەبارەت بە نهێنیەکانی نێو دڵم بۆ باس دەکەم.

ئەو رۆژە بە جۆرەها خەیاڵی جوان جوانەوە هەر چۆنێك بێت گەیشتمەوە شوێنی مانەوەم، لەو ساتە حەزم دەکرد کات درەنگ نەبێت و تەنانەت رێگەی ماڵەوەش درێژ بێتەوە، بە هەرحاڵ ئەوەش هەر خەیاڵێکە کە نەهاتە دی لەبەر ئەوەی رێگە هەرچەندێك بێت درێژنابێتەوە کات هەرچەندە بێت نە کورت دەبێتەوە و نە دەگەڕێتەوەش.

ئیتر بۆم دەرکەوت مرۆڤەکان ئەو شتانەی لە ژیان خەیاڵ و ئومێدی بۆ دەکەن بەشی هەرە زۆری لە دەست خۆیاندا نیە بۆ هێنانەدی، جگەلەوەش خەیاڵەکان و ئومێدەکان زۆربەی هەرە زۆری شت گەلێکی مەحاڵن و پێچەوانەی ئارەزوکانمان دینەوە.

لەگەڵ هەموو ئەوانەش ئەمڕۆ دڵم زۆر خۆشە، هەست دەکەم دەنگێك لە ناخەمدا دەڵێت ئەو کوڕەش تۆی بەدڵ دەبێت و خۆ تۆش لە هیچت کەم نیە ئەوەتا لە بنەماڵەیەکی زەنگین و بەناوبانگیت، لەو کاتەدا من هەروام ئەزانی خۆشەویستی هەر لە دەوری ئەو شتانە کۆدەبێتەو و هەژارەکان بۆیان نیە خۆشەویستی بکەن، دوایی ئەوە دڵخۆشییەکەم هێندە زۆر بوو تەنانەت منی گەیاندە رادەی ئەوەی شێتی بمگرێت و بە هاورێیەکانم بڵێم ئێوە ئەمڕۆ پشووبدەن و من هەموو کارەکانی ناو ماڵ دەکەم.

ئەوانیش کە گوێیان لەو قسەی من بوو زۆر لەلایان سەیر بوو، لەبەر ئەوەی من بەردەوام خۆم لە کارەکان دەدزییەوە و تەنانەت کارەکانی خۆشم لە سەر ئەوان جێدەهێشت، گوڵبەهاری هاورێم کە گوێی لەو سەرشێتییەی من بوو زۆر دەڵخۆش بوو، لەبەر ئەوەی ئەو کورێکی خۆش دەویست بە هۆی کارەکان و خوێندن زۆر فریای ئەوە نەدەکەوت قسەی لەگەڵ بکات، لە بیرمە من ئەو رۆژە یەکەمجار بوو دڵنەرمی خۆم بۆ کەسێك دربڕم و گوتم گوڵبەهار ئەمڕۆ تۆ هیچ کارێك مەکە و برۆ قسە لەگەڵ خۆشەویستەکەت بکە، من لەبری تۆ کارەکانی ئەمڕۆ هەمووی ئەنجام دەدەم.

ئیتر منیش خەریك بوو لە دەردی ئەو هاورێیەم تێدەگەیشتم، کەبەڕاستی دەردی چاوەڕوانی زۆر قورس و ناخۆشە، ئەوە ئەو ڕەفتارەی منی زۆر لەلا سەیر بوو کە پێشتر دەیگوت کەمێك یارمەتیم بدە هەندێك قسە لەگەڵ خۆشەویستەکەم دەکەم، دەمێکە قسەم لەگەڵی نەکردووە، ئەو کات منیش دەمگووت قسەی لەگەڵ بکەیت و نەکەیت چی دەبێت، ئەویش دەیگوت تۆ لە دەردی من نازانیت با تۆش توشی ئەو دەردە ببیت ئەو کات دەزانیت چۆن دەردێکی بێ چارەسەرە.

بەڵێ ئەو راستی دەکرد بە هۆی ئەوەی من لە ژیانمدا هۆگری هیچ کەسێك نەبوو بووم، هەروەها بە هۆی دەوڵەمەندییەکەمەوە زۆر کەسێکی دڵڕەق بووم، بۆیە ئەوکات هەستم بە هیچ شتێك نەدەکرد، بەڵام ئێستا خۆ هیچ شتێك نەبووە جاری وا هەست دەکەم لە ناخەمەوە ئازارێك هەیە، ئەوەی راستی بێت عیشق خۆی وایە بەبێ ئەوەی نەخۆش بکەوت لە ناختەوە هەست بە دەردێك دەکەت، بەراستی دەردی عیشق دەردێك نیە بە هیچ دەرمانێك چارەسەر بێت،تەنها ئەو کەسەی ئەو دەردەی تووش کردوویت دەتوانێت تیمارت بکات.

ئیتر دەستم بە ئەنجامدانی کارەکانی ناوماڵ کرد و هەر بیریشم لە ئۆندەر دەکردەوە، تۆ بڵێت ئێستا ئەویش وەك من بیر بکاتەوە و بیری بەمنەوە سەرقاڵ بێت، یاخود ئەوە هەر بیر لە من ناکاتەوە لە خۆم دەپرسی بۆچی دەبێت بیر لە من بکاتەوە؟، خۆ من ئەو هیچ شتێکامان لەگەڵ یەکتر نیە تەنها من ئەو هەستەم بۆ ئەو هەیە.

خۆزگە ئەو کاتەی قسەم لەگەڵی کرد ڕەقەمەکەی یان فەیسبووکەکەیم وەگرتبا ئێستا بە هەر بیانوویەك بوویایە گویم لە دەنگی دەگرت و کەمێك دڵم ئارام دەبوو.

ئەو هەفتەیە بە هەرجۆرە دەردەسەرییەك بوو بردمە سەر، هەرکە گەیشتە ڕۆژی دەوام بەیانییە زووەکەی خۆم ئامادەکرد و ڕێگای کۆلیژم گرتەبەر، ئەگەرچی کات زۆر

زوو بوو بەڵام دەمویست جیاواز لە جاران بە پیادە بەرەو کۆلێژ بچم و لەڕێگادا خەیاڵی جۆراو جۆر بۆ خۆم دروست بکەم.

لەکاتەتەدا لەدڵی خۆم دەمگووت هەرچۆنێك بێت ئەمرۆ دەبێت کارێك بەکارێك بکەم، بەڵام کە گەیشتمە کۆلێژ سەیرم کرد ئۆندەر دیار نیە، گووتم رەنگە ئێستا کات زۆر زوو بێت بۆیە نەهاتووە، من لەو کاتەدا وەك بڵێیت شتێکی گرانبەهام وونکردووە، هەموو لایەکی کۆلێژی بەدوادا دەگەڕام، جار بە جاریش دەمگوت رەنگە ئەمڕۆ درەنگ بکەوێت، ئەو کاتە هەموو ترسی گەورەی من ئەو بوو ئەو نەبینەمەوە، لەبەر ئەوەی جاری پێشوو ئاگادار بووم کە لەگەڵ مامۆستاکەمان قسەی دەکرد دەیگووت رەنگە بە هۆی باروودۆخی ژیانمەوە لە خوێندن بەردەوام نەبم، ترسم ئەوە بوو بەیەکجاری وازی لە خوێندن هێنابێت و بۆ عێراق گەڕابێتەوە.

باشە ئەگەر ئەو گەڕابێتەو من چی بکەم باشە؟، لە کوێدا بە دوایدا بگەڕێم، خۆمن بە هۆی ئەوەوە ئێرم خۆش دەوێت خوێندنم لێرە خوێندنم خۆش ویست.

هەرچۆنێك بوو ئەو رۆژە چاوەڕوان بووم بێت تاوەکو دەرسەکانمان کۆتایی پێهات، بەڵام نە ئەو هات و نە هەواڵێکیشم وەرگرت.

دوایی تەواو بوونی دەرسەکانمان تەواو بێ ئومێد بووم لە بینی ئۆندەر، بۆیە زۆر دڵتەنگ بووم نازانم چۆن رێگەی مالەوەم گرت؟،بەڵام ئەوەی ئومێدی دەدامێ ئەوە بوو بەیانی دووبارە دەوامان هەیە، ئەگەر ئەو جارە ئەو ببینم تاوەکو تەواو پەیوەندی لەگەڵ نەبەستم بەئاسانی لە دەستم رزگاری نابێت.

ئەمڕۆ زۆر جیاواز لە هەفتەکەی تر بە کۆڵێ خەمەوە بەدەم رێگاوە رێدەکەم، ئازار خەریکە وەك جەهەنەم لە ناخەوە جەرگ و دڵم دەسوتێنێ.

سەیرم کرد پارەی زۆرم لەلایە، بەڵام ئەو پارانە نابنە هۆی ئەوەی کە تەنانەت یەك هەواڵی ئۆندەرم بۆ بهێنن.

هەرلەخۆمەوە دەمگووت باشە پارەکان پێم بڵێن ئەگەر ئێوە ناتوانن دڵم خۆش بکەن و فەراهانیم بدەن، ئەی باشە ئێوە لە نێو جانتاکەمدا بە کەڵکی چی دێن؟، دەی وەرن دڵم خۆشبکەن و هەواڵی ئۆندەرم بدەنێ، نە خێر ئێوەش هۆکاری دڵخۆشی نین.

دەی ئێستا دەبێت بەو پارانەی لەلامە دڵی خۆم خۆش بکەم، ئەوەم بە خەیاڵ داهات کە بچمە سینەما کاتێکی خۆش بەسەر ببەم، گەرچی چوومە سینەما بۆ ئەوەی دڵم خۆش بێت، بەڵام نازام بۆچی هێندە هەست بە تەنیایی دەکەم بەردەوام چاو دەگێڕم بە دەوری خۆما وەك بڵێیت کە شتێکی گرانبەهام وونکردووە، دەڵێم ئەی هەر من نەبووم چەند هەفتەیەك بەر لە ئێستا دەهاتمە سینەما ئەو پەڕی کاتە خۆشەکانی خۆم لێرە بەسەر دەبرد و دڵخۆش دەبوو، ئەی خودایە ئێستا بۆ وام لێهاتووە هەرچی دەخۆم و بۆ هەر شوێنێك دەچم دڵم دەگوشترێت، دەبێ من چیم بەسەر هاتبێ بەمجۆرە دڵم تەنگ بووە.

لەو شەوە تاریکەدا تەنها تاریکی شەو بۆتە هاوڕیی خەمەکانم وەك شێتێکم لێهاتووە و هیچ کەسێکیش نیە دەردە دڵی لەلا بکەم، بەڕاستی شەو ناخۆشترین کاتە بۆ ئەو کەسەی خەمێکی لە سینەدایە، ئەی پارەکانم لە کەیەوە من دەردی دڵی خۆم لەلای ئێوە باس دەکەم باشە پێم بڵێن بۆچی هیچ وەڵامیکتان نیە؟، دەزانم ئێوەی ئەو کاتە خۆشی دەهێنن کە خۆم دڵم خۆشە، نەوەك دڵم تەنگ بێت و ئێوە دڵم خۆش بکەن.

تەنانەت شەو هێندە درەنگ بووە هیچ ئاگام لەکات نەماوە، رەنگە هاوڕییەکانم بە هۆی درەنگ کەوتنمەوە زۆر دڵیان تەنگ بووە و هەواڵی دایك و باوکیمیشان داوە، هەربۆیە داکم و باوکم لە هەولێرەوە چەندین جار پێوەندیان پێوە کردم، بەڵام هیچ توانای ئەوەم نەبووە وەڵامی ئەوان بدەمەوە.

بیرمکردەوە بەو بارودۆخەی منی تیادایە باشترین جێگا ماڵەوەیە، لەبەر ئەوەی هەر چی نەبێت لەگەڵ هاوڕێیەکانم کەمێك خۆم لە بیر دەکەم، هەروەها کاتیش درەنگ بووە وا باشترە بە تەنیا لە شەقامەکاندا نەسوڕێمەوە، بۆیە تەکسییەکم گرت تاوەکو من بگەێنێتە ماڵەوە، بەبێئاگایی خۆم هێندەم ڕێگا کردبوو بەدەم خەیاڵەکانمەوە لە شوێنی مانەوەم زۆر دوورکەتبوومەوە.

هەرکە سواری تەکسیەکە بووم بینیم سایەق تەکسیەکە کەسێکی بە تەمەن زۆرباش دیارە، بەم هۆیەشەوە دڵم زۆر خۆش بوو لەبەرئەوەی کات درەنگ بوو دەترسام تووشم بە کەسێکی خراپ ببێت.

ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا ئەوە بوو سایەق تەکسیەکە زۆر دڵتەنگ و خەمبار دیارە، تاو ناتاوێکیش سەیری خۆی بادەدات و بەردەوام دەبێت لە سەیرکردنی ڕێگاکە نەوەك ڕووداوێك ڕووبدات.

منیش لەدڵی خۆمەوە دەمگووت تۆبڵێت کێشەی ئەم پیرە پیاوە چی بێت ڕووخساری هێندە ماندوو خەمبار دیارە، تۆ بڵێت ئەویش هەمان کێشەی منی هەبێت ولە چاوەڕوانی دا مابێتەوە، بەڕاستی زۆر حەزدەکەم پرسیاری لێبکەم بەڵام زۆر شەرم دەکەم، هەر بۆیە فێڵکم بەمشێك داهات کە چۆن بتوانم پرسیاری لێبکەم.

بۆئەو مەبەستە سەرەتا گفتوو گۆیەکی هاوڕێیانەم لەگەڵی دەست پێکرد، گووتم من ناوم ئارییانەیە خەڵکی عێراقم و لێرە دەخوێنم...

ئەویش گووتی من ناوم جۆنە بەڕەچەڵەك خەڵکی ئێرەم، تا توانام هەبوو ڕۆژانە لە کارگەیەکی گەورە کارم دەکرد موچەی مانگانەی باشبوو، بەڵام ئێستا بە هۆی بەسەرەوە چوونی تەمەنمەوە بەو تەکسییە بژێوی ژیانم پەیدادەکەم.

کچم بەڕاستی ژیان زۆر سەختە هیچ خۆشی تیادا نەماوەتەوە، هەرچی خۆشی هەیە دەوڵەمەندەکان بۆ خۆیان کڕیویانە هەژاریش هیچی بۆ نەماوەتەوە جگە لە خۆ ژیاندن وخەفەت خواردن.

منیش گووتم مامە گیان تۆ هەڵە نیت کەی خۆشی بە پارە دەستەبەر دەکرێت، بەڕاستی من خاوەنی پارەی زۆرم بەڵام لە بەیانیەوە دڵم زۆر زۆر تەنگە هەرچی وویستم بە پارە کردم بۆ ئەوەی دڵم خۆش بێت کەچی دڵم بۆ ساتێکیش هیچ خۆش نەبوو...

کچم تۆ زۆر هەڵەیت هەموو دەرد و کێشەی من ئێستا پارەیە، من دەبوایە ئێستا لە ماڵەوە لەلای خێزانەکەم بم، ئەو خێزانەی کە چەند ساڵە لەگەڵمە و لە هەموو باروودۆخێك پشت و پەنام بووە، ئەمڕۆ ڕۆژی لە دایك بوونیەتی، بەڵام بەهۆی بێ پارەیی من هاتوومەتە دەرەوە و بەو کاتەشەوە نە گەڕاومەتە ماڵەوە.

ئەو مامەیە لە ژیان هیندە دڵی پڕبوو بەبێ ئەوەی من پرسیاری لێبکەم هۆکاری دڵتەنگیەکەی خۆی بۆ باس کردم...

کچم من لەبەیانی زووەوە هاتوومەتە دەرەوە تابتوانم کەمێك زیاتر کار بکەم و پارەیەکی زیاتر بە دەست بخەم و بە دەست و دیاری بگەڕێمەوە ماڵەوە، دڵنیام ئیستا ئەویش بەتاسەوە چاوەڕێی منە، بەتاسەوە چاوەڕوانی ئەوەیە کە ڕۆژی لەدایك بوونی پیرۆز بکەم، بەڵام تاوەکو ئێستاش نەمتوانیووە ئەو بڕەپارەیە کۆبکەمەوە و ئەو دیارییەی بۆ بکڕم کە حەزی لێیەتی، ئەگەرچی ئەمڕۆ خۆم زۆر ماندوو کرد بەڵام دیارییەکە نرخی سەد یۆڕۆیە بەڕاستی نرخەکەی زۆر گرانە.

هەرکە گوێم لەوە بوو ئەوکات بۆ دەرکەوت هەرکاتێك خۆشەویستی هەبوو ئەو کات پارە خۆش بەختی دەهێنێت، من لە بەیانییەوە تاوەکو ئێستا لە پارە دەپرسم هیچ وەڵامێکی نەداومەتەوە، هەرچی وویستم بە پارەکردم بەڵام بۆ تەنها تاوێکیش دڵخۆش نەبووم

ئیتر ئێستا گەیشتمە وەڵامی خۆم... من لە بەیانیەوە زۆر زیاتر لە سەد یۆرۆم خەرج کردووە کەچی هیچ دڵخۆش نەبووم، ئەو مامەیە ئەو پەڕی دڵخۆشی خۆی لە سەد یۆرۆدا دەبینێتەوە.

بەڕاستی پارەش زۆر سەیرە ئەوەی پێویستی پێیەتی هەرگیز ناچێتە لای، ئەگەرچی خۆشی بە کارکردنەوە زۆر زۆر ماندوو بکات، ئەوەشی کاری پێی نیە و پێی دڵخۆش نابێت بەبێ ماندووبوون لەلای کۆدەبێتەوە.

دوایی ئەوەی گەیشتمەوە نزیك ماڵەوە گووتم فەرموو مامەگیان ئەو پارەیە هەمووی بۆ تۆ برۆ ئەو دیارییەی دەتەوێ بۆ خێزانەکەت بکریت بەو پارەیە بیکڕەو بەدڵخۆشی بگەڕێیەوە ماڵەوە، ئێستا خێزانەکەت بە پەرۆشییەوە لە ماڵەوە چاوەڕێتە، پارەکە بگرە مامە گیان ئەو پارەیە لە ئێستا هەرگیز نابیتە هۆی دڵخۆشی من و هەرگیز بۆ یەك چرکەش نامباتە نێو دوونیای خۆشگوزەرانی.

لەوکاتەی مامەی سایەك چاوی بەو پارەیە کەوت لە دڵخۆشیان دەستی بە گریان کرد،گووتی کچم نازانم چۆن سوپاسی تۆ بکەم، دیارە تاوەکو ئێستاش کەسی دەوڵەمەندی باش لە دوونیا ماوە.

لەکاتەدا لەدڵی خۆم گووتم مامەگیان سوپاسی ئۆندەر بکە، لەبەرئەوەی بیرکردنەوەم لەو بووە هۆی ئەوەی لە ژیانمدا بۆ یەکەمجار دڵم بەکەسێکی هەژار بسوتێت وپارەی پێ ببەخشم، خۆشەویستی ئەو بووە هۆی ئەوەی هەست بە دەرد و ئازارەکانی دڵی تۆ بکەم.

گووتم مامەگیان هیچ سوپاسێکی ناوێت تەنها دووعای ئەوەم بۆ بکە ئەو نهێنیەی کە لە ناخەوە دڵ و جەرگم دەسووتێنێ بەو بگەم تاوەکو کەمێك منیش دڵ خۆش بم.

لەنزیك شوێنی مانەوەم بەرلەوەی لە تەکسیەکە دابەزم مامەی سایەق دووبارە دەستی بەگریان کردەوە و گوتی کچم ئەوە رەقەمی منە هەر کارێك لێرە پێویست بوو

بەمن بڵێ، لەبەرئەوەی من خاوەنی تەکسیم دەربارەی هەموو شتێکی ئەو شارە شارەزایم هەیە، منیش گووتم زۆر خۆشحاڵبووم بەناسینی تۆ مامەگیان خوات لەگەڵ بێت.

دوایی ئەوەی گەیشتمەوە ماڵەوە جیاواز لە رۆژەکانی تر دڵتەنگییەکی زۆر و خەمبارییەکی زۆر بە رووخسارمەوە دیارە، (گولبەهار و ماریا)دڵیان زۆر بۆم قەلەق ببوو، هەم لەبەری ئەوەی هیچ کاتێك من بەتەنیا نەچووبوومە دەرەوە وتاوەکو ئەو کاتە لەدەروە مابوبێتمەوە، هەم دایك و باوکیشم پێوەندیان بەوانەوە کردبوو کەمن بۆچی وەلامی ئەوانم نەداوەتەوە؟، بۆیە هەرکە گەیشتمەوە نەگەیشتمەوە زۆر بەتوڕەییەوە گووتیان بەو کاتەی شەو تۆ لە کوێ بوویت، چەند جارە تەلەفۆنت بۆ دەکەین بۆچی وەلاّم نادەیتەوە؟، دەزانیت دایك و باوکت زۆر دڵیان بۆت تەنگ بووە و دەترسن تۆ شتێکت بەسەر هاتبێ لە کەیەکەوە هەردەقەی جارێك پێوەندیمانەوە پێوە دەکەن.

لەوەکاتەدا من هێندە لە نێو دەریای شەڕابی خەمەکان نووقووم ببووم و بەجۆرێك سەر خۆش ببووم، ئەوان هەرچیەکیان دەگووت و دەگووتەوە من وەك بڵێت گوێم لە هیچ ووتەیەکی ئەوان نەبووبێت کەوتبوومە نێو خەیالأتەوە و دەمگووت ئای پارە لە ئێستادا نەبوویتە هۆکاری دڵ خۆشی دایك و باوکیشم! ئەی باشە ئەوانە خاوەنی پارەیەکی خەیاڵین و ئەو هەموو سامانەیان هەیە بۆچی بە هۆیی ئەوانەوە دڵخۆش نەبوون؟،ئیتر تێگەیشتم لەوەی مرۆڤ هەرچەندە دەوڵمەند بێت بەردەوام بۆشاییەکی رۆحی لە ناخی دا بەجێ دەمێنێت، ئەو بۆشاییەش تەنها بە عیشق و خۆشەویستی پڕ دەبێتەوە.

من ئەمڕۆ سەبارەت بە هەبوون و نەبوونی پارە دوو رووداوی سەیرم بینی و بۆم دەرکەوت پارە بەبێ خۆشەویستی هیچ دڵخۆشییەك ناهێنێت، هەروەها بەدەست هێنانی خۆشەویستی کەسی بەرامبەر و دەربڕینی خۆشەویستیش بەبێ پارە ناکرێت.

هەرچۆنێك بوو هاوڕێیەکانم دوایی بینینی من کەمێك دڵیان ئارامبوویەوە و منیش بەبێ ئەوەی یەك ووشە لە زارم بێتە دەرەوە بە خەمبارییەکی زۆر چوومە ژوورەکەی خۆم و

دەرگاکەم لەسەر خۆم داخست، دوایی ئەوە تەلەفۆنم بۆ دایك و باوکم کرد و گووتم من سەلامەتم هیچ خەمی منتا نەبێت دڵتان بۆمن سەخلەت مەکەن.

دوایی چەند دەقەیەك گوڵبەهارو ماریا لە دەرگای ژوورەکەی منیان داو هاتنە ژوورەکەمەوە و گووتیان ئاریانە چی بەم جۆرە دڵی تەنگ کردووی؟، ئەگەر ئێمە هەڵەیەکمان هەیە پێمان بڵێ، یاخود ئەگەر هەر کێشەیەکت هەیە بە ئێمەش بڵێ بەڵکو بتنوانین یارمەتیەکت بدەین.

منیش لەدڵی خۆم گووتم ئای ئێوە لە چ خەیاڵێك و منیش بەچ دەردێکەوە دەناڵێنم و ئەو دەردەی من هەمە نە بە ئێوە نە بەپارە نە بەهیچ دکتۆرێك و دەرمانێکیش برینەکانم چارەسەر ناکرێت.

گووتم نەخێر خۆشەویستەکانم هیچ نەبووە من لەناخەوە هەندێك ماندوو و بێتاقەتم ئەگەرنا ئێوە هیچ خراپەیەکی منتان نەبووە و هاوڕێی زۆرباش و چاکن بۆ من.

ئەو شەوە زۆر جیاواز لە شەوەکانی تر زۆر بەدڵتەنگی و خەمگینی لەسەر سەرینەکەم پاڵکەوتم، بەجۆرێك دڵتەنگم خۆم وەك یەکێك لە منداڵە هەژار و برسییەکانی شارەکەی خۆم دەهاتە بەرچاو، جار بە جار برسییەتی بینینی ئۆندەر دلۆپی فرمێسکەکانمی دەهیانایە سەر پێلووی چاوەکانم و دلۆپ دلۆپی فرمێسکەکانم بەسەر سەرینەکەمدا ئەتکا.

بەردەوام پرسیاری ئەوەم لە خۆم دەکرد تۆ بڵێت جارێکی تر ئۆندەر ببینمەوە، هەرکەسێك کە دەیگووت من بە یەك بینین عاشق بووم باوەڕم پێنەدەکرد، بەڵام ئێستا سەیرم بە خۆم دێت هەردەم لە خەیاڵمدا لە خۆم دەپرسم خودایە من چۆن بەم شێوەیە بە یەك جار بینین عاشقی ئەو کوڕە بووم؟.

هەربەدەم خۆمەوە دەڵێم خودایە بۆچی دەبێت شەو بۆ کەسێکی عاشق هێندە درێژ و بە ئازار بێت؟، دەبێت کەی بەیانی دابێت و خێرا خۆم بگەیێنەمە کۆلێژ، زیاتر لە خودا دەپاڕامەوە کە بەیانی ئۆندەر بۆ دەوام بێت، لەبەر ئەوەی گەر بەیانی ئەو نێتە دەوام هەتا هەفتەیەکی تر دەبێت لەو چاوەڕوانییەدا بمێنمەوە، بۆیە تەنها بەیانیم لە پێشە تاوەکو ئەو ببینم.

بەهۆی ئەوە بیرکردنەوانەمەوە تاوەکو خۆر بەری ئاسمانی داگرت بۆ ساتێکی کەمیش خەو نەچوویە چاوەکانمەوە، ئەگەرچی تاو نا تاوێك خەو چاوەکانمی دادەگرت بەڵام لەگەڵ بیرکردنەوەم لە ئۆندەر لەخەو رادەچڵەکیم و خێرا خەبەرم دەبوویەوە، هەرچۆنێك بێت بەو ناڕەحەتییەو خەم و غەمبارییە رۆژم کردەوە.

وەك پیشەی چەندجارەم لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم تیشکی خۆر دەستم بە خۆئامادەکردن کرد، هاوڕێیەکانم زۆر سەیریان لەو رەفتارەی من دەهات، لەبەر ئەوەی من خوێندن و کۆلێژم هیچ خۆش نەدەویست بەڵام ئێستا بە ئارەزووی من بێت دەوامی کۆلێژم دەکردە هەموو رۆژێك.

ئەمڕۆ جیاواز لە رۆژانی تر زۆر زوو خۆم گەیاندە کۆلێژ، ئەوەی لەلای من گرنگ بوو بینینی ئۆندەر بوو نەوەك وانەکان، لەبەرئەوەی هەرچۆنێك بێت لە دەرسەکان دەتوانم دەربچم ئەگەر دەریش نەچووبوومایە بەپارە دەمتوانی کارەکانی خۆ جێبەجی بکەم.

هەرکە گەیشتمە کۆلێژ بینیم ئۆندەر لە نێو باخچەی کۆلیژ دانیشتووە و پەرتووك دەخوێنێتەوە، بەڕاستی لەو کاتەی ئەوم بینی زیاتر لەو منداڵەی دێتە سەر دوونیاوە دڵم خۆشتر بوو...دوایی ئەوە زۆر بە لەسەرخۆیی و هێمنی خۆم گەیاندە لای ئۆندەر و سڵاوم لێکرد و وەڵامی دامەوە، گووتی لەسەر پێیەکانت رامەوەستە وەرە لێرە شوێنی بەتاڵ هەیە دابنیشە، کاتێ لەتەك ئەو دانیشتم وەمدەزانی هەر خەیاڵەو تاوەکو ئێستا لە خەودام و خەبەرم نەبۆتەوە.

دوایی ئەوەی جورئەت و ووره‌یەکی زۆرم بەخۆمدا و گووتم ئۆندەر دەمەوێت شتێکت پێ بڵێم دەزانم تۆ زۆر سەرقالیت بەلاّم ئەمرۆ دوایی دەرس هەر چۆنێك بێت دەمەوێت هەندێك قسەت لەگەڵ بکەم، ئۆندەر گووتی ئاخەر من زۆر سەرقاڵم کارم گەلێك زۆرە، وەنەبێ حەزنەکەم قسە لەگەڵ تۆ بکەم، بەلاّم دوایی دەرسەکان راستەوخۆ دەبێت من بۆ سەر کارەکەم بچم و حەزناکەم لە کارەکانم دوابکەوم.

ئۆندەر دەزانم تۆ زۆر سەرقاڵیت منیش لێرە هیچ کەسم نیە هیچ هاوڕێیەکم نیە، بۆیە تکایە ئەگەر دوایی دەرسیش نەبێت هەرچۆنێك بێت لەو هەفتەیە دەبێت کاتێك دابنێین و حەزدەکەم زیاتر یەکتر بناسین وابزانم رۆژی یەکشەمە زۆرباشە، ئەوەی دوێنێ دەمویست قسەت لەگەڵ بکەم، بەلاّم دوێنێ تۆ بۆ دەوام نەهاتی، ئەرێ بەڕاست خۆ شتێکی خراپ نەبووو، بەڕاستی من وامزانی تۆ وازت لە خوێندن هێناوە.

نەخێر هیچی خراپ روونەداوە سوپاس بۆ خوا، بەلاّم دوێنێ لە کارەکانم زۆر ماندوو بووم بۆیە بەیانیەکەی چەندی بۆم کرا نەمتوانی هەڵستمەوە و بێمە دەوام، لەڕاستیدا هەندێك نەساغیش بووم.

گووتم ئەی ئێستا چۆنیت ئەگەر باش نیت دەچین بۆ دکتۆر...

نەخێر پێویست بەدکتۆر ناکات زۆر سوپاس  ئێستا زۆر باشترم.

ئێ زۆرباشە ئۆندەر هەرچی نەبێت رەقەم تەلەفۆنی خۆتم بدێ، تاوەکو ئەو رۆژەی بەتەماین بۆ دەرەوە بچین بتوانم پێوەندیت پێوە بکەم، دوایی ئەوەی رەقەمەکەیم وەرگرت گووتم ئەی فەیس بووکت نیە، گووتی با هەمە بەلاّم ئێستا ئەو مۆبایلەی لەلامە ئینتەرنێتی پێناکرێتەوە بۆیە فەیسبووك زۆر کەم دەکەمەوە، تاوەکو ئێستا فرسەتێکم نەبووە بچم مۆبایلەکی باش بکڕم.

منیش گووتم زۆر باشە بەڵام ڕۆژی یەکشەمەت لەبیر نەچێت هەرچۆنێك بێت دەبێت قسە بکەین.

بابزانم چۆن دەبێت تا ئەو کات زۆرمان لە پێش ماوە پێوەندیم پێوە بکە ئەو کات هەواڵت دەدەمێ،ئێستاش دەرس دەست پێدەکات بڕۆینە پۆلەکەمان زۆرباش دەبێت.

ئەو ڕۆژە من و ئۆندەر لە نێو پۆلدا هەر سەیری یەکترمان دەکرد، وابزانم ئۆندەر هەستی بەوە کردووە کەمن هەستێکی خۆشەویستیم بۆ ئەو هەیە، بەڕاستی ئەو کوڕێکی زۆرباش و میهرەبان و سادە و ساکار دیارە، تۆبڵێیت هۆکاری چی بێت هیچ کاتێکی نەبێت بۆ قسەکردن لەگەڵ من؟، ڕەنگە هەروەك باوکم خاوەنی ماڵ و سامانێکی زۆر بێت بۆیە هێندە سەرقاڵە، باوکم تەنانەت کاتی نیە خۆشەویستیەکی کەمیش بۆ دایکم دەربڕێت.

دوایی تەواوبوونی دەرس جارێکی تر چوومە لای ئۆندەرو گووتم ئەو بەڵێنەی بۆ ڕۆژی یەکشەمە داوتە لەبیری نەکەی، گووتی ئەگەر من بەڵێنێك بدەم هیچ کاتێك نابینیت من بیشکێنم لەوەیان دڵنیابە، بەڵام یەکشەمە لەکوێ یەکتر ببینین و دانیشین قسەبکەین، منیش هەر ئەوکات دەمتوانی شوێنی دانیشتنەکەمانی پێ بڵێم، بەڵام هەردەموویست بەم هۆکارەو جارێکی تر بەتەلەفۆن زیاتر قسەی لەگەڵ بکەم، بۆیە گووتم بۆ شوێنەکە دواتر هەواڵت پێدەدەم.

بەڕاستی کاتێك کەسێك کەسێکی زۆر خۆش دەوێت هەزار بیانوو دەبنێتەوە بۆ ئەوەی تەنها گوێی لە دەنگی ئەوە کەسە بێت.

دوایی ئەوە دڵم زۆر زۆر خۆش بوو لەوکاتەدا نەمدەزانی چۆن دڵخۆشی خۆم دەربڕم، لەدڵی خۆم دەمگووت ئەوە من هەلی ئەوەم هەبوو ئۆندەر ببینمەوە، لەوەش زیاتر بگرە کاتێمان بۆ چوونە دەرەوە دیاریکردووە، هەر لەو ساتەوە لە بیر وخەیاڵی خۆم خۆم بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە دەکرد، کە چی لە بەربکەم و جۆن بەجوانترین شێوە بەدیار دەکەوم.

ئەمڕۆ دوایی ئەوەی گەیشتمەوە ماڵ هاوڕێیەکانم بە بزەکانی سەر لێوەکانم زانیان ئەمڕۆ من زۆر دڵخۆشم، بەیەکەوە گووتیان بەڕاستی تۆ دەڵێت شێتی ڕۆژێك خەم لەچاوەکانت دەبارێت ڕۆژێك لە دڵخۆشیان خەریك دەبێت بە ئاسماندا بفڕیت، هیچ کەسێك لە تۆ تێناگات تۆ چ جۆرە مرۆڤێکی هەندێك جار زۆر میهرەبانی هەندێك جاریش بمان کوژیت لەلات زۆر ئاساییە، دەکرێت بزانین ئەمڕۆ هۆکاری چیە دڵت خۆشە؟.

منیش گووت هیچ هەروا دڵم زۆر زۆر خۆشە ئەمڕۆ بەڕاستی ئەو شارەم زۆر خۆش دەوێت! ئەوانیش بەسەر سوڕمانیەوە گووتیان تا دوێنێ نەفرەتت لێرە دەکرد، ئێستا چ مەعجیزەیەك ڕوویداوە ئێرەت بەم جۆرە کەوتۆتە دڵەوە.

منیش گووتم هیچ نەبووە بەڵام ئەمڕۆ هەردووکاتان لە خۆشترین ڕێستورانتی ئەو شارە دەعوەتی منن، ئەوانیش گووتیان زۆرباشە خۆمان ئامادە دەکەین و دەڕۆینە دەرەوە.

دوایی ئەوەی لە ڕێستورانتەکە نانمان خوارد و بە هاوڕێیەکانم گووت پێویستم بە مۆبایلە و دەمەوێت مۆبایلێکی باش بکڕم، ئەوانیش گووتیان خۆ تۆ مۆبایلێکی زۆرباشت هەیە مۆبایلی ترت بۆچیە؟

منیش گووتم ئەوەی خۆم زۆر لەبەر دڵ کەوتووە بۆیە یەکێکی باشتر دەکڕم، بەڵام لەلای ئەوان نەمگووت مۆبایل بۆ ئۆندەر دەکڕم، ئەوە بوو چەندین دووکانم کرد تاوەکو باشترین جۆری مۆبایلم دۆزییەوە و بۆ ئۆندەرم کڕی.

ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە سات دوای سات کاتەکان دەژمێرم، نازانم بۆچی کات دەڵێ هەر ڕێناکات؟، من تامەزرۆی ڕۆژی یەکشەمەم بێت کەچی کاتیش زۆر ئۆندەرش دەڕوات، تەنانەت چرکەکانیش دەژمێرم بۆ ئەو ڕۆژەی کە لەگەڵ ئۆندەر لەسەر یەك مێز دادەنیشم.

هەرچۆنێك بێت بە جۆرە خەیاڵە دوور و قوڵانە رۆژەکانم بەڕێکرد، تەواو ئیتر خەمەکانم کەمبویەوە و بەیانی دەتوانم تێر تێر بۆ خۆم ئۆندەر ببینم، بۆیە تەلەفۆنم بۆی کرد تاوەکو بۆ بەیانی ئەو شوێنەی کە بڕیار وایە بەیانی لەوێ چاوم پێی بکەوێت، بەڵام چەندجارێك تەلەفۆنم بۆی کرد وەڵامی نەدامەوە، منیش هەر لەخۆمەوە قەلەقی دایگرتم و خەم و خەفەت بەرووخسارمەوە جارێکی تر سەری هەڵداوە، لەبەر ئەوە هەرتاو نا تاوێك پێوەندیم پێوە دەکردەوە کەچی هیچ سوودێکی نەبوو.

کات خەریك بوو دەگەیشتە درەنگانێکی شەو، من زیاتر و زیاتر قەلەقی دایدەگرتم، خۆم سەرزەنشت دەکرد لەوەی بۆچی ناونیشانی شوێنی مانەوەیم وەرنەگرت ئێستا دەچووم بە دوایی، هێندەم تەلەفۆن بۆی کردووە وەڵامی نەبوو خەریکە لە وەڵام دانەوەی ئەوە بێ ئومێد دەبووم.

زۆر بەدڵتەنگی چوومە دەرەوە لەسەر چیمەنی شوێنی مانەوەکەمان پاڵکەوتم ومۆبایلەکەم لەسەر دڵم دانا و سەیری ئەستێرەکانم دەکرد، خۆزگەم دەخواست ئەستێرەیەك بوومایە ئەوکات ئۆندەرم لێدیار بووایەوە سەیریم کردبوایە.

لەنێو ئەو بیرو خەیاڵاتانەوە بووم جەرەسی مۆبایلەکەم دەنگی هات و سەیرمکرد ئۆندەریە تەلەفۆن دەکات،لەبەر قەلەقی وخۆشی بینینی ئەوەی کە تەلەفۆنی کردووە دەستم دەلەرزی نەمدەتوانی تەلەفۆنەکە بکەمەوە و قسەی لەگەڵ بکەم، هەرچۆنێك بوو وەلامم دایەوە و دوایی سڵاو کردن گووتی ببورە لەکاربووم بۆیە نەمتوانی وەڵامی تۆ بدەمەوە.

منیش گووتم هەر گویی مەدێ گرنگ ئەوەیە سەلامەتیت و گوێم لە ئێستا دەنگی تۆیە، گووتم بەڵێنەکی بەیانیت لە بیرماوە؟...

گووتی بەڵێ من پێم گووتی هیچ کاتێك بەڵێنەکانم ناشکێنم، بەیانی لە کوێ دەتوانم تۆ ببینم...منیش ناوی یەکێ لە ڕێستورانتە بەناوبانگەکانی شارەکەی خۆمانم پێی

گووت، هەرچەندە گووتی باشە بەڵام نازانم بۆچی لە باشەکەیەوە دیاربوو زۆر بەدڵی نەبوو، گووتی ئەی باشە سەعات چەند دەتوانیت بگەیتە ئەویٚ، منیش گووتم سەعات نۆیی بەیانی زۆر باشە تابتوانین هەرچی هەیە باسی بکەین و بەدڵی خۆمان قسەبکەین و کاتێکی باشمان لەبەر دەست بێت، ئەویش گووتی هەرچەند زۆر زووە بەڵام زۆرباشە بۆ من نابێتە کێشە.

ئەو شەوە تاوەکو بەیانی هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە بەیانی چی لەبەربکەم و چی بڵێم و لەگەڵی باسی چی بکەم؟، ئەو مۆبایلەی بۆیم کڕیوە چۆن پێی بدەم؟، ئەی ئەگەر ئەو رەتی کردەوە وەریبگرێت چی بکەم باشە؟، ئەی بەیانی کامە جلم لەبەربکە بەبەرمدا زۆر جوانە؟.

بەیانی زووەکەی هاوڕێیەکانم بانگ کرد و لە خەو هەڵمستاندن تاوەکو لە خۆ ئامادەکردنم یارمەتیم بدەن، زۆر پێیان سەیر بوو کە چۆن بەو بەیانیە زووە لە خەو هەڵساوم و تەمای کوێم هەیە؟، ئەمڕۆ دەوامی کۆلێژ نیەو پشووی فەرمیە، پرسیان خاتوون چی تۆی بەو بەیانیە زووە  ناچارکردووە لە خەو هەڵبستیت؟، منیش گووتم کۆبونەوەیەکی زۆر گرنگم لەگەڵ مامۆستایەکم هەیە، حەزیش ناکەم بەشێوەیەکی جوان دەرنەکەوم، بۆیە پێویستە ئێوە یارمەتیم بدەن تاوەکو بە جوانترین شێوە بەدیاربکەوم، لەهەمان کاتیش تەلەفۆنم بۆ جۆنی شوفێری تەکسی کرد بۆ ئەوەی بێت بەدواما و بمگەیێنێتە شوێنی مەبەست، ئەویش گووتی باشە بەزووترین کات دەگەمە لای تۆ.

دوایی ئەوەی گەیشتمە نزیك رێتسورانتەکە زۆر بەتاسەوە بووم بۆ بینینی ئۆندەر و دانیشتن لەسەر یە میزی نانخواردن، لە دڵی خۆم دەمگووت تۆ بڵێت ئۆندەرش بەهەمان شێوەی من بیر بکاتەوە، بەڵام لەسەرووی هەموو ئەو جۆرە خەیاڵانەوە زۆر لەوە دەترسام کە بنەماڵەکەی ئەوان زۆر لە سەرووی بنەماڵەی ئێمەوە بێت، یاخود ئەو کەسێکی تر لە دڵدابێت، رەنگە هەر ئەوەش هۆکارەکەبێت تاوەکو ئێستا گرنگی تەواوی بەمن نەداوە، هەر ئەوجۆرە بیرکردنەوە و خەیاڵانە زۆرجار دەبوونە هۆکاری دڵتەنگی من.

بەهەرجۆرێك بوو گەیشتمە نێو رێستورانتەكە و بینیم ئۆندەر دانیشتووە قاوە دەخواتەوە، كە چوومە لای دوایی سەلام كردن و چاك و چۆنی گووتم ببورە كەمێك دواكەوتم.

گووتی كێشە نیە زۆر دوا نەكەوتوویت لە كاتێكی باشدا گەیشتیت.

دوایی ئەوە دانیشتم گووتم ببورە هەر حەزمكرد زیاتر یەكتر بناسین و دەتوانین زیاتر یارمەتی یەكتر بدەین، بۆیە ئەو ئەزیەتەشم دا بەر بەرێزتان كە لێرە قسە بكەین یەكتر بە تەواوەتی بناسین.

ئەویش گووتی زۆرباشە كەواتە من با دەست پێبكەم من خەڵكی شاری هەولێرم، دایكم نەماوە و باوكم كرێكاری دەكات، دوایی ئەوەی لە ئینتەرنێت زەماڵەیەكی بەریتانیام پڕكردەوە و چانسی ئەوەم پێدرا كە لێرە بخوێنم.

بەڕاستی لێرەش ژیانم زۆر قورسە هەم دەخوێنم هەم كاریش دەكەم، بۆئەوەی هەرچی نەبێت بتوانم بتوانم یارمەتیەكی باوكم بدەم، لەبەر ئەوەی زۆر بەساڵاچووە و توانای كاری نەماوە، وابزانم تۆش هەروەك من كەسێكی لێرەدا خاوەن كێشەیەكی زۆریت، دەی ئێستا كاتی ئەوەیە تۆش خۆت بناسێنیت.

منیش لەبەر ئەوەی زانیم كە ئەو لە بنەماڵەیەكی زۆر هەژارە، بۆیە حەزم نەكرد بەدەوڵەمەندییەكی من و خانەوادەكەم بزانێت، گووتم باوكم كاری سەربەست دەكات و دایكیشم ماوە، وەك خۆت دەزانم منیش لێرە خەریكی ماستەرم و بەڵام من لێرە هیچ كارێك ناكەم، دەزانیت كاركردن بۆ كچ تۆزێك گرانە !

راست دەكەیت كاركردن بۆ كچ زۆر قورسە بەتایبەتی لە وواڵتی بێگانەدا...منیش لەوكاتەدا خێرا خەیاڵی ئەوەم دەكرد، كە من چەندە گوومانی خراپم بەو كوڕە برد، پێم

وابوو کە کەسێکی زۆر لەخۆباییە لەو ڕۆژەوە فێربووم هەرگیز خێرا بڕیار لەسەرکەس نەدەم، لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك لەناخی کەس نیە و لەناخی هیچ کەسێکیش ناگات.

لەو ڕۆژەدا زۆر قسەمان لەگەڵ یەکتری کرد و هەر نەمزانی چۆن کات لەگەڵ ئەوادا بەو خێراییە تێپەڕی و ڕۆیشت، هەرکە زانیم ئۆندەر گووتی دەزانی خەریکە دەبێتە نیوەڕۆ، باسی زۆر شتمان کرد و کاتیش درەنگە هەر لێرە باشتێك بخۆین و بڕۆین باشترە، منیش خێرا دەبێت بچم بۆ کار.

منیش گووتم زۆرباشە.

دوایی ئەوەی نانمان خوارد و تەواو بووین لە خواردن، نەمدەزانی چۆن مۆبایلەکەی بدەمێ کە بۆ ئەوم کڕیوە، دەترسم لەوەی هەست بە دەوڵەمەندییەکەی من بکات و خۆی لە من بەدوور گرێت.

دوایی بیرکردنەوەیەکی زۆر هەرچۆنێك بێت لەسەر میزی نانخواردنەکە ئۆندەرم بانگ کردوو گووتم ئەو مۆبایلەم بۆ تۆ هێناوە تۆ، لەبەر ئەوەی تۆ گووت مەجالم نیە مۆبایلێك بکڕم بۆیە من بۆ تۆم کڕی.

کاتێ ئۆندەر سەیری مۆبایلەکەی کرد گووتی کچێ ئەو مۆبایلە نرخی زۆر گرانە چۆن بۆت کڕیوم؟، من ئەوە قبوڵناکە و وەریناگرم لە کوێت کڕیوە بیبەرەوە بۆ ئەو شوێنە.

منیش گووتم هەندێك زیرم هەبوو کە هیچ کاتێك بەکارم نەهێناوە، بۆیە فرۆشتم و ئەو مۆبایلەم بۆ تۆ کڕی.

ئۆندەر گووتی منش ئەوها ئەو مۆبایلە قبوڵناکەم و کەی پارەم دەست کەوت بۆتی دەگەڕێنمەوە.

منیش بۆ ئەوەی ئۆندەر مۆبایلەکە وەرگرێت و قبوڵی بکات گووتم زۆرباشە هەرکاتێك پارەت دەست کەوت بۆمی بگەڕێنەوە، هەرئەوکات گووتم دەکرێت فەیسبووکەکەت وەربگرم هەرچی نەبێت لەوێشدا ببین بە هاوڕێ، ئەویش گوتی زۆرباشە دوایی ئەوەی فەیسبووکەکەیم وەرگرت گووتم کات زۆر دەرەنگ بووە با تۆش لەکارەکەت زۆر دوانەکەویت.

بەرلەوەی هەڵسین گووتم تەلەفۆنێك بۆ جۆنی سایەق تەکسی هاوڕێیەکەم دەکەم بێت بەدوامان و بمانگەێنێتە ماڵەوە و هەرچی نەبێت تۆش ئەو هاوڕێیەم دەناسیت و کەسێکی زۆر زۆر باشە، رەنگە رۆژێك لە رۆژان کێشەیەکت هەبێت و یارمەتیت دەدات.

هەرچەندە ئۆندەر گووتی من خۆم دەڕۆم بۆ ماڵەوە، بەڵام من هەرچۆنێك بێت رێگەم نەدا بڕوات و گووتم شوێنی مانەوەی من زۆر دوور نیە دوایی ئەوەی منی گەیاند تۆش دەگەێنێتە شوینی کارەکەت.

دوایی ئەوەی سواری تەکسیەکە بووین ئۆندەرو جۆن بە یەکتر ناساند، ئەو کات بە جۆنی شوفێرم گووت ئەو کوڕەش هاوڕێمە هەرکارێکی وویست بۆ ئەویش جیێ بەجیێ بکە.

جۆن گووتی مادەم ئەوەش هاوڕێی تۆیە شك و گومانێك لەوەدانیە ئەویش وەك خۆت کەسێکی باش و چاکە.

دوایی ئەوەی گەیشتینە نزیك شوێنی مانەوەی من لە تەکسیەکە دابەزیم و ئەوانیش لە رۆیشتن بەردەوام بوون و تاوەکو تەکسیەکە لە چاوەکانم وون بوو هەر سەیرم دەرکردن.

بەهەرحاڵ زیاتر لەساڵێك بەم هاوڕێیەتیە لەگەڵ ئۆندەر بەردەوام بووین و هیچ کاتێکیش نەمدەهێشت ئۆندەر هەست بە بەدەوڵەمەندی من بکات، دوایی ئەوە رۆژانە زیاتر قسەمان لەگەڵ یەکتر دەکرد و زیاتریش لەگەڵ یەکتر دەچووینە دەرەوە، بەڵام

تاكە خەمی گەورەی من ئەوە بوو کە بنەماڵەکەی من بە ئۆندەر رازی نەبن، رێگە نەدەن هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو بکەم.

هەمووکاتێکیش لە دڵی خۆم دەمگووت کێ دەلێت ئۆندەر منی بەدڵە هەتا ئێستا ئێمە هەروەك هاوڕێیەك بەردەوامین و هەست دەکەم ئۆندەر هەستێکی بۆ من هەیە بەلاَم ئەو هەستەی ئۆندەر هەستی خۆشەویستی نیە.

منیش نەمدەتوانی هەستی خۆم بۆ ئۆندەر دەرببڕم، بەلاَم هەموو جارێك بە ئۆندەرم دەگووت ئەگەر تۆ لێرە نەبوویتایە من نەمدەتوانی لە خوێندن بەردەوام بم، بەردەوام تۆ یارمەتی منت داوە و وورەیەکی زۆرت بەمن داوە، بەڕاستی ئەگەر تۆ نەبوویتایە من دەمێك بوو ئەگەڕامەوە هەولێر.

بەلاَم خۆی لەڕاستییەکەشی هەروا بوو، ئەگەر ئۆندەرم لەوێ نەدیبوایە ئەوا هیچ بیرم لەوە نەدەکردەوە لە خوێندن بەردەوام بم.

بەم شێوەیە هاوڕێیەکەمان بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بوو، تاوەکو شەوێك بە فەیسبووك لەگەڵ ئۆندەر قسەم دەکرد، کاتێك شەو درەنگ کەوت هەرلەقسەکردن بەردەوام بووین تاوەکو گووتم ئۆندەر کات درەنگ بووە و بەیانی زوو دەوامان هەیە، لەوێ دەتوانین زیاتر قسە لەگەڵ یەکتر بکەین زۆر باشترە، بۆیە ئێستا بنووین زۆر باشترە ئەو قسەشم لەبەر ئەوە نەبوو کە خەوم دەهات بەڵکو من زیاتر خەمی ئۆندەرم بوو، لەبەر ئەوەی ئەو دوایی دەرسەکان کاری دەکرد.

دوایی ئەوەی بەیانی لە خەو هەڵسام سەیری مۆبایلەکەم کرد بینیم ئۆندەر نامەیەکی ناردووە، هەر بەخێرایی سەیری نامەکەم کرد، بەلاَم نەمتوانی بەتەواوەتی بیخوێنمەوە لەبەر ئەوەی گولبەهار هاتە ژوورەوە و گووتی خۆت ئامادەبکە بۆ دەوام.

منیش بۆئەوەی ئەوە هەست بەهیچ نەکات، هەڵسام لەگەڵ ئەو خۆم بۆ دەوام ئامادە دەکرد، کەچی لەلایەکی تر زۆر دڵم لەلای خوێندنەوەی نامەکەم بوو تۆبڵێت چی تیادا نووسرابێت.

دوایی ئەوەی فرسەتێکم بۆ رێکەوت هەرچۆنێك بوو نامەکەم خوێندنەوە و نووسرابوو:(ئاریانە بەیانی لەدوایی تەواو بوونی دەرسەکانمان تۆ خێرا مەچوویەوە ماڵەوە، هەندێك کارم بەبەرێزتان هەیە).

منش زۆر لەلام سەیر بوو ئۆندەر ئەو نامەیەی ناردووە، لەبەر ئەوەی تاوەکو ئێستا ئۆندەر داوایەکی لەو جۆرەی لە من نەکردبوو، تۆبڵێت ئۆندەر چ کارێکی گرنگی هەبێت ئەو نامەیەی ناردووە؟، بەڵام هەر لەگەڵ بینینی نامەکە زۆر زۆر دڵخۆش بووم.

دوایی ئەوەی گەیشتمە کۆلێژ و تاوەکو دەرسەکانمان تەواو بوو هەر خەیاڵم لەوە بوو کە ئۆندەر دەبێت  چی بووێت چ کارێکی بە من  هەبێت؟.

دوایی تەواوبوونی دەرسەکان خێرا خۆم گەیاندە لای ئۆندەر و دوایی سلاّو کردن، ئۆندەر گووتی: کاتت هەیە بەیەکەوە بۆ کافتریایەك بچین و لەوێ هەندێك شت هەیە دەمەوێت پێت بڵێم؟.

منیش زۆر سەرم سوڕما لەوەی قسەیەی ئۆندەر، لەبەر ئەوەی لەو کاتەوەی ئەو دەناسم هیچ کاتێك هەر من پێم گووتووە بۆ دەرەوە هیچ کاتێك ئەو وای نەگووتووە، بۆیە زۆر بەسەرسامییەو گووتم بۆ نا زۆریش دڵخۆش دەبم.

دوایی ئەوەی لە کافتریاکە دانیشتین و ئۆندەر دەیگووت بەراستی من ئەو ماوەیەی لەگەڵ تۆ بووم زۆر دڵخۆشم بووم، خۆت دەزانی لێرەش خوێندنمان بەرەو تەواو بوون دەڕوات، ئیتر هەردووکمان دەگەڕێنەوە عێراق، کە تەنها گفتوو گۆیی ماستەرەکەمان لە شارە پڕ یادگارییەدا ماوە، رەنگە من تۆش جارێکی تر یەکتر نەبببنینەوە و هەریەکەمان

بەدوایی کاری خۆمان بکەوین، بۆیە لێرە بەر لەوەی ماڵئاوای بکەین لەیەکتر بە پێویستم زانی ئەوەی ماوەیەکی زۆرە لە دڵمە ئەمڕۆ پێت بڵێت.

منیش زۆر دڵم بەوە تووند بوو کە ئۆندەر گووتی رەنگە جارێکی تر یەکتر نەبینینەوە، هەر بۆیە پێم وابوو کە ئەو منی بەدڵ نیە ئیتر دوایی تەواو بوونمان ئەو نابینمەوە، بۆیە دەستم بە گریان کردوو و گووتم ئۆندەر بەڕاستی لە وولاتی غەریبیدا تۆ یارمەتییەکی زۆری منت دا، هیچ کاتێك لێرە هەستم بە غەریبی و تەنهایی نەکردووە، ئەگەر تۆ لێرە نەبوویتایە باوەڕبکە خوێندنم تەواو نەدەکرد و دەگەڕامەوە عێراق، ئەوە تۆ بووی بوویتە پشت و پەنام و یارمەتی منت دا، بەڕاستی ئۆندەر نازانم چۆن سوپاست بکەم؟، ئێستاش تۆ هەرچیت لە دڵدایە پێم بڵێ ئەوەی بەمن بکرێت دڵنیابە دریخی ناکەم.

ئۆندەرش زۆر بەدڵتەنگییەوە گووتی ئەوە بۆ دەگریت؟، تکایە بەڕاستی پێم بڵێ چ شتێکی خراپم گووتووە دڵی تۆی تەنگ کردبێت؟.

گووتم نەبەخوا ئۆندەرگیان هیچ شتێکی تۆ دڵی تەنگ نەکردووم، تەنها ئەوە نەبێت گووتت جارێکی تر یەکتر نابینینەوە بۆیە هەستم بەدڵ تەنگی کردوو و خۆم بۆ نەگیرا بۆیە گریان قورگی گرتم ببمبورە دڵی تۆشم تەنگ کرد، تکایە چیت هەیە پێم بڵێ تاوەکو زیاتر نەبمە هۆکاری دڵتەنگی تۆ و بگەڕێمەو شوێنی مانەوەم.

ئۆندەر گووتی بەڕاستی نازانم چۆن پێت بڵێم؟، ئەوەی راستی بێت من دەمێکە تۆم زۆر کەوتۆتە بەر دڵ و تۆشم زۆر خۆش دەوێت، تاوەکوو ئێستا نەمتوانیوە ئەو هەستەی خۆمت پێبڵێم، بەڵام لەبەر ئەوەی لێرە زۆرمان نەماوە بۆیە دەمەوێت بێت بڵێم ئەگەر رازی بیت کە گەڕاینەوە هەولێر دێمە لای دایك و باوکت و داوای تۆ دەکەم.

منیش کە گوێم لەوە بوو دڵم زۆر خۆش بوو خێرا گریانەکەم وەستا، بۆیە خۆم کۆکردەوە بەجۆرێك وەك بڵێت پێشتر هەر نەگریابم ،ئەوەی راستی بێت من هەر ئەوکات رازی بووم بەوەی کە هاوسەرگیری لەگەڵ بکەم، بەڵام بۆ ئەوەی هەست نەکات کە من

عاشقی ئەو بوویمە، لەبەر ئەوە گووتم ئەوە بڕیارێکی زۆر قورسە دەبێت بیری لێبکەمەوە، بۆ ئەوەش پێویستم بە مۆڵەتێکی چەند رۆژەیە، ئەوکات لەدڵی خۆم گووتم تۆ تازە ئەو قسەیە دەدرکێنی من ماوەیەکی زۆرە چاوەڕانی ئەو قسەیەم و دڵ و جەرگم بەداخی تۆیەوە هیچی بەبەرەوە نەما ئیتر چۆن من رەتی دەکەمەوە؟.

ئۆندەر گووتی زۆر ئاساییە ئەوە هەقێکی خۆتە چەندت پێویستە بیری لێبکەوە، لەبەر ئەوەی ئەو بڕیارەی ئێمە بڕیارێکی ئاسایی نیە.

دوایی چەند رۆژێك بەسەر داواکەی ئۆندەر تێپەڕی منیش بەرلەوەی بەدایك و باوکەمەوە بڵێم وەڵامی ئۆندەرم دایەوە، گووتم ئۆندەر دەزانم کە تۆ کەسێکی زۆرباش و چاکیت و ماوەیەکی زۆرە تۆ دەناسم هیچ خراپەیەکم لە تۆ نەبینیوە، بۆیە من رازیم لەوەی کە ژیانی هاوسەرگیری لە گەڵ تۆ پێك بهێنم، بەڵام پێویستە زیاتر یەکتر بناسین و قسەی زیاتر لەگەڵ ئاشنا بین، بۆیە کاتێکمان دیاری کرد بۆ ئەوەی کە یەکتر ببینین و باسی ژیانی دوور و دریژی خۆمان بکەین.

لەدانیشتنەکانمادا ئۆندەر کاتێ باسی ژیانی خۆی بۆ دەکردم، بۆم دەرکەوت بەڕاستی بەژیانێکی سەخت وناخۆشدا تێپەڕیووە، هەرکە گوێم لەژیانی ئەو دەگرت ناچار گریان قورگمی دەگرت و بەدزییەوە تێر تێر بۆ ژیانی ئەو گەنجە داماوە دەگریام.

دوایی ئەوە هێندە بەیەکەوە کاریگەر بووین، هەموو رۆژێك چەند سەعاتێك قسەمان لەگەڵ یەکتر دەکرد، بەڵام دیاربوو ئۆندەر بەهۆی کارکردنەوە زۆر ماندوو و شەکەت بوو، ئەگەرچی دەمویست یارمەتی ئەو بدەم، بەهۆی ئەوەی کە حەزم نەدەکرد لە کاتێکی زوودا بزانیت من لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و بەناوبانگین، بۆیە هیچ کاتێك نەمدەویست وەك کەسێکی دەوڵەمەند خۆم دەربخەم.

تا ئەو کاتەی رۆژێك دەمەو ئێوارە تەلەفۆنم بۆ ئۆندەر کرد، گووتم ئۆندەرگیان ئەمڕۆ تۆ کارت نیە بابەیەکەوە بچینە دەرەوە و بەیەکەوە نانێك بخۆین، بەڵام ئۆندەر گووتی

بمبوره ناتوانم بێمه دەروه، منیش زۆرم لەلا سەیر بوو هیچ کاتێك ئۆندەر قسەی منی رەتنەکردبوویەوه، بەڵام ئۆندەر دەنگی زۆۆر بەخراپی دەهات بۆیە گووتم ئۆندەر پێدەچیت تۆ نەخۆش بیت.

ئەویش گووتی گیانەکەم هیچم نیە دڵت تەنگ مەکە و نەخۆش نیمە.

گووتم با تۆ نەخۆشی چوویتە دکتۆر.

گووت نەخێر نەچوومەتە دکتۆر، منیش زۆر زۆر تورەبووم لێی و گووتم بۆچی نەچوویت؟.

هەرچەندە گووتی هیچ نیە بەڵام من باوەڕم پێی نەکرد زۆرم لێکرد تاوەکو پێم بڵێت.

ئەویش گووتی بەخوا ئەو مانگە هەموو ئەو پارەی پەیدام کردووە، بەهۆی ئەوەی باوکم زۆر نەخۆش بوو هەموویم بۆ ئەو ناردووە، ئێستاش هیچم نیە پێی بچم بۆ دکتۆر.

منیش کە گوێم لەوە بوو ئاگر لە جەرگ و هەناوم بەربوو گووتم هەڵسە خۆت ئامادەبکە لەگەڵ جۆنی شوفێر دیم بەدوایی تۆ بەیەکەوە دەچینە دکتۆر.

هەرچەندە ئۆندەر گووتی نابێت ناچم بۆ دکتۆر خۆم یەك دوو رۆژی تر چاك دەبمەوە، بەڵام من زۆر تکام لێکرد تاوەکو رازی بوو لەگەڵم بێتە نەخۆشخانە.

دوایی ئەوەی گەیشتمە لای ئەو بینم خۆی ئامادەکردووە بەڵام تاو لەرزێکی ئەو تۆی هەبوو بەحاڵ لەسەر پێیەکانی وەستابوو، کە بەو جۆرە چاوم بەو کەوت هەناوم وەك گرکان لەناوەو دەسوتا، کاتێ سواری سەیارە بوو بە چۆنم گووت بمانباتە باشترین نەخۆشخانەی ئەوشارە، ئۆندەر گووتی کچێ لێرە نەخۆشخانە پارەی زۆری دەوێت نەمن ئەو پارەیەم هەیە نەتۆش لێرە پێت پەیدا دەبێت.

منیش گووتم لەبری ئەوەی خەمی بارەت بێت ئێستا بیر لەخۆت بکەوە حاڵت زۆر باش نیە خەمی پارەشت نەبێت.

دوایی گەیشتنمان بۆ نەخۆشخانە دکتۆر گووتی حاڵی زۆرباش نیە بۆیە دەبێت سێ ڕۆژ لێرە بمێنێتەوە، منیش گووتم دکتۆر هەرچی پێویستە بۆی بکە.

ئۆندەر گووتی دکتۆر پێویست ناکات سێ ڕۆژ لێرە بمێنمەوە، هەندێك دەرمانم بۆ بنوسە خۆم باشتر دەبم.

منیش گووتم ئۆندەر بۆچی ناتەوێت بمێنیتەوە؟.

گووتی ئەخەر ئەو نەخۆشخانەیە پارەیەکی گەلێك زۆری دەوێت.

زۆر توڕە بووم لێ گووتم ئیتر بەسە ئەوەندە خەمی پارەت نەبێت، من زۆرم پارە هەیە با جارێ تۆ چاك ببیتەوە.

دوایی ئەوە گووتم منیش ئەم شەو لەگەڵ تۆ لە نەخۆشخانە دەمێنمەوە و ئاگام لە تۆ دەبێت نەوەك پێویستت بە شتێك هەبێت، گووتی تۆ بڕۆ نەوەك هاوڕێیەکانت هەست بەو پێوەندییەمان بکە، لەبەر ئەوەی حەزم نەدەکرد ئەوان بزانن پێوەندیم لەگەڵ ئۆندەر هەیە، بۆیە گووتم زۆرباشە ئێستا دەگەڕێمەوە ماڵەوە و بەیانی خێرا دێمەوە لات.

ئەگەرچی ئەو شەوە زۆر ماندوو بوو، بەلاّم لەخەمی ئۆندەر تەنها بۆ یەك چرکەش چاوم نەچووە خەو، هەرکە ڕۆژ بوویەوە خێرا بۆ نەخۆشخانە گەڕامەوە، کە چوومە ژوورەکەی ئۆندەر بینیم حاڵی زۆرباشە بۆیە نەمدەزانی چۆن دڵخۆشی خۆم دەربڕم.

سلاّوم لە ئۆندەرکرد گووتم زۆر سوپاس بۆ خوا زۆرباش دیاریت.

بەڵێ ئێستا زۆرباشم دەمەوێت لێرە بچمە دەرەوە، بۆئەوەی پارەی زیاترمان لەسەر نەکەوێت.

گووتم ئۆندەرگیان تۆ هیچ خەمی پارەت نەبێت ، شتێکت پێدەڵێم کە دەمێکە لە تۆم شاردۆتەوە، بەلاَم تکات لێدەکەم هیچ دڵت تەنگ نەکەیت لێم زوویر نەبیت.

بڵێ ئاریانەگیان من چۆن دڵم دێت لە تۆ زوویر ببم.

ئەخەر ئۆندەرگیان بەڵێن بدە کە زوویرنابیت، لەبەر ئەوەی دەزانم ئەگەر تۆ بەڵێنێك بدەی دەیبەیتە سەر.

دڵم تەقی ئاریانەگیان دەبڵێ بەڵێن بێت زوویر نابم.

ئیتر لەو کاتەوە هەموو راستیەکانی ژیانی خۆم بۆ ئۆندەر باس کرد، بینیم ئۆندەر رەنگی زۆر گۆڕاو بارووددۆخی تێکچوو، چوومەلای و گووتم گیانەکەم دەزانم دڵت لێم زوویربووە، ئەو کارەم تەنها بۆ ئەوەکرد کە تۆ لەدەست نەدەم، دوایی ئەوەی زانیم کەتۆ لەخانەوادەیەکی هەژاریت بڕیارم دا منیش وەك تۆ بە هەژاری بژیم، دەمزانی ئەگەر ئەوکات بە تۆم بگووتبا خۆت لە من بەدوور دەگرت و وات لێکدەدایەوە بە هۆی جیاوازی بارووددۆخی ئابووریمان بۆ بۆ یەکتر نابین، بەلاَم ئۆندەرگیان من تۆ و دڵی تۆم دەوێت نەوەك ماڵ و سامان ئێستاش هیچ شتێك ناتوانی لەیەکمان جیابکاتەوە، بەڕاستی هەرلەبەر دڵی تۆ بەتەنها یەك جل لەگەڵ تۆ دەهاتمە دەرەوە، تائەوکاتەی خۆت پارچە جلێکت بۆ کڕیم ئێستا هەر ئەو لەبەر دەکەم، لەو رۆژەوەی لەو رێستورانەتەی قسەم لەگەڵ تۆ کرد، بەخوا لەبەر تۆ نەچوومەتە رێستۆرانتەکی گرانبەها، هەمووکاتێك هاورێییەکانم پێم دەڵێن تۆ بۆچی واگۆڕایت؟، دەزانی بۆچی نەچوومەتەوە هیچ رێستورانتێکی بەناوبانگ، گیانەکەم هەر لەبەر تۆیە دەڵێم چۆن دەبێت من لێرە نانێکی باش بخۆم نەزانم ئەویش چی دەخوات.

بینیم ئۆندەر دەستی بەگریان کرد دەستی منی گرت ماچی کرد، گووتی ئاریانەگیان بەخوا تاوەکو ئێستا کەسێکی باشی دەوڵەمەندی وەك تۆم نەبینیوە، تۆ چ ئافرەتێکی فریشتەیت خودا بۆمی ناردووی، من نازانم خەوە یان راستی چۆن کەسێکی باشی

دەوڵەمەندی وەك تۆ لە هەولێر ماوە، دڵنیام تۆ کەسێکی زۆر بەسۆز و باشیت گیانەکەم، ئێستا تۆم زۆر زۆر زیاتر لەجاران خۆشتر دەوێت.

ئەوەی راستی بێت ئۆندەر گیان من لەو کەسە باشانە نیم کە تۆ تێیگەیشتووی بەڕاستی من بەر لەوەی تۆ بناسم زۆر لەوانەی تۆ باسی دەکەیت خراپتربووم، لەگەڵ ناسینی تۆ تەواوی بیرکردنەوە و تەنانەت ناخیشم گۆڕا، تۆ فریشتە بوویت خوا بۆمی نارد تاوەکو لە گێژاوە نەزانییەی دەوڵەمەندەکان تێکەوتوون رزگارم بکات، تۆش خەمی هیچت نەبێت هەموو شتێك بەدڵی خۆمان دەبێت.

لەدوایی ئەوە رووداوە زۆر زیاتر لە جاران من و ئۆندەر یەکترمان خۆش دەویست، بەجۆرێك یەکترمان کەوتبووە دڵەوە ئەگەر هەرموو رۆژێك هەواڵی یەکترمان نەپرسی بووایە دڵمان بۆ یەکتر تەنگ دەبوو.

ئەگەرچی لێرە تەنها گفتوگۆی ماستەرەکەم مابوو، کە دەبووایە دوایی مانگ و نیوێکی تر گفتۆگۆی ماستەرەکە تەواو بکەم و بگەڕێمەوە، بەڵام باوکم هەواڵی دامێ کە دایکم نەشتەرگەری بۆ دەکرێت و دەیەوێت بەر لەوەی نەشتەرگەرییەکەی بۆ بکرێت من ببینێت، هەرچەندە نەشتەرگەرییەکەگەورە نەبوو بەلام هەر حەزی کردبوو من ببینێت، بۆیە باوکم پلیتی فڕۆکەی بۆ کڕیم گووتی کچم بگەڕێوە عیراق.

بەیەك رۆژ بەرلەوەی بگەڕێمەوە من ئۆندەر یەکترمان بینی، بینیم ئۆندەر زۆر دڵی تەنگە بەو گەڕانەوەی من، دواترئۆندەر گووتی ئاریانەگیان کەی داکت حاڵی باشتر بوو پێی بڵێ کە من بەتەمام بێمە داوایی تۆ، هەرکە گەڕایتەوە ئێرە ئەمجارە هەردووکمان تەواو دەبین بەیەکەوە دەگرێنەوە.

زۆر دڵم خۆش بوو کە گوێم لەو قسەیەی ئۆندەر بوو، گووتم زۆرباشە هەرکە دایکم کەمێك باشتربوو هەموو شتێکی پێدەلێم، پێشی دەڵێم قسە لەگەڵ باوکیشمدا بکات،

بەڵام لەبەر خاتری خوا ئۆندەر گیان زۆر دڵی خۆت تەنگ مەکە، هەر بۆ دە ڕۆژێك لە هەولێر دەمێنمەوە لەوە زیاتر ناتوانم تۆ نەبینم.

نەمزانی ئەو شارەی لەسەرەتا نەفرەتم لێدەکرد بە چ خەمێکی و زۆرەوە سواری فڕۆکە دەبم بۆ ئەوەی بەجێی بهێڵم، بەجۆرێك خەمباربووم وەك بڵێیت جارێکی تر ئۆندەر نابینمەوە، بۆیە دەنگێك لەناخەوە هانی دام لە فڕۆکەخانە ئۆندەر لەباوەش بکەم و بەجۆرێك ئەوم گووشی وەك بڵێیت ئەو نابینمەوە.

دوایی ئەوەی گەیشتمەوە هەولێر بە تامەزرۆ بووم بۆ بینینی دایکم کە دوو ساڵە ئەو نەبینیوە، ئەگەرچی بینینی دایکم دڵخۆشم دەکات بەڵام بەجێهێشتنی ئۆندەر بۆ من زۆر سەخت بوو، بەردەوام قسەکانی ئەوم بەبیر دەهاتەوە، ئەوەی دڵی خۆش دەکردەم ئەوە بوو دەمگووت ئەمجارە بەیەکەوە دەگەڕێنەوە و دەبینە ژن و مێردی یەکتر.

گەیشتمەوە ماڵ بۆ دەرکەوت کە نەخۆشی دایکم ڕاست نیە و تەنها بۆ ئەوە منیان گەڕاندۆتەوە ڕۆژی لەدایك بوونی منە لەو ڕۆژەدا، بۆیە باوکیشم بۆ ئەو ڕۆژە پلیتی فڕۆکەی بۆ کڕیبووم.

بینیم ئاهەنگێکی گەورەیان بۆ من سازکردووە، ئەوەی ڕاستی بێت لە ئاهەنگە گەورەدا هیچ دڵم خۆش نەبوو، بەهۆی ئەوەی دڵم هەر لەلای ئۆندەر بوو دەمگووت خۆزگە ئەویش لێرە بووایە و پیرۆزبایی لێکردبوومایە.

دوایی چەند ڕۆژێك لەماڵەوە کەمێك ماندوویەتیم حەسایەوە لەگەڵ دایکم باسی ئەو ڕووداوانەم کرد کە لەماوەی ئەو دووساڵە ڕوویداوە، هەروەها باسی ئۆندەرم بۆیکرد و گووتم من ئەو زۆر یەکترمان خۆش دەوێت.

دایکم گووتی زۆرباشە تەنانەت لەسەرەتادا زۆریشی پێخۆش بوو، بەڵام دوایی ئەوەی کە باسی بنەماڵەی ئەو کوڕەم کرد، دیار بوو دایکم ڕووخساری گۆڕدرا و ئەو قسانەی منی

پێ خۆش نەبوو، منیش گووتم رەنگە لەبەر ئەوە پێی خۆش نەبێت من کچی بچووکی ماڵەوەم و بەتەنیا لە ماڵەوە ماوەمەتەوە.

ئیتر دایکم گووتی کچم ماندوویەتیت لە لەش بچێتە دەرەوە دواتر قسە لەسەر ئەوە بابەتە دەکەینەوە، گووتم زۆرباشە دایەگیان تۆ چیت پێ باشە با ئەو بێت.

ئۆندەر زۆر پێوەندی پێوە دەکردم و منیش لەبەر ئەوەی ئەو نەیدەزانی دایکم نە خۆش نیە بۆیە وەڵامیم نەدەدایەوە، بەردەوام نامەی دەنارد و زۆر قەلەق دیاربوو بەردەوام دەیگووت چیت کردەوە خۆ هیچ نەبووە بۆچی وەڵامم نادەیتەوە؟

منیش گووتم نەکا ئەوە دڵی تەنگ بێت، گووتم دایکم ئێستا زۆرباشترە بەڵام تاوەکو ئێستا پێم نەگوتووە، هیچ خەمت نەبێت لەو زووانە پێدەڵێم.

زۆر نەماوە بۆ گەڕانەوەم بۆ بەریتانیا بۆیە جارێکی تر سەبارەت بەو بابەتە لەگەڵ دایکم قسەم کردەوە.

دایکم گووتی دەڵێ تاوەکو ئێستا ئەو بابەتەت لە بیر نەکردووە، من گووتم ئێستا تۆ لەبیرت کردووە و جارێکی تر هەرباسیشی ناکەیتەوە.

منیش گووتم ئەوە چی دەڵێیت دایکە گیان؟.

کچی شیرینم من تاوەکو ئێستا تۆم زۆر بەجوانی و رێك و پێمی بەخیوکردووە، لەژیانتدا نەمهێشتووە هیچ کەم و کوڕییەکت هەبێت، وانازانم هیچ دایکێکیش خراپەی منداڵی خۆی بوویت، لەبەر ئەوە پێدەڵێم واز لەو کوڕە بهێنە و ئەویش لەبیر بکە، حەزناکەم کچەکەم ببێتە کارەکەری هیچ ماڵێك، ئەو کوڕە دایکی نەماوە تۆ بچیتە ئەو ماڵە دەبیتە کرێکار و خزمەتکاری خوشك و براکانی، هەموو ئەرکەکان ئەو ماڵە دەکەوێتە سەر شانی تۆ.

بەڕاستی دایکە گیان من ئەو کوڕەم زۆر خۆش دەوێت و ئەویش منی زۆر خۆش دەوێت.

کچم تۆ قسەی من دەشکێنیت و قسەی کوڕێکی بێگانە لەپێشتر دەزانیت.

نەخێر دایکە گیان من کاری لەو جۆرە ناکەم.

کەواتە بەقسەی من بکە و ئەو کوڕە و تۆیان نەگووتووە، تەنانەت بنەماڵەکەشیان لەگەڵ ئێمە ناگونجێت، تۆ لەچ خانەوادەیەك و ئەو لەچ جۆرە خانەوادەیەك لەبەرئەوە واز لەو کوڕە بهێنە وخۆت مەکە خزمەتکاری هیچ کەسێك، تاماوی هەر بەخزمەتکاری دەمێنیتەوە، دڵنیابە باوکیشت بە بیستنی ئەو بابەتە زۆر توڕە دەبێت ئەگەر قسەی ئەویش بشکێنیت هیچ یارمەتیەکت نادات و من و باوکیشت خۆمان لێت بێبەری دەکەین.

دوایی ئەوە زۆر بەدڵتەنگی چوومە ژوورەکەی خۆمەوە و دەمگووت چۆن واز لە ئۆندەر بهێنم؟، سەیری تەلەفۆنەکەم کرد تەلەفۆنێکی زۆری ئۆندەرم بۆ هاتووە و وەلامیم نەداوەتەوە، نەمدەزانی چی بەو کوڕە بلێم بۆیە تەنها نامەیەکم بۆی نارد گووتم ئۆندەر زۆر سەرقاڵم دوایی قسە دەکەین.

ئیتر چەند رۆژێك بەم شێوەیە تێپەڕی و من زۆر بەساردی وەڵامی ئۆندەرم دەدایەوە، دەمگووت بەڵکو خۆی لێم توڕەبێت و وازم لیّ بهێنێت، دیار بوو ئۆندەرش زۆر بۆم زۆر نیگەران ببوو، لەبەر ئەوەی ماوەی گەڕانەوەکەم بەسەرچوو تا ئەوکاتیش نەگەڕابوومەوە، جگەلەوەش ئەو هەرچەندەی نامەی دەنارد وەڵامم نەدەدایەوە یاخود نامەیەکی کورتم بۆی دەنارد و دەمگووت زۆر سەرقاڵم و دایکیشم حاڵی زۆر باش نیە.

بەهۆی قسەکانی دایکم بەجۆرێك دڵم لەسەر ئۆندەر سارد بوو هیچ کاتێك بینینەوەی ئەوم نەدەویست، لەوکاتەشدا دایکم بەردەوام بەدەورو بەرم دادەهات دەگووت کچم کوڕی

زۆر لەوە باشتر هەیە دەتوانیت لەگەڵ ئەو دلخۆش بیت، بەو کوڕە بڵێ باواز لەتۆ بهێنێت و چیتر پێوەندیت پێوە نەکات.

دەمگووت دایکە گیان زۆر دەترسم لەوەی ئۆندەر شتێکی خراپ بکات، بۆ گفتوگۆی ماستەرەکەم من هەر دەبێت بگەڕێمەوە بەریتانیا لەوێ ئەو دەبینم.

کچم تۆ گووت مانگێکی تر ئەو تەواو دەبێت تۆ تا ئەو تەواو دەکات کاتەکەت درێژبکەوە و بۆ بەریتانیا مەگەڕێیەوە، منیش بە هەموو شێوەیەك لەگەڵ تۆ دەبم و یارمەتیت دەدەم.

دوایی تێپەڕبوونی ماوەیەك بەم شێوەیە، ئۆندەر نامەیەکی نارد گووتی من ئۆندەریی سەلامەتی بۆ دایکت دەخوازم حەزم دەکرد ئێستا لێرە لەتەك من بوویتایە، رۆژی گفتووگۆی ماستەرم بۆ دیاری کراوە و دووهەفتەی تر گفتووگۆکە دەکەم و دەگەڕێمەوە، دەتۆش وەلامم بدەوە بەڕاستی زۆر دڵتەنگی تۆم، هەرکە هاتمەوە دێمە داوات و کۆتایی بەو کارە دەهێنین.

منیش بەدایکم گووت دایکە ئۆندەر هێندەی نەماوە بگەڕێتەوە چی بکەین باشە؟.

گووتی تاوەکو بەیانی بوەستە کچم پلانێك دادەنێم بۆ ئەوەی وازلەتۆ بهێنێت.

بۆ بەیانیە زووەکەی دایکم لە خەودا بەدەنگێکی بەرز بانگی کردم ئەریانەگیان هەڵسە لە خەو ئەو شەو پلانێکی باشم بەبیر داهات بۆ ئەوەی ئۆندەر بەئاسانی واز لە تۆ بهێنێت.

زۆر بەسەرسوڕمانیەوە گووتم چیە دایکە گیان.

گووتی نامەیەك بۆ ئۆندەر بنێرە و بڵێ دایکم رەزامەندی دەربڕیوە بۆ ئەوەی شو بە تۆ بکەم، بەلام کاتێك بە باوکمی گووت زۆر توڕە بوو گووتی بەهیچ شێوەیەك رازی نیم

شوو بەو کوڕە بکەیت، ئیتر بەو شێوەیە ئۆندەر نازانێت ئەوە پلانی نێوان خۆمانە بۆ ئەومان داناوە و خێرا باوەڕدەکات و وازت لێدەهێنێت.

منیش ئەو پلانەم زۆر پێباشبوو بۆیە کاتی ئەوە هات کە بە ئۆندەر بڵێم بەهەرجۆرێك بووە وازم لێ بیهێنێت و من لەبیر بکات، ئیتر ئەوە دواکاتە هەرچۆنێك بێت لە کۆڵەخۆمی بکەمەوە، لەبەر ئەوە خێرا تەلەفۆنم بۆی کرد لەکاتی قسەکردنم لەگەڵیدا بۆم دەرکەوت لەو رەفتارەی ئەوە ماوەیەم و دواکەتنم و نەگەڕانەوەم بۆ بەریتانیا زۆر قەلەق و دڵ تەنگ بووە.

دوایی کەمێك قسەکردنمان لەگەڵ یەکتر گووتی هەست دەکەم ماوەیەکە رەفتارت لەگەڵ من گۆڕاوە.

منیش گووتم تۆ نازانیت کە چی لەماڵی ئێمە روویداوە، بۆیە هەرچۆنێم بێت دەبێت ئێمە وازلەیەکتر بهێنین، لەبەر ئەوەی باوکم بەهیچ جۆرێك رازی نیە بەوەی کە هاوسەرگیری لەگەڵ تۆ بکەم.

تکات لێدەکەم هەرچی یادگاری منت لەلا هەیە لەبیر و خەیاڵی خۆت رەشی بکەوە و منیش لەبیر بکە، هەوڵمەدە جارێکی تریش پێوەندیم پێوە بکەیت، دەی من دەبێت تەلەفۆنەکە دابخەم ناتوانم زیات ر قسە لەگەڵ تۆ بکەم خوات لەگەڵ بێت.

کاتێ ئۆندەر گوێی لەوە بوو زۆر توڕە بوو منیش زۆر ترسام هیچ کاتێك نەمبینیبوو ئۆندەر توڕە ببێت، لەلایەکی تر دەترسام کارێکی شێتانە بکات، بەلأم دڵنیا بووم لەوەی کە ئەو هیچ ناکات، لەبەر ئەوەی ئۆندەر کەسێکی زۆر باش و میهرەبان بوو.

هەرچەندە ئۆندەر هاواری کرد و گریا و پاڕایەوە وازی لێنەهێنم، پێم گووت ئارام بگرە هەر ماوەیەکی ترە لەبیرم دەکەیت، هەموو پەیوەندیەکیشم لەگەڵی پچڕاند و گووتم بەسە ئیتر پێوەندیم پێوە مەکە.

ئەو بەیانیە تاوەکو ئێوارە داهات زۆر زۆر نامەی بۆ ناردم تاوەکو شەو گەیشتە نیوەی لەکۆتایدا گووتی ئاریانەگیان من بیٚ تۆ ناژیم و لیٚت دەپاڕیٚمەوە ئەو خەونە جوانانەی پیٚت نیشاندام و لەگەڵ تۆم دروست کردووە تیٚکی مەشکیٚنە.

منیش هەر سەیری نامەکانم دەکرد نەك ئەوەی هەروەك هیچ نەبوویٚ هەموو گریان و تکا و پاڕانەوەکانی ئەو کاری لیٚنەدەکردم و وەك ئەوەی ئەوم هەرنەناسیی بیٚت رەفتارم دەرکرد.

بەلاٚم لەگەڵ هەموو ئەوانەش زۆر دلٚم تەنگ بوو نەمدەزانی بۆچی بەوجۆرە بیٚتاقەت بووم؟، تەنانەت دایکیشم هەستی بەو دلٚتەنگییەی منی کردووە،بەلاٚم دیارە ئەوەی دایکم پیٚمی دەلٚیٚت بۆ من باشترە لەوەی کە کوڕیٚکی بیٚگانە بیٚتە نیٚوانمان.

هیچ بیٚتاقەتی نەکردبووم ئەوە نەبیٚ ئۆندەر کاریٚکی شیٚتانە بکات و ببیٚتە مایەی مەترسی بۆ سەر ژیانی من، کەچی هیچ دلٚتەنگیەکم بۆ ئۆندەر نەبوو، لەبەرئەوەی دایکم بەجۆریٚك میٚشك و دلٚمی پڕکردبوو کە ئەو کوڕە ناتوانیٚ ژیانم خۆش بکات، لەوکاتەدا هیچ شتیٚکی ئۆندەرم نەدەهاتە بەر چاو.

دوایی ئەوەی چەند رۆژیٚك تیٚپەڕی هیچ هەولٚیٚکی ئۆندەرم نەبوو، هەرچەندە سەیری ئەکاونتەکەی دەکەم ماوەیەکی زۆرە نەهاتۆتە خەت، منیش زۆر بیتاقەتی ئەوە بووم ئەو شتیٚکی بەسەر بیٚت و من تیایدا تاوانباربم.

ئەوەی راستی بیٚت هیچ بیرم لە ئۆندەر نەدەکردەوە تەنها بیرم لە خۆم دەکردەوە نەوەك ئۆندەر کاریٚك بکات من پیٚوەی گرفتاربم.

ئیٚستادایکم هەست بەو بیٚتاقەتیەی من دەکات، بۆیە گووتی کچە جوانەکەم هیچ خەم مەخۆ ئەو ئیٚوارەیە دەچینە سەیران و کاتیٚکی خۆش بۆ خۆت وەربگرە و ئەو بابەتەش لەبیرت دەچیٚتە دەرەوە.

ئێمە فێلایەکمان لە دەرەوەی شار هەیە کە کەوتۆتە سەر رووبار بەڕاستی شوێنێکی زۆر خۆش و دڵڕفێنە، دایکم گووتی مانگێك لەوێ دەمێنینەوە بۆ خۆت تەواو ماندوویەتیت لە لەش دەچێتە درەوە، لەوماوەیەش کەس و کارەکانمان دێنە لامان و کاتێکی خۆش لەگەڵ یەکتر بەسەر دەبەین، منیش بۆ ئەوەی هەرچی نەبێت هەندێك دڵخۆش ببم و ئەوە مەسەلەیە کەمێك لە مێشکم دەرکەم گووتم زۆرباشە دەچین.

دوایی ئەوەی چەند رۆژێکە لێرەین بەلأم هەر هەست بە بێتاقەتی و بێزاری زۆر دەکەم، ئەگەرچی زۆرێك لەکەس و کارەکانمان دینە ئێرە شەو تاوەکو بەیانی قسەی خۆش و یاری دەکەن، کەچی من بەهیچ شتێك دڵم خۆش نەدەبوو.

لەبەر ئەوەی وەرزی زستانە ئەمڕۆ لێرە کەمێك کەش وهەوا سارد و بایەکی بەهێزی دێت، ئەوەی راستی بێت مرۆڤ لەم جۆرە کەش و هەوایەدا هەر لە خۆیەوە دڵی تەنگ دەبێت جاچ ئەوەی خەمێکی گەورەشی لەدڵدابێت.

ئەگەرچی کات بەرەو درەنگی دەڕوات  و خۆر دەمەو ئاوابوونە، ئەوە لەلایەك لەلایەکی تر ئەمڕۆ زۆر زیاتر بێتاقەت و خەمگینم بەجۆرێك کاتێ دڵخۆشی دەورو بەرەکەم دەبینی زیاتر هەستم بە بێتاقەتی دەرکرد، بۆیە گووتم دایکەگیان دەچمە سەر رووبارەکە و خۆم بە ماسی گرتن خەریك دەکەم، ئەگەرچی دایکم گووتی کات زۆر درەنگە مەچووە سەر رووبار، ئەگەر هەر نیازی چوونیشت هەیە منیش لەگەڵت دێم.

منیش گووتم دایکە پێویست ناکات تۆ بێت بەتەنیا دەچم، بۆئەوەی هەرچی نەبێت کەمێك خۆم لەبیربکەم و ئەو رووداوەی لە مێشکمدا دەخولێتەوە لەیادی بکەم.

کە چوومە سەر رووبارەکە ئاوەکە بەجۆرێك دەهات وەك بڵێت ئەویش لەمن بێزارە،بایەکەش بەجۆرێك هێندە بەهێزبوو هەست بەوە دەکەم تاوانێکی گەورەم کردبێ دوونیا هەوڵ دەدات تۆڵەی ئەوە تاوانەم لێبکاتەوە.

دوایی ئەوە بەجۆرێك دڵم توند بوو لەگەڵ دەنگی بایەکە ئەو ووشە ناخۆش و رەقانەی کە بە ئۆندەرم گووتبوو دەهاتەوە ناو گوێم.

هەرکە بیرم لە ئۆندەر دەرکردەوە بە خۆم دەگووت خۆ من کارێکی خراپم نەکردووە ئەو دڵی لە چی من دەشکێت، هەرچی نەبێت ماوەیەکە و لەبیری دەکات، دەمگووت بۆچی دەبێت لەسەر بەڵێنێکی بێبنەمای ئەو کورە خۆم بەو دەرۆزەکەر و برسییە ببەستمەوە و وەك دایکم گووتی ژیانی خۆم تاڵ بکەم.

زۆر گوێم بە ئۆندەر نەدەدا و قولابەکەم دەخستە ناو ئاوەکەوە و زۆر بەدیقەتەوە سەیرم دەکرد بۆئەوەی ماسییەك بگرم و دڵم پێی خۆش بێت، دوایی چەند جارێك لە هاوێشتنی قولابەکەم بۆ ناو ئاوەکە هیچ شتێکم دەست نەکەوت، جگەلەوەش کات بەرەو درەنگی دەڕوات، بەڵام خۆم بێ ئومێدنەکرد گووتم دواجار قولابەکە دەخەمە ئاوەکەوە ئەگەر شتێکم دەست بکەوێت باشە ئەگەرنا بەدەست بەتاڵی دەگەڕێمەوە تاوەکو کات درەنگ تر نەبووە، لەبەرئەوەی ئەوناوچەیەی ئێرە لە ئاو نزیکە رەنگە ئاژەڵە زیان بەخشەکان دەمەو ئێواران بۆ ئاو خواردنەوە بۆ ئێرە دێن.

کۆتاجار کە شانسی خۆم تاقی کردەوە قولابەکەم بۆ قووڵایی ئاوەکە هەڵدا هەرکە زانیم هیچم دەستگیر نابێت هێواش هێواش دەستم بەڕاکێشانی قولابەکە کرد، بەڵام کە قوڵابەکەم راکێشا هەستم بە قورساییەکی گەلێك زۆر کرد.

پێم وایە ماسییەکی زۆر گەورەم گرتووە ئیتر ئەوە دەمەو خۆر ئاوابوون ئێوارەیە لەگەڵ ئەو بایە ساردەی دێت ماسی خواردن تام و لەزەتێکی خۆی هەیە، هەروەها دایك و باوکم بەو کارەی من زۆر دڵخۆش دەبن.

راكێشانی قولابەکە زۆر قورس و گران بوو بۆم تەنانەت رەنگە لەتوانایی خۆم بەدەر بێت، هەرچۆنێك بوو دوایی ماندووبوونێکی زۆر قولابەکەم گەیاندە سەرەوە و لەگەڵ دەرکەوتنی قولابەکە چیم بینی؟، لە قوتوویەکی ئاسن زیاتر هیچی تر نیە، لەدڵەوە هەستم بەنائومێدییەکی زۆر کرد وام هەست دەکرد کە سروشت زوڵمێکی زۆری لێکردووم، بینی قوتوویەکی ئاسن زۆر دڵی تەنگ کردم، لەبەرئەوەی هەموو ئەو خەیاڵانەی لەکاتی راکێشانی قولابەکە دروستم کردبوو پەرش و بڵاوبوویەوە.

خودایە من لە خەیاڵی خۆمدا جیم دانابوو لە کۆتایدا چیم بۆ دەرچوو؟،بەمشێوەیە دەستم بە نارەزایی کرد لە چانس و بەختی خۆم، دەمگووت لەکەیەکەوە خەیاڵی ئەوە دەکەم ئەوماسیە دەبەمەوە و دڵی دایکم و باوکمی پێ خۆش دەکەم و ئێوارە خوانێکی خۆش بەیەکەوە دەخۆین،ئیتر لەگەڵ دەرکەوتنی قوتوویەکی ئاسنی بێ کەڵك هەموو خەیاڵەکانم پوچەڵبوویەوە.

دوونیا وایە لەگەڵ دەرکەوتنی راستییەکان ژیان هەموو خەیاڵەکانی ژیانمان دەبن بە درۆ، بۆیە بڕیارمدا تا راستی ژیانم بۆ بەدیار نەکەوێت لە مێشکمدا خەیاڵی درۆ دروست نەکەم، دواتر هێندەی ئەو خەیاڵە لە بیرمدا دروستم کردوون ئازارم دەدەن، ئەگەر بەدەیان خەیاڵی تریشمان بگەین بۆمان قەرەبوو ناکرێتەوە.

هەر لەوکاتەدا قسەبەکی ئۆندەرم بیرکەوتەوە کە هەمووجارێك دەیگووت ئاریانەگیان تواخوا ئەوە خەیالأنە خۆشانەی بە هۆی بەڵێنەکانی تۆوە دروستم کردووە لێمی مەکە بە تاڵییەکی ژیان، هیچ لەوە ناخۆشتر نیە مرۆڤ خەیاڵی لەسەر شتێك بنیات بنێت بەلأم دواتر وەك پوشی بەر با بڵاوببێتەوە.

بەهەرحاڵ بەدڵێکی زۆر سارد قوتووەکەم دەرهێناو زۆرم نەفرەت لەو قوتووەکرد کە زۆر پێوەی ماندوو بووم، بەلأم کەسەیری قوتووەکەم کرد قوتوویەکی زۆر سەیر بوو پێدەچوو ماوەیەکی زۆر بێت لە ژێر ئاودا مابێتەوە، ئەوەی زۆر سەرنجی منی راکێشا

چۆنیەتی دروست کردنی قوتووەکە بوو، کەبەشێوەیەکی زۆر بە هێز دروست کرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا قوفڵێکی زۆر گەورەی لێدرابوو، قوڕ و لیتەیەکی زۆری گرتبوو، گووتم تۆ بڵێت نهێنی ئەو قوتووە چی بێت بەم شێوە تووندو تۆڵە دروستکراوە.

بەر لەوەی بگەڕێمەوە ڤێلاکەمان هەرلەسەر ئاوی رووبارەکە دەستم بەخاوێن کردنەوەی قوتووەکە کرد، لایەکی قوڕ و لیتەی قوتوەکەم خاوێن کردەوە وێنەی کچێك بەدیارکەوت، ئەوەی راستی بێت پێم کچێکی جوان نیە، بیرمکردەوە بۆچی دەبێت ئەو کچە وێنەی لەسەر ئەو قوتووە هەبێت؟، بێگومان ئەو قوتووە و ئەم وێنەیە نهێنییەکی هەیە، کە من هیچ لەبارەی ئەو نهێنییەوە نازانم، ئیتر لەگەڵ دەرکەوتنی وێنەکە ئەو نەفرەتەی سەرەتا لە قوتوەکەم دەرکرد بۆ خولیا بوون پێیەوە گۆڕدرا.

هێواش هێواش لەگەڵ خاوێنکردنەوەی قوتووەکە نهێنیە شاراوەکانی زیاتر دەبێت و منیش زیاتر و زیاتر مەرەقی کردنەوەی دەکەم، بەخێرایی دەستم بەشوشتنی لاکەی تری کرد وێنە کوڕێکی گەنجی زۆر رێك و جوان بەدیارکەوت، لەدڵی خۆم گووتم خوایە دەبێت نهێنی ئەو دوو وێنەیە لەسەر ئەو قوتووە چی بێت؟.

زۆر بەخۆش و خرۆشییەوە لەخاوێنکردنەوەی قوتووەکە بەردەوام بووم و نووسینێك بەدیارکەوت کە نووسرابوو:(ئەو شتانەی لەژیانمدا بە نهێنی بوون با هەر بەنهێنی بمێنەوە، لەژیانی مندا زۆرشت پرسیاریان هەبوو، زۆر هەوڵمدا وەڵامیان بۆ بدۆزمەوە زۆریش گەڕام بەڵام سەیرمکرد تەمەنم کۆتاییەو هێشتا وەڵامم بۆیان نەدۆزیوەتەوە، ئیتر هەروەك چۆن من لەژیاندا وون دەبم ئاواش با نهێنیەکانم وون بن، با نهێنیەکان لە دڵم نێتە دەرەوە، هەرکە نهێنیەکان هاتنە دەرەوە ئەوا مانایەکیان نامێنێت، بۆیە هەروەك چۆن من لەژیان وون دەبم ئاواش بانهێنیەکانم وون بن، وەك چۆن من دەچمە ژێر گڵ ئاواش بانهێنیەکان بکەوێتە ژێر ئاو).

بەڕاستی دوایی خوێندنەوەی ئەو چەند دێرە کردنەوەی قوتووەکە لە مەرەقێکەوە بۆم بوو خولیایەکی قوڵ، بۆیە بەخێراییەکی زۆر زیاتر دەستم بە خاوێن کردنەوەی لاکانی تری قوتووەکە کرد، نووسراوێکی تر بەدیارکەوت نووسرابوو(من بە عیشق و خۆشەویستی ئافرەت هاتمە دوونیاوە، هەر بەعیشق و خۆشەویستی ئافرەتەوە گەورەبوو، عیشق و خۆشەویستی ئافرەتێکیش بوو ژیانی لەناوبردم و بۆ گۆڕی بردم).

دوایی ئەوە زۆر زیاتر بە سەیر و سەرمەرەکانی قوتووەکە سەرسام بووم، دواین لای قوتووەکە کە قوڕ و لیتەکەی سەریم لابرد لەسەری نوسرابوو(نهێنیەکانم و نهێنیەکانت پارێزراون تاوەکو ئەو کاتەی نهێنیەکانی نێو ئەو قوتووە ئاشکرادەبێت).

هەر لەسەر رووبارەکە حەزم دەکرد قوتووەکە بشکێنم و سەیری ناوی بکەم و بزانم کە چی تیادایە، بەڵام کەسەری کاتم کرد هەم خۆر خەریکە ئاوا دەبێت هەمیش بە هۆی درەنگ کەوتنمەوە دایك و باوکم دڵیان بۆم تەنگ دەبێت، لەبەرئەوە قوتووەکەم هەڵگرت و بەروە فێلاکەمان گەڕامەوە و نهێنی قوتووەکە بەهیچ شێوەیەك نەمدەویست لەلای دایك و باوکم باس بکەم، گەیشتمەوە ڤێلاکە بەبێ ئەوەی دایك و باوکم هەستم پێ بکەن بەخێرایی خۆم بە ژوورەکەی خۆمداکرد، ناو ڤێلاکەمان هیچ دەنگێکی لێوە نەدەهات پێدەچوو دوایی دەرچوونی من خزم و کەس و کارەکانمان رۆشتبێتن، لە نێو ژوورەکەی خۆمدا دەرگاکەم داخست و زۆر هەستم بەتەنیای دەکرد بەتایبەتی بەهۆی ئەوەی هیچ دەنگێك لە ناو ڤێلاکەمان نەدەبیسترا کەمێك ترسم لێ نیشتبوو.

زۆر دەترسم نازانم هۆکاری ئەو ترسەی من چیە؟، بەردەوام دەنگێك لەناخمەوە پێم دەڵێت ئەم قوتووە مەکەوە و بیگەڕێنەوە شوێنی خۆی، واهەست دەکەم بەکردنەوەی ئەو قوتووە شتێکم روودەدات و تەواوی ژیانم گۆڕانی بەسەردادێت، ئەو دەنگەی لەناخمەوە دێت دەنگێکی زۆر سەیرە لە دەنگی نوزانەوەی کوڕێکی هەژار و بێچارە دەچێت، دەنگێك لەگەڵ گریان ئاه و نوزانەوەی زۆری لەگەڵەدێت ئاهێك کە تەبەقی

یەکەمی ئاسمانی پڕکردووە لە نوزانەوە و پاڕانەوەکەیدا هەست بە زووڵمێکی زۆر دەکەم لێی کرابێت.

لەگەڵ ئەوەدا کردنەوەی قوتووەکە بۆم وەك خەونێکی لێهاتووە بەحەسرەتەوە چاوەڕێی بینینی کۆتاییەکەی دەکەم، بۆیە دەستم بەشکاندنی قوتووەکە کرد و بەهۆی بەهێزی قوفلەکەی دوایی ماندوو بوونێکی زۆر و ماوەیەکی زۆر توانیم بیشکێنم.

دوایی شکاندنی قوفلەکە بۆکاتێکی زۆر جورئەتی ئەوەم نەبوو سەری قوتووەکە هەڵبدەمەوە و سەیری ناوەوی قوتووەکە بکەم، هەر بۆیە بۆساتێکی زۆر لە دووری قوتووەکە دانیشتم و بەتامەزرۆییەوە سەیری وێنەی کوڕ و کچەکەی سەر قوتووەکەم دەرکرد.

دمگووت بەڕاستی سەیرە ئەوانە بەلای من هیچ لە بێگانە ناچن وەك بڵێت پێشتر لە شوێنێك ئەوانەم بینیوە، تۆبڵێت خەوم بەوانەوە نەبینیبێت...لەلایەکی تریش زۆر دەترسم سەیری ناو قوتووەکە بکەم نەبادا شتێکی زیان بەخشی تیادا بێت.

دوایی بەڕێکردنی ماوەیەك بەو جۆرە بیرکردنەوە و خەیاڵانە سەری قوتووەکەم هەڵدایەوە و سەیری ناوەوەی قوتووەکەم کرد جگە لە پارچە شتێك کە بەشێوازێکی زۆر باش پێچرابوویەوە هیچی تری تیادا نەبوو.

لەوکاتەوە ئەی خوادایە من لەچی دەترسم خۆ ئەم قوتووە هیچی تیادا نیە؟!،ئەی نهێنی ئەو قوتووە لەچی دایە ماوەیەکی باشە مێشکی منی پێوە سەرقاڵ بووە؟!.

دوایی ئەوە هێواش هێواش بەدڵێکی زۆر سارد دەستم بە هەڵکڕاندنی پارچە شتەکە کرد، بەڵام لە کۆتایی چیم بینی جگە لە کتێبێك و چەندین وێنە زیاتر هیچی ترم تیادا نەبینی سەرنجم بۆلای خۆی رابکێشێت، لەوساتەدا نهێنی قوتووەکەم لەلا بووە شتێکی ئاسایی تا ئەو کاتەی سەیری وێنەکانم کرد، تەنها وێنەی کوڕ و کچەکەی سەرقوتووەکە

لەگەڵ وێنەی چەند نامەیەکم بینی، کەدیاربوو وێنەی ئەو نامانە بوو کە بەفەیسبووك لە نێوان دووکەس نێردرابوو.

دوایی خوێندنەوەی نامەکان هیچ لەو نامانە تێنەگەیشتم، تەنها ئەوە نەبێت پێدەچوو لە نێوان کوڕ و کچێك ئاڵوگۆڕکرابوو، سەیری یەکە بەیەکەی وێنەکانم دەرکرد کە تیایدا زۆر قسەی خۆش و شاهانەی خۆشەویستی لە نێوانیاندا باسکرابوو، بەڕاستی زۆر لە نامەکانی نێوان من و ئۆندەر دەچوو، لەو کاتەدا هەموو ئەو شتانەم بیردەکەوتەوە لەگەڵ ئۆندەردا باسم کردبوو.

بۆم بەدیارکەوت خۆشەویستی هەر خۆشەویستیە چ لەنێوان دەوڵەمەند و هەژاربێت چ لە سەردەمی کۆن بوو بێت چ لەو سەردەمەدا بێت چ لەداهاتوودا بێت، تەنها ئەوەیە خۆشەویست لە سەر رووی زەوی بوونی هەیە و هەموو خۆشەویست و عاشق بوونێکیش یەك جۆرە، هیچ جیاوازییەك لە نێوان عاشق بووەکاندا نیە.

دوایی ئەوە وەك بڵێت بە دوو دەست زۆر بەبەهێزی دڵم دەگووشن هێندە دڵتەنگ و بێزاربووم فرمێسك و گریانی بەکوڵ بەری چاوەکانمی داگرت، بەهۆی فرمێسکەکانمەوە نەمدەتوانی بەجوانی وێنەکانی تر ببینم، کەچی لەهەمان کاتدا خۆم بەخۆمم دەگووت کەسێکی رووت و برسی چۆن دەتوانێت دڵخۆشم بکات، لەبەر ئەوە هەرکە ئۆندەرم بەبیردەهاتەوە ئەو قسانەی دایکم دەهێنایەوە گوێم، ئەگەرچی بێتاقەت دەبم بەڵام قسەکانی دایکیشم ڕاستە.

فرمێسکەکانی چاوم سڕییەوە و بەردەوام بووم لە سەیرکردنی وێنەکانی تر، بەڕاستی قسە گەلێك لەنێوانیاندا کراوە هەزار خۆزگە بەژیانی ئەوان دەخوازم، لەگەڵ سەیرکردنی هەر وێنەیەك دەڵێم خۆزگەم بەو دڵە خۆشەیان کە هەیانبووە، خۆزگە من لە شوێنی ئەوان بوومایە، قسەکانی نێوانیان زۆر خۆش و سەرنج راکیشە و پڕییەتی لە عیشق و خۆشەویستی تەنانەت منیش بە خوێندنەوەی نامەکانی ئەوان دڵ خۆش دەبم، لەگەڵ

هەڵدانەوەی هەر وێنەیەك و خوێندنەوەی نامەکان هەزار خۆزگەم بەدڵی ئەو دوو عاشقە دەخواست، لەبەر خۆمەوە دەمگووت ئەو قوتووە دەبێت هی چ کاتێك بێت، لەوانەیە ئەو دوو عاشقە ژیانێکی زۆر خۆشیان بەیەکەوە بەسەر بردبێت، دڵنیام لەوەی ئەگەر یەکێکیان زووتر مردبێت ئەوەی تریش بەرگەی نەگرتووە و لە داخی ئەودا ئەویش مردووە.

گەرچی ناوە بەناوە دەچمە نێو ئەو خەیاڵانە و خۆم و سەیرکردنی وێنەکانیشم لەبیردەچێتەوە، بەڵام دەمەوێت هەرچۆنێك بێت بەسەر هەستەکانی خۆمدا زاڵبم و هەموو وێنەکانیش بە جوانی ببینم هیچی تر ووتە جوان و رازاوەکانی نێو وێنەکان خەیاڵم نەبات.

بەهێواشی بەنێو دوونیای وێنەکان گوزەرم دەکرد و گەیشتمە کۆتا وێنەکان، کەسەیرمکرد نامەیەك لە کوڕەکەوە بۆ کچەکە نێردرابوو تیایدا نووسرابوو(من تۆم بەڕاستی خۆش دەوێت، لێت دەپاڕێمەوە تەنها قسەم لەگەڵ بکە بەبێ تۆ ناتوانم بژێم، دۆریە ژیان دەگوزەرێنم بەلأم ژیانێکی وەکو مردوو بەسەر دەبەم و هەموو رۆژێك لە نێو دەریای خەمدا مەلەدەکەم، شەپۆلەکانی دەریای خەم بەرەوە کەنارەکانی مەرگم دەبەن، کەچی هەرگیز ناهێڵێت بە ئاسوودەیی بگەمە کەناری مەرگ و مردنێکی ئارام بمرم، تاوەکو فریشتەی گیان کێشان دەگاتە سەرم و رۆح لە جەستەم دەردەکات لە رۆژێکدا سەدجار خەو بە مەرگەوە دەبینم، دەردێکم تووش دەبێت لەکاتی عیبادەتەکانیشم تۆم بەو دەردەوە دێتەوە خەیاڵ...).

سەیرم کرد نامەیەکی زۆر دوورو درێژە لەلایەن کوڕەکەوە نێردراوە، بەڵام لە کۆتا نامە کچەکە نووسرابوو تۆ دەڵێ لە زمان تێناگەیت وەڵامی خۆتت وەرگرت، هیچی تر نەهەوڵبدە پێوەندیم پێوە بکەیت نە هەوڵیش بدە نامە بنێریت، ئیتر بۆ هەمیشەماڵئاوا بۆ خۆت بەدوایی کەسێکی تردا بگەڕێ.

من فێری ئەوە بووم لەژیاندا بەهیچ سەرەتایەکی خۆش و جوان هەڵنەخەڵەتێم و باوەڕنەکەم، لەبەرئەوەی لە دوایی هەموو سەرەتایەکی خۆش و جوان خەمێکی ناخۆش و گەورە وەستاوە و وەك ئەژدیها چاوەڕێی ئێمە دەکات.

لەوکاتەدا هەستێکی زۆر ناخۆشم بۆ دروست بوو، ئەوەی زیاتر مەرەقم کرد لێی ئەوە بوو، بۆچی ئەو کورە و ئەو کچە دوایی ئەو هەموو خۆشەویستیە لە یەکتر جیابوونەتەوە، خۆ من هیچ شتێکم دەربارەی هۆکاری جیابونەوەیان نەزانی، بۆیە جارێکی تر زۆر بەجوانی سەیری ناوەوەی قوتووەکەم کردەوەی بۆئەوەی شتێکم دەربارەی ئەو دوو کەسە دەست بکەوێت، کەچی هەرچەندە قوتووەکەم ئاودیو و ئەودیوو کرد هیچ شتێکی ئەو تۆم دەست نەکەوت تەنها کتێبەکە مابوو... لەخەیاڵی خۆم دەمگووت باوەڕناکەم هیچ پێوەندییەکی بە باسی ژیانی ئەو دووکەسەوە هەبێت.

وادیاربوو ئەو کتێبە لەلایەن خاوەنی قوتووەکە زۆر بەنرخ بووە، لەبەرئەوەی جگە بەجوانتر و باشتر لە وێنەکان پێچرابوویەوە بە خزمەتێکی زۆریشەوە پێدەچێت هەڵگیردرابێت.

هەر لەگەڵ سەیرکردنی بەرگی کتێبەکە زۆر سەرسام بەناونیشانەکەی کە نوسرابوو(رۆمانی ئافرەت لە نێوان فریشتە بوون و شەیتان بووندا)، پێدەچێت نوسینی سەر بەرگی کتێبەکە بە خوێن نووسرابێت.

بەڕاستی ناونیشانی کتێبەکە زۆر بەلامەوە سەرنج راکێش بوو، بۆیە خولیای خوێندنەوەی تەواوی کتێبەکەم دەرکرد و لەگەڵ بینینی ناونیشانەکەی خەیاڵی ئەو کوڕ و کچەم بەهیچ شێوەیەك لەبیرنەما.

لەسەرو بەینی دەستکردنم بە خوێندنەوەی کتێبەکە دایکم بەدەنگێکی بەرز بانگی منی کرد، بەهاوارکردنەکەی دایکم زۆر ترسام وەمزانی لەدەرەوە رووداوێك روویداوە، بۆیە

هەر لەژوورەکەی خۆمدا تاسام و توانای هەڵسانەوەم نەما لە شوێنی خۆم گووتم بەڵی دایکە چیت دەوێت؟.

گووتی کچم کات زۆر درەنگی کردووە، وەرە لەگەڵ ئێمە نانی ئێوارەت بخۆ، ئەگەر تواناشت نیە من خۆم بۆت دەیهێنمە ژووەرەکەت.

منیش بۆ ئەوەی نەێتە ژوورەکەم و قوتووەکە و وێنەکان ببینێت، گووتم دایە گیان من خۆم دێم تۆ بۆمی مەهێنە.

دوایی ئەوە خۆم ئامادەکرد و چووم نانی ئێوارەیان لەگەڵ بخۆم، بەڵام ئەوەی راستی بێت نە تام لەنان خواردنەکە دەکەم نە بەئارامیش نانەکەم دەخۆم، لەبەرئەوەی هەر خەیاڵم لەلای خوێندنەوەی پەرتووکەکەبوو.

بەڕاستی ناوی رۆمانەکە زۆر بەلامەوە سەرنج راکێش بوو، جار جاریش مەرەقی ئەوەم دەکرد بزانم پەیوەندی راستە قینەی نێوان ئەو کوڕ و کچە چیە، تۆ بڵێت ئەو دوو وێنەی سەر قوتووەکە هەمان ئەو کوڕ و کچە بن کە نامەکانیان لە نێوانیان ئاڵوگۆڕکراوە؟، ئەوانە هەموو پرسیار و نهێنی قوتووەکە بوون تاوەکو ئێستا بۆم ئاشکرانەبووە و مێشکمی بە خۆیەوە سەرقاڵکردووە.

لەسەر سفرەی نان خواردن بەردەوام لەبەر خۆمەوە دەمگوت ئەونامانە دەبێت چی بن؟ئەو کتێبە دەبێت چی بێت؟.

دایکم گووتی کچە شیرنەکەم ئەوە چیتە هەر لەبەر خۆتەوە قسە دەکەیت و نانەکەت بە جوانی بۆناخۆریت، هیچ کێشەیەکت هەیە پێم بڵێ با منیش ئاگاداربم.

هیچ نیە دایکە تەنها کەمێك بیرم سەرقاڵە هیچی تر نیە شایەنی باسکردن بێت.

زۆرباشه کچه جوانەکەم بەڕاست ئەمڕۆ بۆ ماسی گرتن چوویت، هیچ ماسیت راونەکردووە تۆ لە ماسی راوکردنا زۆر چالاکیت، هیچ کاتێك تۆم نەبینیوە بەبێ ماسی هاتبێتیەوە، چۆن بوو ئەمجارە هیچت نەگرتووە؟.

نەخێر دایکە ئەمڕۆ بەهۆی خراپی کەش و هەوا و بوونی بایەکی بەهێز نەمتوانیوە هیچ ماسییەك بگرم، ئەمڕۆ ئاوی رووبارەکە بە جۆرێك خێرا دەرۆیشت وەك بڵێیت زۆر رقی لەمن دەبێتەوە.

کچم بیر لەو جۆرە شتانە مەکەوە ئیتر ئەوە کەش و هەوایە رۆژێك خۆش دەبێت رۆژێکیش ناخۆش ئەوە نە لەبەر تۆیە نە لەدەست ئێمەشدایە.

زۆر راستە دایکە گیان دوایی ئەو دووبارە دەست بەبیرکردنەوە کردەوە و بیرم بۆ هەزار لا دەچوو، دەمگووت بێ هیچ شك و گوومانێك پێشتر ئەو دوو کەسەم بینیوە، بۆیە زیاتر قەلەق دەبووم و لەسەر سفرەی نان خواردن بەو جۆرە بیرکردنەوانە سەرقاڵ بووم، جیاواز لە جاران هیچ قسەیەکم لەگەڵ دایك و باوکمدا نەدەکرد.

بە بێئاگایی خۆم لەوکاتەدا هەستم بەوە نەکردبوو دایکم زۆر لەمن راماوە و هەستی بەو بیرکردنەوە قولاًنەی من کردووە و بەهۆی بیرسەرقاڵیمەوەیە جیاواز لەجاران لەگەڵ ئەواندا هیچ نادوێم.

دوایی ئەوەی باوکم بەخێرایی نانەکەی خوارد و هەڵسا چووە ژوورەکەی تر و سەیری تەلەفزیۆنی دەکرد.

لەوکاتەدا دایکم هاتە تەکم و گووتی کچم پێم بڵێ بیرلەچی دەکەیتەوە؟.

هەرچەندە ووتم هیچ نیە هیچ شتێکیش رووی نەداوە... بەلاًم باوەڕی بەمن نەکرد، ووتی دەزانم تاوەکو ئێستا بیر لەو کوڕە بێ جلە دەکەیتەوە، دەتەوێ ژیانی خۆت بە

قوربانی کەسێك بکەیت کە هیچ هەست و سۆزی بۆ تۆ نیە، کچم ئەو تەنها چاوی لەماڵ و سامانەکەی تۆیە.

لەوکاتەدا ئەوەم بیرکەوتەوە هەمووجارێك دەمگووت ئۆندەر پارەت پێدەدەم دەبڕۆ کۆمەڵێك جلی جوان بۆ خۆت بکڕە، دەیووت ئاریانەگیان راستە من جلی جوان لەبەر ناکەم پارەم نیە جلی جوان بکڕم، بەڵام تۆ لە هۆکارەکەی نازانیت با من پێت بڵێم، من دڵێکی پاکم هەیە بۆچی دەبێت ئەو دڵە پاکەم بە جل و بەرگی گرانبەها بشارمەوە پاڵتۆی جوانم بۆ چیە کە لەژێریدا دڵم بۆ گەن بێت، ئەوە بزانە تەنها ئەو کەسانەی دڵ پیس و بۆگەنن جلی گرانبەها لەبەر دەکەن و بۆنی خۆش لە خۆیان دەدەن تەنها بۆ ئەوەی دڵە بۆگەنەکەیان بشارنەوە و کەس هەستیان پێنەکات، بەڵام من یەك پرسیارم بۆ دروست بووە نازانم بۆچی هیچ کەسێك هەست بە بۆنی بۆگەنی دڵی دەوڵەمەندەکان ناکات؟.

ئاریانەگیان لەوەدا بزانە دوونیا ئەوەی نیشانت دەدات راست نیە، تەنها رووی دەرەوەت نیشاندەدا، بەڵام خودی مرۆڤ وایە تەنها رووکاری دەرەوەی شتەکانیان لەلا جوانە ئەگەرچی ناوەوەی بۆگەن و بێ کەڵکیش بێت.

دوایی ئەوەی دەمویست بۆ ژوورەکەی خۆم بگەڕێمەوە دایکم گووتی باروودۆخت پێناچێت زۆر باش بێت بووەستە تاوەکو ئیشەکان تەواو دەبن دواتر هەندێك قسەدەکەین، ئەوەش بزانە قسەکانی من بۆ تۆ هەمووی لە ئامۆژگاری زیاتر بۆ تۆ هیچی تر نیە.

لەوکاتەدا منیش دڵم بۆ خوێندنەوەی کتێبەکە وەك ئاوی سەر ئاگر هەڵدەپڕوکا، لەبەر دڵی دایکم گووتم زۆرباشە دەوەستم گوێ بۆ قسە و ئامۆژگارییەکانت دەگرم.

دوایی ئەوەی ئیشەکانمان تەواو کرد و قاپەکانمان شوشت و مێزەکەمان خاوێن کردەوە، بەناچاری لەگەڵ دایکم دانیشتم تاوەکو قسەکانی بۆم بکات، لەدڵی خۆم دەمگوت نازانم بۆچی ئەمڕۆ زیاتر لە رۆژانی تر دڵتەنگم، ئەو رۆژانەشم بیردەکەوێتەوە کە

لەگەڵ ئۆندەر دڵخۆش بووم و قسەم لەگەڵی دەکرد، پێم وایە ئەو بیرکردنەوانەم هەمووی بۆ هۆی ئەو قوتووە دەگەڕێتەوە.

نازانم بۆچی هەر لەخۆمەوە هەست بەوە نیهێنی ئەو نامانە و ئەو وێنەنانەی سەر قوتووەکە زۆر لە چیرۆکەکەی من ئۆندەر دەچێت؟، هەر لەخۆمەوە خورپەی دڵم دایگرتووم و دڵم بە خێراییەکی زۆر لێدەدات، تەنانەت دایکیشم هەستی بەرووخساری خەمبارم کردووە، لەبەر بێتاقەتی زۆرم وەك شێتێك رەفتاردەکەم و هەرچۆنێك بێت دەمەوێت وەك مرۆڤێکی ئاسایی ئارامم ببێتەوە، کەچی دەست بۆ هەرچییەك دەبەم ئامارام ناکاتەوە و هەر کارێك دەکەم خۆم لەبیر ناکەم.

بەجۆرێك دڵتەنگییەکەم تەنگی پێ هەڵچریووم هەر ئەو کات دەمویست نامە بۆ ئۆندەر بنێرم، بەڵکو بە گوێ لەدەنگ بوونی ئەو دڵەی دێوانەم کەمێك ئارام ببێتەوە، بەڵام سەیرمکرد ئۆندەر ماوەیەکی زۆرە لە فەیس بووك ئەکتیف نەبووە، لەلایەکی تر دایکم هێندە بەخراپی لەلام باسی ئەو کوڕەی بۆ کردبووم وەك ئاژەڵێکی دڕندە دەهاتە بەرچاوم، لەبەر ئەوە بەهەرجۆرێك بوو دانم بەخۆم داگرت و پێوەندیم پێوە نەکرد.

لەنێو ئەو خەیاڵانەدابووم پێوەندی بە ئۆندەر بکەم یاخود نەکەم دایکم گووتی کچی شیرینم دیسان بیرت بۆ کوێ رۆیشت، کچم من دەزانم تۆ بۆچی دڵ تەنگیت پێویست ناکات لێمی بشاریتەوە، دڵ تەنگی تۆ هەمووی بۆ ئەو کوڕەیە، بەڕاستی ئەو کوڕە ناتوانێت ژیانێکی خۆش و بەختەوەر بۆ تۆ دروست بکات، تۆ تالەژیاندا ماویت دەبێت لەو خانووە کۆنەدا ژیان بەسەر ببەیت و خزمەتی باوکە پیرەکە و خوشکە بچوکەکەی بکەیت.

سەیرکە تۆ دەڵێت ئەو کوڕە منی خۆش دەوێت کەچی لەو کاتەی گووتووتە وازم لێبهێنە تەنها یەك نامەشی بۆت نەناردووە، هەروەك بڵێت ئەو هەرگیز تۆی نەناسیوە دڵنیابە ئێستا ئەو بەدوایی ژیانی خۆیەوەتی و هیچ بیرێکی لەلای تۆ نیە، تۆش بەبێ هودە لێرە خۆت بۆ کەسێکی لەو جۆرە رووت و قووت و پێ خواسە پەرێشان کردووە.

کچی شیرینم تۆش کەمێك عەقلت بهێنەوە سەرە خۆت کەسی زۆر لەوە باشتر شایەنی تۆیە، بائەویش بچێت کچێکی وەك خۆی رووت و برسی بهێنێت، تۆش دڵی خۆت خۆش بکە و وادابنێ ئەو لەژیانتدا هەر بوونی نەبووە.

ئەوکات لەدڵی خۆم دەمگووت من هێندە پەلەی خوێندنەوەی ئەو کتێبەم هەیە ئەویش بە ئامۆژگارییە لە سەرخۆ و نەبڕاوەکانی رێگەی نەدەدام بچمەوە ژوورەکەی خۆم، هەر قسەیەکی دەرکرد دەمگووت راست دەکەیت دایکە گیان هەموو قسەکانت لە گوێ دەرگرم، ئەوەم بۆ ئەوە بوو خێرا قسەکانی تەواو بکات و بگەڕێمەوە ژوورەکەی خۆم و کتێبەکە تەواو بخوێنمەوە.

بەڕاستی ئەو کتێبە وەك جادوویەك و سحرێك وابوو بۆم هەستی منی بەتەواوەتی بۆ لای خۆیدا راکێشابوو، زیاتر سەرنجم بۆ ئەوە دەچوو دەبێت چ رووداو گەلێك و باس و خواستێکی شاراوە لە نێو ئەو کتێبەدا نووسرابێت، تەنانەت من و تەواوی خەڵکیش لەسەر رووی زەوی لەو رووداوانەو باس و خواستانە لێی بێ خەبەرین، کتێبێکی جادوییە هەرلەگەڵ خوێندنەوەی ناوەکەی زۆر بەتامەزرۆییەوە خولیای خوێندنەوەیم کرد.

دایکم بەردەوام بوو لە ئامۆژگارییە نەبڕاوەکانی منیش بەجەستە لەلای ئەو و رۆح و گیانم و خەیاڵم لەلای کتێبەکە بوو، هەردەقەو جارێك بیر و خەیاڵێکی نوێم لەلا دروست دەبوو، ئەمجارە خەیاڵی ئەوەم دەکرد تۆبڵێت ئەو کتێبە باس وخواستی ئەو دوو کەسەی تیادا بێت؟، یاخود باسی چ شتێکی ترە کە جیهان لێی بێ خەبەرە.

لەگەڵ ئەوەی خۆم زۆر خولیای خوێندنەوەی رۆمانم هەیە، بەڵام تاوەکو ئێستا هیچ رۆمانێکم بەو ناوە بەرچاو نەکەوتووە، چۆن تاوەکو ئێستا من ئەو رۆمانەم لە بازاردا نەبینیوە، یاخود ئەو رۆمانە زۆر کۆنە و لە بازاردا نەماوە؟.

دوایی ئەوە هەرچۆنێك بێت دایکم ئامۆژگاری و قسەکانی خۆی تەواوکرد و منیش بە هەڵەداوان خۆم گەیاندەوە ژوورەکەم و دەرگای ژوورەکەم لەسەر خۆم داخست، هەموو

رووناکییەکانی ژوورەکەم کوژاندەوە و گڵۆپی سەر مێزی کتێب خوێندنەوەکەم داگیرساند.

زۆر بەدیقەتەوە کتێبەکەم هەڵگرت و لەسەر مێزەکەم دانا، بەشێوەیەکی زۆر پیرۆز سەیری کتێبەکەم دەکرد و گرنگیەکی زۆری لەلای من هەبوو، بەلأم ترس و دوودڵیەکی زۆرم بۆ خوێندنەوەی کتێبەکە هەبوو، دەمگووت هەرچۆنێك بێت دەبێت ئەو کتێبە بخوێنمەوە و دەستی لێ هەڵنەگرم.

لەدوایی هەڵدانەوەی بەرگی کتێبەکە زۆر بەپەرۆشییەوە دەستم بە خوێندنەوەی پەڕی یەکەم کرد و نووسرابوو:

ئەو رۆمانە باسی ژیانی کەسێکە کە هەموو کەند و کۆسپەکانی ژیانی بەدەردەسەری و هەژاری بڕی بۆ ئەوەی بگات بەخۆشی، بەلأم کە گەیشتە کۆتایی ژیان بۆی دەرکەوت لە ژیاندا شتێك نیە بەناوی خۆشی، ئەوەی لە چارەنووسی ئەودا نووسراوە تەنها دڵتەنگیە و لەوە زیاتر هیچی تر بوونی نیە لە ژیاندا، لەگەڵ ئەوەی کەوتە جەنگ کردن لەگەڵ ژیان، بەلأم لەکۆتایی بۆیی دەرکەوت ژیان درۆیەکی گەورەیە.

ئیتر لە هەرشتێکدا درۆ هەبێت شتێکی تیادا نامێنێت کە ناوی خۆشی بێت، لەبەر ئەوەی ئەو خۆشییەی کە ژیان پێشت دەدات بزانە ئەویشی هەر بەدرۆ پێداویت، لە ژیاندا هەرچەندە بەسەر درۆکاندا سەربکەویت ئەوا دەبێت خۆت بۆ درۆیەکی گەورەتر ئامادەبکەیت، بۆیە وەسیەت بێت هەرگیز لەگەڵ ژیاندا مەجەنگن، لەبەر ئەوەی لە کۆتایدا هەر ئەو سەردەکەوێت.

ئەو کەسەی پێیوایە لەجەنگکردن لەگەڵ ژیان سەرکەوتوو بووە ئەوا ئەوکات ژیان گەورەترین درۆی خۆی نیشاندەدات کە ئەویش مردنە، بۆیە لەگەڵ ژیان بڕۆ هەروەك چۆن ئەو دەیەوێت، ژیانێك بۆ خۆت بژی هەروەك چۆن ئەو پێی خۆشە، لەبەر ئەوەی لە ڕووبەڕووبونەوەت لەگەڵیدا بۆت دەردەکەوێت هیچ شتێك نیە بەناوی سەرکەوتن، بەڵکو

لە کۆتایی خاڵدا لەبری سەرکەوتن کەوتن هەیە دەکەویتە چاڵی کۆتاییت کە گۆڕەکەتە، خاڵی کۆتایی ژیان وەستان و مردنە.

ئەوەی راستی بێت زۆر گەڕام لەدوونیا درۆزنترم نەبینی ئەو کەسەی شایەنی شتێکە پێی نابەخشێت ئەوەی شایەنی نیە پێدەبەخشێت، دوونیا زۆر نەزان بەسەرمانەوە دەکاتە زانا، زۆر زاناش لەبەر نەخۆشی و ناخۆشی و هەژاری دەکاتە نەزان.

دوونیا زۆر خەونی جوانمان نیشاندەدات بەلاّم تەنها خەونە ناخۆش و ترسناکەکانمان بەڕاستی دەهێنێتە دی.

دوونیا رووی زۆر مرۆڤمان نیشاندەدات کە وەك شەیتانن، بەلاّم دوونیا ئەوانی کردۆتە مرۆڤ و بگرە لە مرۆڤیش بەرزتر بوونەتە فریشتە.

ئیتر رۆژانە من لەگەڵ ئەو هەموو درۆیە دەجەنگم، ئەگەر من بەشکاوی دەبینیت وامەزانە لە بێدەسەلاتی من بووە، بەڵکو دوونیا درۆیەکانی زۆر بەهێزن بۆیە توانایی بەرەنگاربوونەوەیم نەماوە و شکستم خواردووە.

بەڕاستی کاتێك چاوم بەو ووتەسەرسوڕهێنانە کەوت لە ناخەوە زۆر ئازارم چێشت، بیرمکردەوە تۆبڵێیت تاوەکو ئێستا ئەوەی بەدەستم هێناوە بۆ من شکست بێت، لەبەر ئەوەی ئەو نووسەرە پێی وایە تۆ هەرچەندە بڕوانامەی بەرز بەدەست دەهێنیت و دەوڵەمەند دەبیت، بەلاّم ئەوانە هیچ کاتێك بۆ تۆ سەرکەوتن نین، لەبەر ئەوەی کاتێك ئەوانە بەدەست دەهێنیت هەست دەکەیت تەمەنێکی زۆرت لەدەست داوە و لە کۆتایدا بەبێ ئەوەی ئاگادار بیت و هەستی پێبکەیت دەکەویت.

هەرلەو کاتەدا لەگەڵ خوێندنەوەی یەکەم پەڕی کتێبەکە و بیرکردنەوەم لە ووتەکانی نووسەری کتێبەکە بووەهۆی ئەوەی ژیانی خۆمم لەبەرچاو بکەوێت، لەدڵی خۆم دەمگووت تۆبڵێیت ووتەکانی ئەو نووسەرە راست بێت؟،تۆبڵێیت تاکو ئێستاشی لەگەڵ

دابێت من لەشکستدا بژیم، لەبەر ئەوەی من خۆم وەك کەسێکی زۆر سەرکەوتوو دەهاتە بەرچاو، چونکو هەموو قۆناغەکانی خوێندنم بەسەرکەوتووی بڕیوە و لە هەموو قۆناغەکانیش پلەی نایابم هەبووە.

ئەوەی سەیر بوو لەلای من ئەو رۆمانە ناوی هیچ نووسەرێکی لەسەر نیە، دەمگووت چۆن دەبێت ووتەگەلێکی لەو شێوە جوانە کەسێ نەبێت خۆی بەخاوەنی بزانێت؟، هەرلەبەر ئەوە زۆر زیاتر بەتاسەوە بووم بۆ خوێندنەوەی تەواوی رۆمانەکە و تێگەیشتن و ئاشکرابوونی نهێنیەکانی ئەو پەرتووکە.

نازانم بۆچی لەگەڵ خوێندنەوەی هەر دێرێکی ئەو رۆمانە بیرو خەیاڵم لەلای خۆم نامێنێت و دەڕوات بۆ جیهانێك کە پڕیەتی لە ئازار و ئەشکەنجە و مەینەتی، زۆر پەرۆش بوو بۆ خوێندنەوەی کۆتا پەڕی رۆمانەکە.

بەهۆی زۆر بیرکردنەوەم و خەیاڵەکانم بۆ ماوەیەکی درێژ نەمتوانی تەنانەت یەکەم پەڕی رۆمانەکە بخوێنمەوە...هەر لەیەکەم پەڕدا نووسرابوو:

تۆ لە ژیانی خۆتدا چیت پێباشە هەر ئەوە هەڵبژێرە، ووتەی هیچ کەسێك لە ژیانتدا مەکە پێشەواو بەرچاو روونی خۆت، لەبەر ئەوەی هیچ کەسێك لە ناخی تۆدا ناژێت، تاوەکو لە ئازارەکانی ناخی تۆش تێبگات،هیچ کەسێکیش لەژیان بەدی ناکەی کێشەکانت بۆ چارەسەربکات و لەکاتی کێشەکانت لەگەڵتدا بێت، تەنانەت دایك و باوکیشت تائەو کاتە لەگەڵت دەبن کە توانایانا هەیە دوایی ئەوە ئەوانیش تەنیات دەکەن، هەروەها هیچ کەسێکیش جورئەتی ئەوەی نیە کێشەت بۆ دروست بکات ئەگەر دەستی خۆتی تیادا نەبێت، لەبەر ئەوە لە ژیاندا هەرکێشەیەکت رووبەڕوو دەبێتەوە ئەوە بزانە هۆکارەکەی تەنها خۆتی.

ئیتر سروشتی مرۆڤیش وایە لەگەڵ ئەوەی خۆی بۆ خۆی کێشە دروست دەکات، بەلاّم پەنا بۆ کەسانی دەرووبەر دەبات تا بۆی چارەسەر بکەن، ئەوا تێبگە تۆ لەو کارەتدا

هەڵەیت، لەبەر ئەوەی جگە لەخودی خۆت کە خۆت بۆ خۆت کێشەت دروستکردووە هیچ کەسێکی تر ناتوانێ بۆتی چارەسەر بکات.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا بزانە راوێژبکە بەڵام بەقسەی هیچ کەسێکیش هەڵمەخەڵەتێ تەنانەت دایك و باوکیشت، راستە ئەوان تەنها سوودی تۆیان دەوێت بەڵام ئەوان هەرگیز لە کێشەکانی ناخی تۆ تێناگەن و هەست و ناخ تەنها تایبەتە بەیەك کەس تەنها یەك کەسیش بۆی هەیە پاسۆردی چوونە ژوورەوەی بزانێت ئەو کەسەش تەنها خودی خۆتی، فێربە پاسۆردی ناخت بەهیچ کەسێك نەدەیت...لەبەر ئەوەی ئەو کەسە بەدڵی خۆی دەتوانێت یاری بەهەست و ناخت و بوونتەوە بکات.

من لەدوایی دایکم کە پاسۆردی ناخی خۆم بە خۆشەویستەکەم سەناریادا بەجۆرێك یاری پێکردم دوونیام لە بەرچاو بوو بە زاخاوی خوێن، تەنانەت ئێستا لەکاتی نووسینی ئەو رۆمانە خودی خۆم وەك دوژمنی خۆم دێتە بەرچاو.

خۆشەویستی ئەگەر بەڕاستی تۆزێك مانای هەبووایە ئەوا لە فەرهەنگی ووشەکاندا شتێك بەناوی دابڕان بوونی نەدەبوو، لەبەر ئەوەی لەکۆتایدا بێگومان یەکێکیان ئاگری خیانە لەدڵەوە دایدەگرێت و ئەوەی تریش لەگەڵ خۆی دەسوتێنێ.

لەگەڵ ئەوەشدا تۆ زۆرجار کێشەکانت بە کەسانی تر دەدەیت بۆت چارەسەر بکەن، ئەگەرچی ئەوان رەنگە هەوڵت بۆ بدەن و لەخەیاڵی خۆیاندا وا دادەنێن بۆتیان چارەسەرکردووە، ئەوا بزانە لەناخی تۆدا دەبێتە ئاهێکی گەورە تاوەکو لەژیاندا ماویت پێوەی دەناڵێنیت.

هەرگیز لەژیانیشتدا لەبەرامبەی گەورەترین کێشەکانت رق هەڵمەگرە، هەرچەندە تۆ لەبەرامبەر کێشەکانت رق ئەستور بیت،ئەوا کێشەکانیشت زیاتر و زیاتر ئازارت دەدەن و تۆڵەت لێدەسێنەوە.

دوایی خوێندنەوەی ئەو دێرانە زۆر سەرم سوڕما ئەو کتێبە هەروەك بڵێت لەگەڵ من قسەدەکات، تەنانەت وا گومانم بۆی دەچوو ئەو نووسەرە حاڵی منی بینیوە و دەستی بەنووسینی ئەو رۆمانە کردووە و سەبارەت بەژیانی من نووسیویەتی.

ئیتر منیش لەتاریکی ژوورەکەم و خوێندنەوەی رۆمانەکە هێواش هێواش ترس ولەرزێکی زۆر دایدەگرتم، ئەوە لەلایەك لەلایەکی تر دەنگی گەوارەی هەورەکان و باران بارینی بەلێزمە و چۆڵی دەورووبەری ڤێلاکەمان ترس و لەرزەکەمی زیاتر کردبوو، لەگەڵ ئەوەی ئەم ساڵ زستانەکەی زۆر ساردە بەتایبەتی لەو ناوچەی ڤێلاکەی ئێمەی لێە کە ناوچەیەکی زۆر ساردە، کەچی بەهۆی ترس و لەرزەکەمەوە گەرووم زۆر زوو زوو ووشك دەبێت و ناچار تاو نا تاوێك ئاو دەخۆمەوە، نازانم بۆچی هێندە تێنووم دەبێت؟، وەك بڵێت لە بیابانێکدام و تینی گەرمی خۆر زۆری بۆ هێناوم.

لەڕاستدا گەرچی رۆمانەکەم زۆر نەخوێندۆتەوە، بەهۆی زۆر بیرکردنەوەکانم ئەو شەوە نەمزانی چۆن ئەوە کاتە زۆرەم بەڕێکردووە، شەو لە نیوەی لایداوە و خەریکە بانگی بەیانی دەخوێنێت.

دڵنیام ئەو شەوە ئەوەی زیاتر بیری من سەرقاڵ دەکات سەنارییایە ئەو کچە دەبێ چی بەو نووسەرە کردبێت هێندە دڵ پڕە لێی، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا من نەمزانیوە نووسەری ئەو پەرتووکە کێیە، زۆر حەزمدەکرد ئەو کات بزانم، بەڵام کات زۆر درەنگی کردووە و پێویستم بەوە هەیە کەمێك بخەوم.

ئیتر گڵۆپی سەر مێزەکەم کوژاندەوە و لەسەر سەرینەکەم پاڵکەوتم و هەر بیرم لە نووسەری کتێبەکە دەکردەوە.

دەبێت ئەو نووسەرە کێ بێت و ناوی چی بێت؟، ئەی سەناریا کێیە؟.

دیارە ئەو نووسەرە بەدەستی ئەوەوە تووشی گرفتاری و دەردەسەرییەکی زۆر بووە، بەدەم ئەو خەیالانەوە خەو منی بردەوە و  خەوم لێکەوت، لەبەیانیەکەدا کاتێك خەبەرم بوویەوە گوێم لێبوو دایکم بەدەنگێکی بەرز بانگم دەکات کچم هەڵسە لەخەو کات زۆر درەنگی کردووە، خێرا هەڵسە سەیربکە ئەمشەو بەفرێکی زۆر جوان باریوە، دوونیا هەمووی بەرگی سپی پۆشیوە کچی شیرینم.

ئەوکات خێر ئۆندەرم هاتەوە یاد کە هەموو کات دەیگووت من زۆر حەزناکەم بەفر ببارێت، منیش هەمووکات لێم دەپرسی بۆچی حەزبە بەفر بارین ناکەیت؟، لەدوونیادا زۆر کەمن ئەو کەسانەی حەزبەبارینی بەفر ناکەم.

دەیگووت ئاریانە گیان منیش حەزبە بارینی بەفردەکەم، بەلاَم کاتێك بەفر دەبارێت ماڵەکەی ئێمە زۆر سارد دەبێت توانایی کڕینی سۆپای باشمان نیە خوشکە بچووکەکەم و باوکم بەرگەی سەرما ناگرن، بۆیە کاتێك بەفر دەبارێت ناچار خوشکە بچووکەکەم لە نێو بەتانی گەرم دەکەینەوە، ئەویش تازە فێرە قسە بووە بەردەوام دەڵێت باوکە ئێستا دوونیا خۆ شەو نیە بۆچی نابێ لەژێر بەتانیەکەدا بێمە دەرەوە؟.

ئیتر کاتێك گوێم لەوە قسەیە ببێت چۆن دڵم بە بەفر بارین خۆش بێت، من یاری شەڕەبەفر بکەم خوشکە بچوکەکەشم لە ترسی سەرما بەدرێژایی رۆژ لەژێر بەتانی دابێت، بەلاَم ئاریانە گیان تۆ گوێی مەدێ ئەو کاتەی هاوسەرگیریمان کرد هەردووکمان مووچەی باشمان دەبێت ئەوە کات دەتوانین سۆپای باش بکڕین و خۆمان دڵخۆش بکەین.

دوایی ئەوە ئەو قسەیەم بەبیر هاتەوە ئەگەرچی پێشتر زۆر دڵخۆش دەبووم بەبارینی بەفر بەلاَم ئێستا هیچ دڵخۆش نیم، تەنانەت بەبیر کردنەوەم لە خوشکە بچووکەکەی ئۆندەر لە ناخەوە دەنگێکی غەرییم هاتە گوێم دەستم بە گریان کرد تا ئەو رادەیەی چاوەکانم سور هەڵگەڕان.

دایکم بەردەوام بانگی دەکرم، تائەو کاتەی هەڵسام و چوومە دەرەوە بینیم دوونیا یەك پارچە لە بەفری سپی داپۆشراوە دەنگی جۆرەها باڵندە دێتە گوێچکەم.

لەوکاتەدا دایکم گووتی خێرا نانەکەت بخۆ دەچین هەندێك یاری شەڕە بەفر لەگەڵ کەسە نزیکەکانمان دەکەین و کاتێکی خۆش بەسەر دەبەین و دواتر دەگەڕێینەوە شار.

نەخێر دایکە من ناتوانم بێم بۆشەڕە بەفر، دەرسی زۆرم لەسەر بەجێ ماوە دەبێ تەواویان بکەم، لەڕاستدا من دەرسم نەبوو بەڵام بەهۆی بیرکردنەوەم لە بنەماڵە ئۆندەرو خولیای خوێندنەوە کتێبەکە بیانووی دەرس خوێندنم هێنایەوە.

دایکە ئەی تۆ نەتگوت یەك مانگ لێرە دەمێنیەوە، من حەزناکەم وا زوو بگەڕێینەوە شار.

کچم چی روویداوە و پێشتر تۆ زۆر حەزت بە شەڕە بەفر و بەفر بارین دەکرد ئەی ئێستا چی بووە حەزی پێناکەیت؟، من هەر لەبەر تۆمە دەڵێم دەگەڕێینەوە شار هەست دەکەم لێر دڵت تەنگ بووە.

نەخێر دایکە من لێرە زۆر دڵخۆشم و خەریکی دەرسەکانم دەبم و دەمەوێت لە ژوورەکەی خۆم تەنیابم و تادەرسەکانم تەواو دەکەم حەزناکەم لەژوورەکەی خۆم بێمە دەرەوە.

زۆرباشە کچی شیرینم منیش لەکاتی ژەمەکاندا خواردنت بۆ دەهێنمە ژوورەکەت تۆ خەریکی کاری خۆت بە، ئێمە دوایی نیوەڕۆ دەچینە درەوە تۆ بەتەنیا لەماڵەوە دەمێنیتەوە.

ئەو رۆژە نەمزانی چۆن نانی نیوەڕۆم خوارد و چوومەوە ژوورەکەی خۆم بۆ تەواو کردنی کتێبەکە، کەتامەزرۆیم بۆ زانینی نهێنیەکانی نێو کتێبەکە دڵمی زۆر بەتوندی دەگوشی.

بەهەرحاڵ دوایی گەڕانەوەم بۆ ژوورەکەی خۆم دووبارە دەستم بە خوێندنەوەی کتێبەکە کرد نووسرابوو:

تەواوی رووداوەکانی ئەو رۆمانەی بەردەستی تۆ راستیە و هیچ شتێکی خەیاڵی تیادا نیە، هەربۆیە نووسەر هیچ کاتێك هەوڵی بلاّوکردنەوەی ئەو رۆمانەی نەداوە، لەو رۆمانەی ژێردەستی تۆ تەنها یەك نووسخە هەیە ئەویش ئەوەی بەردەستی تۆیە.

نهێنیەکانی ژیانی من زۆر دوورو قۆلن لەگەڵ ئەوەی تێگەیشتن لێی زۆر زەحمەتە، هەروەها باوەڕکردن و بەرگەگرتنی نهێنیەکانیش زۆر ئەستەمە.

من لەژیانمدا هەردەم بۆ دڵخۆشی دەوروبەرم هەوڵمداوە، تائەو کاتەی من خۆم لە دڵخۆشی بێبەش بووم.

بۆیە ئەو رۆمانەشم بلاّونەکردۆتەوە نەمویستووە بە هۆی ئەو رووداوانەی ژیانم هیچ کەسێك دڵتەنگ بکەم، لەبەرئەوە ئەو رۆمانە و نهێنیەکانی ناو ئەو رۆمانەم خستە ژێر ئاوەوە، تاوەکو چۆن من لە ژیاندا وون دەبم ئاواش نهێنیەکان و رووداوەکانی ژیانم وون ببن.

ئەوەی راستی بێت نامەوێت هیچ کەسێك بەو خەمە گەورانەی لەدڵی من دایە بزانێت و بە هۆیەوە دڵ تەنگ ببێت، لەبەر ئەوەی لەژیانمدا وانازانم هیچ کەسێك بەهۆی منەوە دڵ تەنگ بووبێت، نامەوێت هیچ کەسێکیش بەهۆی منەوە دڵی تەنگ بکات.

زۆرسەیرم لەبیرکردنەوەی ئەو نووسەرە دێت، چۆن هیچ کەسێکی لە ژیانیدا دڵتەنگ نەکردووە؟، باوەڕناکەم لە جیهاندا کەسێکی لەو جۆرە هەبێت کە هیچ کاتێك دڵی کەسی نەشکاندبێت و دڵی هیچ کەسێکی تەنگ نەکردبێت، ئێمەی مرۆڤ لە ئێستادا نەك هەر دڵی مرۆڤەکان دەشکێنین بەڵکو بگرە گەر لەدەستمان بێت ئێسکەکانی گیانیشیان دەشکێنین، رۆمانێکی زۆر سەرنج راکێشە بەلامەوە خوێندنەوەی تام و چێژی زیاتری

ژیانم پێدەبەخشێت و هێواش هێواش خولیای تەواو کردنیم دەگاتە لوتکەی حەزوو ئارەزووەکانم، سەرسام بوون و بیرکردنەوەم لە ووتەکان ناخی سووتاوی ئەو نوسەرەم بۆ بەدیاردەخات.

زۆر رۆمانی نووسەرانی ترم خوێندۆتەوە هەمووی بەحەزوئارەزووی نووسەرەکەی نووسراوە، بەلاَم ئەو رۆمانە پێدەچێت لەناخەوە ووشەکانی نووسیبێت، ناخێك لەدەست تالّی و مەینەتیەکانی ژیان وەك گڕکان وایە، هەرلەسەرەتایی ئازارەکانی ئەوەوە ناخی منیشی سووتاند، کەچی خۆ من تاوەکو ئێستا شتێکی ئەوتۆم نەخوێندۆتەوە بەمشێوەیە هەست بەناخی سووتاوی ئەو نووسەرەدەکەم.

یەکێ لە ووتەکانی تری نووسرابوو: ئەوەی بەسەرمان دێت هەمووی چارەنووسە، بەرلەدایك بوونمان بۆمان نووسراوە، چارەنووس وەك سێبەری شێوەی خۆمان وایە نەشێوەی دەگۆڕێت نە لێشمان جیادەبێتەوە.

لەگەلّ ئەوەشدا هەندێك رووداو دەستی خۆمانی تیادایە، بەلاَم زۆربەی رووداوەکان زۆر لەپێش ئێمەوە بڕیاری بوونیان لەسەر دراوە، بۆیە لەوەی کە هەتە خۆت زۆر زیاتر ماندوو مەکە، ژیان چۆنی دەوێت بەم شێوەیە لەگەلّی گوزەربکە، کەچی بەداخەوە من و تەواوی مرۆڤایەتی ئەوکاتە هەست بەو راستیە دەکەن کە فریشتەی رۆح کێشان دەبینن...

تاوەکو ئێستا ئەو رۆمانە دەخوێنمەوە و تێڕادەمێنم هیچی لێتێناگەم، کە ئەو وێنانەی ناو قوتووەکە چ پێوەندیەکی بەو نووسینانەوە هەیە، تەنانەت تاوەکو ئێستاش نازانم نووسەری ئەو رۆمانە کێیە، بەلاَم دلّنیابووم لەوەی تاوەکو کۆتایی رۆمانەکە بەردەوام بم سەرە داوێك دەست دەخەم و لە هەموو نهێنیەکانیش دەگەم.

لەو باروودۆخەشدا زۆر دوو دڵ و نائاسوودەم، لەبەر ئەوەی لەسەرەتای رۆمانەکەدا هاتووە ئەگەر ترسم لەوە نەبووایە خەڵك بەهۆی ئاشنابوون بەخەمەکانی من دڵتەنگ دەبن ئەوا رۆمانەکەم بڵاو دەکردەوە.

وورده وورده لەنێو ئەو بیرکردنەوانەدا نقووم دەبووم و جار جاریش ئۆندەر و خێزانەکەیم بەبیردەهاتەوە ئەوەش هێندەی تر دڵتەنگی و قەلەقیەکی منی زیاتر دەرکر، لەلایەکی تریش بێدەنگی نێو ڤێلاکە و بوونی هەورە رەش و چڵکنەکانی ئاسمان تەنگی پێ هەڵچری بووم.

بەهۆی ئەمانەوە کتێبەکەم بۆ ماوەیەك داخست و بەتاسە و گومانێکی زۆرەوە سەیرم دەکرد و لە دڵی خۆم دەمگووت درێژە بەخوێندنەوەی بدەم یاخود لە شوێنی خۆی دابنێمەوە و بچم بەدوایی کاری خۆمەوە، لەپاڵ ئەوەشدا دەمگووت باشە ژیانی خەڵکی بەمن چی بۆچی دڵی خۆمی پێوە تەنگ بکەم، کەچی هەرچەندەی دەکەم ناتوانم دەست بەرداری خوێندنەوە ببم، بەهۆی ئەوە ئاشنایەتیەی لەماوەیەدا لەگەڵ ئەو رۆمانەم پەیداکردووە، ئێستا لەو ناوچە چۆڵ و بێدەنگە بۆم وەك هاوڕێیەکی لێهاتووە، تەنانەت ئەوە ماوەیەی دەستم لە خوێندنەوەی بەردا هەستم بەتەنیاییەکی زۆرکرد، لەدڵی خۆم دەمگووت رەنگە ئەو رۆمانە باشتر ژیانم بگۆڕێت، بۆیە دەستم بەخوێندنەوەی کرد و ئەمجارە کەوتمە نێو ناوەڕۆکی رۆمانەکە.

ئێستا ساڵی 1960 زاینیە چیرۆکی ژیانی نووسەر لەگەڵ چارەنووسەکان و رووداوەکانی ئەو ساڵە دەست پێدەکات، لەشارۆچکە پردێ کە یەکێکە لە شارۆچکە جوان و رازاوەکانی کوردستان، ئەگەرچی ئەو شارۆچکەیە سەر بەکوردستانە بەڵام سێ میللەتی جیاواز(کورد و عەرەب وتورکمان) تیایدا دەژین.

ئەم ساڵ بەهارێکی زۆر خۆشی هەیە و پردێ بەهۆی ئەوی خاوەنی زێی بچوکە و جوانیەکی بێ وێنەیە خەڵکی بۆ ئێرە دێنە سەیران و هەم کاتێکی خۆش بەسەر دەبەن

هەمیش ئەو کەسانەی خولیای راوکردنی ماسیان هەیە خۆیان بەڕاوکردنەوە خەریك دەکەن.

خەڵکی پردێ ژیانێکە زۆر سادە و ساکار بەسەر دەبەن و لێرە لە دڵخۆشیدا کەس لە کەس دەوڵەمەنتر نیە، هیچ کەسێکیش لەگەڵ کەس رق و بوغزو کینەی نیە، لێرە هەموو کەسێك بەجۆرێك لە جۆرەکانی ژیان دڵخۆشە، مرڤەکان دڵ و دەروونیا زۆر ئاسوودەیە و هەمووشتێکیش بەباشی رێگەدەکات، تەکنەلۆژیا بەمشێوەیە پێشکەوتوو نیە بۆیە مرۆڤەکان هەموو کاتەکانی خۆیان لەگەڵ خێزان و ماڵ و منداڵەکانیان بە خۆشی بەسەردەبەن، جگەلەوەش دراوسێیەکان هیچ کاتێك سەر لەیەکتر نابڕن و هەموو شەوێك سەردانی یەکتر دەکەن.

ئەوەی گرنگ بێت ئەوەیە لەو بەهارە خۆشەدا و لەو کەش و هەوا جوانەدا لە نێو چریکە چریکی باڵندە دەنگ خۆشەکان، مام احمد کە کەسێکی ناسراوی شارۆچکەی پردێیە لەئەمڕۆدا خێزانەکەی بەهاتنی منداڵێك بۆسەر دوونیا فراوانتر دەبێت.

ئەمڕۆ بەرلەوەی مام احمد بۆ سەر کار بچێت خێزانەکەی بەناوی مەکیە بارووددۆخی تێك دەچێت و، لەبەر ئەوە مام احمد بە خێرایی بەدوایی پلە بەسێ دادەچێت، کە پلە بەسێ لەو ئاواییەدا مامانی دەکات و لە بوارەکەی خۆیدا زۆر شارەزا و لێهاتووە.

بەخێرایی بۆماڵەوە دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی دایکەکە و منداڵەکە رزگاربکەن، بەلاَم هەر زوو پلە بەسێ بە مام احمد دەڵێت ژیانی منداڵەکەت لە مەترسی دایە ئەگەر مەترسی بۆ سەر دایکەکەش دروست نەکات زۆرباشە.

لەوکاتەدا مام احمد بە خۆی و دارجگەرەکەی لە حەوشەی ماڵەکەیدا، کەپڕیەتی لە داری جوان و گوڵی بۆن خۆش هێواش هێواش هاتووچۆ دەکات و لەبەردەم خۆیەوە بەردەوام دووعا دەکات دەڵێت خودایە خێزان و منداڵەکەم بە ساغ و سەلامەتی بێببەخشەوە، دەستەکانم لە بارەگای تۆ دان لەو نارەحەتی و نەهامەتیە و دڵتەنگییە

رزگارم بکە، هەروەك چۆن ژیانت بۆ ئەو خەڵکە خۆش کردووە...بەرگی جوانی بەهارت بەو شارۆچکەیەداوە، خودایە ئاواش کامەرانی و خۆشی بۆ دڵم وخانەوادەکەم بگەڕێنەوە، بۆئەوەی ئێمەش وەك ئەو هەموو خەڵکە بتوانین ئەو بەهارە جوان و خۆشە بەدڵخۆشی بەبەختەوەری و کامەرانی بەڕێبکەین.

ئەگەرچی مام احمد خاوەنی دوو کوڕ بەناوەکانی (غەریب و محمد)ە،سێ کچ بەناوەکانی(خەدیجە و نەرمین و ئەژین)ە، بەڵام مام احمد بەهۆی ئەوەی خێزانەکەی و منداڵەکەی  بارووددۆخیان باش نیە فرمێسك لە چاوەکانی راناوەستێت و بەردەوام بە دەستە پڕ دووعاکانی دەپاڕێتەوە و دەڵێت خودایە خێزان و منداڵەکەم بە سەلامەتی پێیبەخشەوە.

ئەو رۆژە لەبەیانیەکەیەوە تاوەکو گەیشتە دەمەو ئێوارە مام احمد نەیدەزانی کات چۆن رێدەکات، ئیتر خۆر ئاوابوون نزیك دەبێتەوە و باڵندەکانیش بەو خۆراکەی بەدرێژای رۆژ بۆ بێچوەکانیان پەیدایانکردووە بە دڵخۆشی بۆ هێلانەکانیان دەگەڕێنەوە و باوەکەکانیش لە دوایی شەکەتی و ماندوییەتی کارکردن بە خواردنەکانی دەستیان بۆ ماڵەوە دەگەڕانەوە، هەموو کەس بە دڵخۆشی دەیڕوانیە خۆر ئاوابوون، لەبەر ئەوەی هەموویان دەزانن لە دوایی خۆر ئاوابوون ئەندامانی خێزان هەموویات تێکڕا لەسەر سفرەی نان خواردن کۆدەبنەوە و لە پاڵ نان خواردن کات و ساتە خۆشەکانیان بەرێ دەکەن و ماندوویەتی ئەوە رۆژە لە لەشیان دەردەکەن.

مام احمد لەگەڵ بینینی ئەوە دیمەنانە زیاتر و زیاتر دڵتەنگی دایدەگرت و بیری لەوە دەکردەوە تۆ بڵێت منیش وەك ئەوان جارێکی تر بتوانم لەگەڵ خێزانەکەم و منداڵەکانم لەسەر یەك سفرە کۆببینەوە و وەك جاران نان بخۆین و دڵخۆش ببین، وەك هەموو جارێك ژنە جوانەکەم لەباوەش بگرم و باسی ماندوویەتی رۆژەکەمی بۆ بکەم، دوایی ئەوە ئەویش بەقسە خۆشەکانی بتوانێت هەرچی ماندوو بوونە لەلەشم دەربکات.

ئەوەی راستی بێت خێزانی مام احمد یەکێك بوو لە هەرە ژنە باش و چاکەکانی شارۆچکەی پردێ، هەموو کەسێك بە ژنە فریشتەکەی پردێ بانگی خێزانی مام احمدیان دەکرد، ئەگەرچی مام احمد لە رووی ئابووریەوە هەژارترین کەسی شارۆچکەکەیە...لەگەڵ بوونی خێزانێکی وا هەموو خەڵك بگرە دەوڵەمەندەکانی شارۆچکەکە ئیرەییان پێدەبرد.

وورده وورده لەگەڵ تاریك بوونی دوونیا خەم و خەفەتەمانی مام احمد زیادی دەکرد، هەروەك چۆن وورده وورده تاریکی رووناکی زەوی لەناو دەبرد، ئاواش تینی ئومێدەکانی مام احمدی لەناو دەبرد، تائەوکاتە کە تاکە تروسکێك و هاوڕێی ئەو بەدرێژایی ئەوە ماوەیە خۆر بوو ئەوەیش لە شەودا جێهێشت و تەنیا مایەوە.

هەرجارێك مامانەکە دەهاتە دەروە و بەنائومێدییەکی زۆر سەیری مام احمدی دەکرد زیاتر و زیاتر ئومێدەکانی مام احمدی لەناودەچوو، لەوکاتەدا بیری لەوە دەکردەوە تۆ بڵێت جارێکی تر بتوانم ژنە خۆشەوستەکەم لەباوەش بگرمەوە، تۆبڵێت جارێکی تر ئەو ببێتەوە پشت و پەنایی من، لێرەدا مەسەلەکە لەدەست دانی ژنەکە نیە مام احمدی هێندە خەمبار کردووە، بەڵکو مەسەلەکە ئەوە بوو ئەو هەموو خۆشەویستیە و عیشقەی بۆ ژنەکەی هەیەتی چۆن جارێکی تر ئەو هەموو خۆشەویستیەی ئەو بەکەسێکی تر بدات و چۆن جارێکی تر ژنێکی تر لەباوەش بگرێتەوە.

ئیتر مام احمد بەدەم ئەو خەیاڵانەوە تەواوی ئەو شەوە بە هاوڕێ بوون لەگەڵ مانگ و ئەستێرەکان و دەستە بەدووعاکانیەوە بەردەوام بوو، ئەوە شەوەی بەهار بەهۆی ئەوەی هەوا سامالێکی جوان و خۆش بوو تەواوی ئەستێرەکان و ئاسمان و مانگیش بە جوانی و درەوشاوەییەکەیەوە بەجوانی دەتوانرا ببینرێت.

لەو شەوەدا مام احمد هێندە گریابوو چاوەکانی سور هەڵگەڕابوون، شەو گەیشتە نیوەی دەنگی ئاژەڵە جۆراو جۆرەکان دوونیای پڕکردبوو، هەرکە زانی دەگا کرایەوە و

کەسێك بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد مام احمد مام احمد لەو ستاتەدا مردن بۆ مام احمد هەرزار جار خۆشتربوو، لەگەڵ ئەو هاوارکردنەدا بەجۆرێك تاسا توانای وەستانی لەسەر ئەژنۆکانی نەماو کەوت، خێرا بیری بۆ ئەوەچوو کە ژن و منداڵەکەی لەدەست دابێ و ئیتر ژیانیش بۆ ئەو کۆتایی هات.

دوایی ئەوەی ئەو کەسەی هاواری دەکرد لە مام احمد نزیك بوویەوە و گووتی مام احمد موژدانەم بەرێ خوایی گەورە کچێکی جوانی پێ بەخشیت، مام احمد بەگریانەوە گووتی ئەی ژنەکەم ژنەکەم چی بەسەر هات؟.

هیچ خەمت نەبێ مام احمد خودایی گەروە هەردووکیانی بە ساغ و سەلامەتی پێبەخشیتەوە.

لەوکاتەدا لەلای مام احمد لە دوونیادا هیچ شتێك وەك ئەو هەواڵە خۆش نەبوو، ئیتر لەمەودوا فرمێسکەکانی لە فرمێسکی دڵتەنگییەوە بۆ فرمێسکی دڵخۆشی گۆڕدرا، دڵ لە دڵتەنگیەوە گۆڕدرا بۆ دڵخۆشی و بەهارێك بۆ ئەو بوو بەدوو بەهار.

هەرچۆنێك بێت خۆی کۆکردەوە و خۆی گەیاندە ژنەکەی لەگەڵ دووبارە شادبوونەوەی بەژنەکەی بەسەلامەتی، فرمێسك وەك لێزمەی باران لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوە، کاتێك ژنەکەشی چاوی بە پیاوەکەی کەوت بەو حاڵەوە ئەویش بەهەمان شێوە دلۆپی فرمێسکەکان پێڵوی چاوەکانی داگرت.

ئیتر بەدەم گریانەوە یەکتریان لە باوەشکرد وەك بڵێت ئەوانە چەندین ساڵە لە نێو عیشقێکی زۆر وەك گڕکانەکان گڕدەگرن و ئێستاش بەیەك گەیشتوون، دەبێ ئەوە چ جۆرە خۆشییەك بێت؟، هیچ کەسێك لەو خۆشییە تێناگات تەنها ئەو کەسانە نەبن کە بەڕاستی یەکتریان خۆش دەوێت و کۆڵنادەن تاوەکو بەیەکتر دەگەن.

دوایی ئەوەی ئەو دووخۆشەویستە بەشادی و کامەرانی بەیەك گەیشتنەوە بڕیاریاندا ناوی منداڵەکەیان (شادی) بێت، لەبەر ئەوەی جارێکی تر خۆشی و شادی گەڕایەوە نێو ئەو بنەماڵە.

ئیتر دوایی ئەوە ژیانێکی نوێ بۆ مام احمد و ژنەکەی بەهاتنی شادی بۆ دوونیا دەست پێدەکات و دەست دەکەن بە خۆشەویستی دەربڕین بۆ منداڵە نوێیەکەیان.

شادی تابڵێت کچێکی جوان و خرپن و رێك و پێك بوو، کچێك کە وەك فریشتە بەدیار دەکەوێت و لەو تەمەنەی ئەودا جگەلە سۆز و میهرەبانی زیاتر هیچی تر بەدی نەدەکرا.

شادی لەگەڵ ناز و خۆشەویستی دایك و باوکی گەورە دەبێت و گۆرانکاری بەسەر ژیانی دادێت و تا بڵێت جوان و رێك دەبێت، ئیتر شادی دوانزە ساڵی تەمەنی بەرێکرد، ئەگەرچی منداڵ لەو تەمەنی ئەودا خاوەن جەستەیەکی زۆر گەورەی نیە، بەلأم شادی خاوەنی بالأیەکی بەرز و جوان و خرپن بوو، کە ئەو بالأیەی ئەو هەرگیز لە تەمەنی خۆی نەدەچوو.

ئیتر ئەو کچە ئەو فریشتەیە نیە کە بەمنداڵی دەبینرا، ئەگەرچی ئەو وەك فریشتەیەك هاتە سەر دوونیا کەچی شادی ئێستا تەواو گۆڕدراوە.

شادی بەهۆی ئەو رەفتار و جوانییەوەی هەیبوو جگەلەوەی کەسێکی زۆرچاو لەدەر دەرچوو لەگەڵ دایك و باوکی زۆر خراپ بوو هیچ ئامۆژگارییەکی ئەوانی لە گوێچکە نەدەگرت، هەروەها هەر رۆژە و لەگەڵ کورێك پێوەندی خۆشەویستی دەبەست و وازی لێدەهێنا.

لەبەر ئەوەی مام احمد کەسێکی دیندار و پیاوچاکی شارۆچکەی پردێ بوو، ئێستا لەبری ئەوەی دووعای تەمەن درێژی بۆ کچەکەی بکات دووعای ئەوەی دەکرد چەند زووە خودای گەورە تەمەنی لێبسێنێتەوە رۆحی کچەکەی بۆ خۆی بباتەوە.

مام احمد هەموو جارێك بە پەشیمانییەکی زۆرەوە دەگووت ئای خودایە من چەندە پاڕامەوە تاوەکو ئەو کچەم هیچی بەسەر نێت و لە ژیاندا بمێنێت!، خۆزگە هەر ئەوکات نەهاتبایە دوونیا گیانی لەدەست دابا و هەرگیز ئەو رۆژانە ئێستام بەچاوی خۆم نەبینیبوایە.

ئەوەی راستی بێت مام احمد زۆر جار کە گوێبیستی ئەوە دەبوویەوە کچەکەی خراپەکاری زۆر دەکات، زۆر خراپ لە شادی دەدا بۆ ئەوەی ئەو خوڕەوشتە خراپەی تەرك بکات، جگەلەوەش هەندێکجار بیری لەوە دەکردەوە کەشادی بکوژێت، بەڵام دەیگوت ئەگەر ئەو بکوژم زۆر خراپتر لە ناوچەکەدا ئابڕووی دەچێت.

شادی بەجۆرێك خراپ ببوو مام احمد ئەگەر دوو کەسی بینیبووایە سەیری ئەو دەکەن و قسەدەکەن وای بۆ دەچوو کە باسی کچە خراپەکەی ئەو دەکەن.

ئیتر مام احمد بۆ ئەوەی لە شارۆچکەکە زیاتر ئابڕووی نەچێت بڕیاری دا کە شادی کچە بچووکەکەی کە ئێستا تەمەنی سیانزە ساڵە بە شوو بدات، بۆیە رۆژێك لەلای خۆشەویسترین هاوڕێی بەناوی مام عزیز دەردە دڵی خۆی لەلا دەکات و دەڵێت بەڕاستی کچکەم شادی دەمەوێت بەرلەوەی لێرە کارێکی هەڵەی گەورەتر ئەنجامبدات بەشووی بدەم، بەڵام خۆت دەزانی لێرە شارۆچکەکەمان بەهۆی بچووکیەوە هەموو کەسێك هەواڵی ئەوە کچە خراپەی منی زانیوە بۆیە لێرە هیچ کەسێك نیە هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودا بکات.

مام عزیز گووتی تۆ هیچ خەم مەخۆ من لە شار(کە ئەوکات مەبەستی لێی شاری هەولێر بوو) ناسیاوێکم هەیە دوو کوڕی گەنجی هەیە، هەڵە نەبیم گوێبیستی ئەوە بووم ئەوانیش بەدوایی ماڵێکی باش دەگەڕێن بۆ ئەوەی کچێکی باش بۆ کوڕەکانیان بدۆزنەوە.

مام احمد تۆ هاوڕێی گیانی بە گیانی منی تۆ هیچ خەمت نەبێت ئەو کارە بەمن بسپێرە، ئەو هەینییەی دابێت من دەچمە شار و سەرێکیش تا ماڵی ئەو ناسیاوەمان

دەچم و سەبارەت بەو بابەتە قسەیان لەگەڵ دەکەم، بەڵکو کارەکە ڕێك دەکەوێت و تۆش ئەو خەمە گەورەت لە یەخە دەبێتەوە.

دوایی ئەوەی مام عزیز هاتە شار و چووە ماڵی حاجی نوری ناسیاویان کە خاوەنی یەك کچ بەناوی خێریە و چوار کوڕە بەناوەکانی (نورەدین، سەرکەوت، سعدالله، سەدرەدین)ە.

کاتێك مام عزیز گەیشتە ماڵی حاجی نوری دوایی چاك و چۆنی یەکتر لەباوەش کردن وماچ کردن، حاجی نوری گوتی ئەوە چۆنە دوایی ماوەیەکی زۆر ئێمەت بەبیر هاتۆتەوە ؟.

مام عزیز ئەوەی ڕاستی بێت هاتنی ئەو جارەم زۆر جیاوازە لە جارەکانی تر، ئەمجارەیان بە ئیشێکی خێر هاتوومەتە خزمەتی ئێوە.

حاجی نوری گووتی ئەگەر ئیشێك بە ئێمە بکرێت چۆن بۆتی جێبەجێ ناکەم، تۆ بەدەر لەوەی لە ناسیاوەکانی ئێمەی لە برایەك بۆ من زیاتری.

ئەوی ڕاستی بێت گوێبیستی ئەوە بوو کە تۆ بۆ سعدالله ی کوڕت بەدوایی ماڵێکی باش و کچێکی باش دەگەڕێیت، منیش هاوڕێیەکی ئازیزم هەیە کچێکی زۆر جوان و باشی هەیە، پێمی گووتووە ئەگەر ماڵێکی باش هەبێت ئەوا بەمێردی دەدەم، منیش بیرم کردەوە لەو کارە خێرە دەستێکی منی تیادابێت بەڵکو بەو هۆیەوە خودایی گەورە پاداشتم بداتەوە.

لەوکاتەدا مام عزیز بۆ ئەوەی خۆی لەلای هاوڕێیەکەی خۆشەویست بکات بۆی بەدیار بخات کە ئەو هاوڕێ و خۆشەویستی ڕاستەقینەی ئەوە، وەك شەیتان ژیانی یەك بنەماڵەی بەرەوە ڕووخان و کاولبوون برد، ئەو ئاگادار نیە بەو ڕووداوانەی لە دوایی ئەو کارەی ئەو ڕوویانداوە.

بەهەرحاڵ حاجی نووری گووتی کاتی ئەوە هاتووە ژن بۆ سعداللە ی کوڕم بهێنم، تۆ خۆشت دەزانی دوو کوڕی ترم ژنیان هێناوە و لەو خانووە بەیەکەوە دەژین، ئەگەر ژن بۆ سعداللە بهێنم تەنها سەرکەوت دەمێنێت ژنی بۆ بهێنم، ئەوەی راستی بێت منیش کەمێك باڵم سوکتر دەبێت سعداللە کوڕیشم بۆ خۆی ماڵێك بەیەکەوە دەنێت، بەلاَم دەبێت ژوورێکی تر بۆ ئەو لەوە خانووە زیاد بکەم.

ئەوەی راستی بێت داب و نەریتی هاوسەرگیری لەو کاتدا وابوو بە هیچ شێوەیەك کوڕ و کچ بۆ یان نەبوو یەکتر ببین، بۆیە تەنها سەرۆکی هەردوو خێزان واتا باوکی کوڕ و باوکی کچ بڕیاری ئەوەیان دەدا کە ئەوانە بۆ یەکتر دەبن یاخودنا، هەر بۆیە دوایی ئەوەی بنەماڵەی حاجی نوری و مام احمد چاویان بەیەکتر کەوت بڕیاریاندا ئەو کارە سەر بگرێت ئەو کوڕ و کچە بە بێ ئەوەی یەکتر ببینن بۆیە کتر بن.

دوایی بڕیاردا لەسەرهاوسەرگیری کوڕەکەی هەرچۆنێك بوو حاجی نووری لە خانووەکەدا کولانەیەکی بۆ سعداللە زیادکرد بۆئەوەی لەگەڵ خێزانەکی ژیانی تیادا بەسەر ببات.

بەم شێوەیە ژیانێکی نوێ بۆ سعداللە لە گەڵ ئەو ژنەی کە بۆ خۆی لە ژیانیدا هەڵینەبژاردووە دەستی پێکرد، ئیتر ئەو لەوە تێگەیشت تازە هەرچۆنێك بێت دەبێت خۆشەوستی بۆ ئەو ژنە هەبێت ئەگەرچی هەڵبژاردەی خۆشی نەبێت.

ئەوەی راستی بێت سعداللە کەسێکی زۆر باش و دینداری ناو خێزانەکەیەتی جگەلەوەش خەڵکی لە چاکە زیاتر هیچی تریان لەو پیاوە نەدیبوو.

ئیتر ژیانی نوێی خۆی لە نێو ئەو کولانەیەی کە باوکی لە حەوشەی ماڵەکەدا دروستی کردبوو درێژە پێدا و بە ساڵێك بەسەر تێپەڕبوونی هاوسەرگیرییەکەی یەکەم منداڵی بەناوی جیهان هاتە دوونیاوە.

لەبەر ئەوەی باروودۆخی خەڵکی کوردستان لە ساڵانی حەفتا و هەشتاکان هیچ باش نەبوو، بەڵام باروودۆخی ماڵی حاجی نووری زۆر لە ماڵە ئاساییەکانی شار خراپتربوو، بوونی چوار ماڵ لە نێو یەك خانوو ژیانێکی زۆر ناخۆشی بۆیان دروست کردبوو، بەتایبەتی ئەو کات خەڵك رێگەی لەو نەدەکرت منداڵی زۆریان نەبێت، بەڵکو لە هەر خێزانێکدا هەر ساڵەو منداڵێك زیادی دەکرد.

هەر بەم شێوەیەش شادی سعداللە تاوەکو ساڵی 1985 بوونە خاوەنی حەوت منداڵ کە سێ کوڕ بەناوەکانی (هێرش و کاروان و علی) هەروەها چوار کچ بەناوەکانی (جیهان، شیرین، شەرمین، شەوین).

بەدەرلەوەش براکانی سعداللە یەکێکیان خاوەنی هەشت منداڵ و ئەوەی تریان خاوەنی پێنج منداڵ بوو، ئیتر لەو کولانانەی تیایدا دەژیان ژیانێکی زۆر سەختان بەسەر دەبرد، بۆیە سعداللە هەرچۆنێك بوو بەو پارەی لەدوایی پێکهێنانی ژیانی هاوسەرگیری بە ماندوو بوون و شەون و خونیەکی زۆر کۆیکردبوویەوە بڕیاری دا هەرچۆنێك بێت پارچە زەوییەك بکڕێت و ژوورێکی لەسەر دروست بکات.

ئەگەرچی تابڵێت خانوویەکی بێ سەروبەری بەیەکەوە وەنا، بەڵام سعداللە هێندە دڵی خۆش بوو وەك بڵێت تازە لە دایك بۆتەوە.

شادی ئەو ئافرەتە بە مێرکردنی و هەبوونی حەوت منداڵ هەرگیز دەستی لە کارە خراپەکانی خۆی هەڵنەدەگرت، بەتایبەتی کاتێك بە علی کوڕییەوە دووگیان دەبێت جیهانی کچی لە قوتابخانە دەردەهێنێت، بۆئەوەی خزمەتی خۆی و منداڵەکانی تری پێبکات، ئەگەرچی جیهان ئەو کچە بچکۆڵە بێنازە پێداگیرییەکی زۆر دەکات لەوەی بچێتە قوتابخانە و تەنانەت دەڵێت تۆ رێگەم بدە بچمە قوتابخانە من ئەو دانەی دەگەڕێمەوە هەموو کارەکانی ماڵ دەکەم تۆ دەست لە هیچ کارێك مەدە، بەڵام بە هۆی ئەوەی دایکی کەسێکی زۆر دڕندە دەبێت سعداللە ی باوکیشی ناتوانێت بڵێت دەبێت بچێتە قوتابخانە،

تەنانەت لەو ماوەیەی کە جیهان لە قوتابخانە دەهێنێتە درەوە بەهۆی زیرەکی و رێکوپێکی جیهانەوە چەندین جاری بەڕێوبەری قوتابخانە داوا لە شادی دایکی دەکات رێگەی ئەو کچە بدات بچێتەوە قوتابخانە.

لەکۆتا جاردا شادی زۆر بەتوندی وەلآمی بەڕێوبەرەکەی دایەوە و گووتی کچ کچی خۆمە هەرچۆنم بوێت بەمشێوەیە دەبێت هیچ پێوەندییەکی بەتۆوە نیە رێگەی بدەم بیتە قوتابخانە یاخود رێگەی نەدەم.

دواتر من بەهیچ شێوەیەك رێگری لەوە ناکەم کچە جوان و شیرینەکەم بخوێنێت بەلآم جیهان خۆیی نایەوێت درێژە بەخوێند بدات.

ئەگەرچی جیهانی بێدەسەلآت لە ژێر دەستی دایکێك کە وەك شەیتان وایە ئازاری زۆر دەکێشێت، زۆر دەپاڕێتەوە کە دایکی ئەو بنێرێتەوە قوتابخانە، شادی دایکی بۆ ئەوەی وا بەدیاربخات کە ئەو بۆی دایکێکی باشە رێگەی دەدات بچێتەوە قوتابخانە، بەلآم لە خەیاڵی خۆیدا پلانێکی ئەوتۆ بۆ ئەو کچە بچکۆڵەیە دادەنێت کە شەیتان پەی بە پلانێکی لەو جۆرە نابات.

شادی هەڵدەستێت بە ئافرەتێکی درواسێیان رادەگەیەنێت کە قسە لەگەڵ جیهان بکات و پێی بڵێت ئەوە بۆ ئاگات لە دایکت نیە ئەوە چەندین جارە بەهۆی دوگیانە ببورێتەوە من دەچم یارمەتی دەدەم ئەگەر من نەبم ئەوا دایکت دەمرێت، شادی دەیزانی جیهانی کچی زۆر میهرەبانە و بەگوێبیس بوونی ئەو قسەیە واز لە قوتابخانە وخوێندن دەهێنێت.

ئیتر ئەو ئافرەتەش وەك ئەوەی بڵێت لە شەیتانێکی بچوکە ولەژێر دەستی شادی کە شەیتانی گەورەیە فرمانەکانی جێبەجێ دەکات و ئەو هەواڵە درۆینە دەگەێنێتە جیهان.

جیهانی داماویش بی خەبەر لەوەی ئەو ئافرەتە فریشتە نیە و یەکێکە لەو ئافرتە شەیتانانەی سەر رووی گۆی زەوی، بەگوێبیست بوونی ئەو هەواڵە ناچار بە خەم و خەفەتێکی زۆرەوە دەست بەرداری خوێندن دەبێت.

لەکۆتا رۆژی چوونی بۆ قوتابخانە بەرێوبەری قوتابخانە بانگی دەکات و دەڵێ کچی شیرینم من لەگەڵ دایکت قسەم کردووە دەڵێت خۆی حەزناکات بخوێنێت ئایە ئەو قسەیە راستە؟.

بەڵی مامۆستا گیان دایکم راستی گوتووە دەمەوێت واز لە خوێندن بیهێنم یارمەتی ماڵەوەمان بدەم حەزناکەم لە خوێندن بەردەوام بم.

تێگەیشتم کچی خۆم ئەو قسانە تۆهەرگیز لە ناخی دڵتەوە نیە بەلاًم دەزانم ناچارکراویت.

لەو کاتەدا جیهان زیاتر خۆی بۆ رانەگیراو بەگریان راکردنێکی زۆرەوە ژووەرەکەی بەجێهێشت و گەڕایەوە ماڵەوە و جارێکی نە مامۆستا نە هاورێیە قوتابییەکانی نە قوتابخانەی نەبینیەوە.

ئیتر ژیانێکی نوێ بۆ کچە بێنازەکە دەستی پێکرد، بەواتایەکی تر هەر لەگەڵ پەیدابوونی علی لە زگی دایکی ژیانی منداڵی کۆتایی پێهات و دەستی بە خزمەتکردنی دایك و خوشك و براکانی تری کرد، ئەگەرچی لەتەمەنی ئەودا منداڵەکان خەریکی یاری کردنن بەبوکەڵەکەکانیان کەچی ئەویش هەرلەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم تروسکی خۆر دەست دەکات بەخزمەتکردنی خوشك و برا و دایکە دووگیانەکەی، رۆژ بۆ ئەو وەك کابووسێکی لێهاتووە، کە خۆر ئاوادەبێت هیوا دەخوازێت جارێکی تر خۆ هەڵ نێتەوە، لەبەر ئەوەی شەو بۆ ئەو وەك ئەو وایە لە بەهەشتی خودا دابێت دەتوانێت کەمێك لەژێر پێخەفە شڕەکەیدا ماندوویتەی رۆژ لەگیانی دەربکات.

ئەگەر ئەو بەڕاستی باسی ژیانی خۆی بکات هیچ کەسێك باوەڕی پێناکات، لەبەر ئەوەی ژیانی ئەو تەنها لە نێو ڕۆمانەکاندا هەبووە دەبێت، هیچ کەسێك خەیاڵی بۆ ئەوە ناچێت کە دایکێك هێندە بێبەزەیی بێت و کچە بچووکەکەی بەو شێوەیە ماندووبکات.

لەگەڵ ئەوەش تائەوکاتەی باوکی لەماڵەوە بو جیهان دڵی بەو خۆش بوو،بەلاَم بەهۆی ئەوەی ئەوکات شەڕی نێوان عیراق و ئێران هەڵگیرسا ناچارباوکی بۆ بەرەکانی جەنگ ڕۆیشت، باوکی جیهان بە هۆی ئەوەی ئەو یەکەم منداڵی بوو هێندەی خۆش دەویست دەگووت کچم ئەگەر تۆ لە نێو جانتاکەم جێگات ببوبایەوە تۆشم لەگەڵ خۆم دەبرد.

بەدرچوونی باوکی جیهان وەك منداڵی بێناز دەکەوتە ژێر چەپۆکە دڕندانەکانی دایکی، ئەگەر کەسێك لەنزیکەوە نەیزانیبووایە ئەوە دایکی خۆیەتی ئەوا هەرگیز باوەڕی بەچاوی خۆی نەدەکرد کە چۆن ئەو ڕەفتارانە لەگەڵ کچی خۆی دەکات.

هەرچەندە جیهان دەیویست باروودۆخی خۆی بۆ باوکی باس بکات، بەلاَم هەرکە باوکی بەو ماندوویەتیە دەبینی کە لەبەرەکانی جەنگ گەڕاوەتەوە زۆر نارەحەت دەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ئازارو ئەشکەنجەکانی دایکی بۆ ئەو گەیشتە ئەوە پەڕی دڵڕەقی جیهان بڕیاریدا هەرکە باوکی بگەڕێتەوە هەموو شتێکی بۆ باس بکات، کەچی ئەو جارە لە بەدبەختی کچە بێنازەکە، ئەو سەیارەی باوکی پێی دەگەڕایەوە ماڵ لەرێگا لەسەر چیایەك شوفێرەکە کۆنترۆڵی لەدەستدا و کەوتە خوارەوە، لە بیست سەربازی نێو سەیارەکە تەنها سعداللە بەبرینداریەکی سەختەوە رزگاری بوو.

ئیتر ئەمجارەش کچە بێنازەکە لەگەڵ ئەوەی ووردە ووردە لاوزا دەبێت و ئازار دەکێشێت، کە چووە بەرامبەر باوکی وویستی هەموو شتێك باس بکات، کەچی کاتێ چاوی بە حاڵی باوکی کەوت بڕیاری دا کە لە نێو ئەو ئازارەدا بەردەوام بێت و لەگەڵی بجەنگێت و هیچ لەلای باوکی باس نەکات تاوەکو دڵی تەنگ نەکات.

ئیتر تا ئەو کاتەی جیهان باوکی بەهۆی برینداریيەکەیەوە رێگەی ئەوەی درابوو لەماڵەوە بێت، شادی بە جۆرێك مامەڵەی لەگەڵ جیهان دەکرد هەروەك بڵێت ئەو ئافرەتە فریشتەیەکە خودا بۆ ئەو کچەی ناردووە.

دوایی تەواو بوونی مۆڵەتی باوکی جارێکی تر ئازارەکانی جیهان وەك ئەوەی چارەنووسی ئەو لەگەڵ ئەو ئازارانە بەسترابێتەوە دەستی پێکردەوە، بەلەدایك بوونی علی ئازارەکانی کچە بێنازەکە زۆر زیاتر بوو کە دەبووایە جگەلەوەی خەریکی بەخێوکردنی منداڵەکانی تر بێت ئەرکی خزمەتکردنی دایك و برا بچووکەکەشی کەوتبووە سەرشان، کچە بێنازەکە لەتەمەنی دەساڵیدا وەك ژنێکی تەواو رەفتاری لەگەڵ دەکرا، تەنانەت لەو تەمەنەدا فێری هەموو جۆرە چێشت لێنانێك ببوو.

ساڵێك بەو نارەحەتی و ئازارەوە لەو ژیانەیدا هەیەتی بەردەوام بوو، تائەو کاتەی شادی کەوتە ئەنجامدانی گەرەترین تاوانی ئەویش هەڵسا بە پێوەندی بەستن لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەندی دراوسێیان، لەوکاتەدا جیهان کاتێ ئەوەی بەچاوی خۆی بینی، کە دایکی لەگەڵ ئەو پیاوەی دراوسێیان دەستی تێکەڵکردووە زۆر سەری سوڕما، بەردەوام دەیگوت بیرم بۆ هەموو خراپییەکی دایکم چووبێت بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو دایکم خیانەت لە باوکم بکات.

دوایی ئەو رووداوە کچە بێنازەکە بەدەنگێکی نزمەوە هاواری دەکرد خودایە تەنها شەو بۆ من هەبووم تیایدا کەمێك بحەسێمەوە و ئازارەکانی گیانم دەربکەم، ئێستا شەو بۆم بۆتە دڕندەیەك کەناتوانم بەرگەی بگرم، هەموو شەوێك کە تروسکی رووناکی مانگ و ئەستێرەکان دەبێتە هاوڕێم و دەردە دڵیان بۆ دەکەم مانگیش بەرگەی ئازارەکانی من ناگرێت بۆیە ئەویش وورده وورده بچوك دەبێتەوە و چەند رۆژێك لێم وون دەبێت، ئەستێرکانیش بە هەمان شێوە زۆرکات پەردەکانیان دادەخەن و حەزناکەن من ببینن.

کچە بێنازەکە بەهۆی تەمەن بچووکەکەیەوە وایدەزانی مانگ لەترسی خەمەکانی ئەوە بچوك دەبێتەوە و هەورەکانیش پەردەن کە ئەستێرەکان ئیتر توانای گوێگرتنیان نیە لە خەمەکانی پەردەکە دادەخەن.

دەیگووت تۆ بڵێت ئەستێرە و مانگیش رقیان لەمن بێت؟، دەترسم ئەوانیش دایکمیان زۆر خۆش بووێت، ناوێرم دەردەکانی خۆم بە جوانی بە خوداش بڵێم لەبەر ئەوەی زۆر گوێم لەوە دەبێت خودا دایکەکانی زۆرخۆش دەوێت، تەنانەت خودا بەهەشتی بەو گەورەییەی خۆیەوە لە ژێر پێی دایکی داناوە، ئاخەر من چۆن بتوانم بڵێم خودایە بەڵایەك رووبەرووی دایکم بکەوە، نەخێر ناتوانم ئەوەش بڵێم لەبەر ئەوەی خودا دایکەکانی زۆر خۆش دەوێت، نەخێر خودایە نامەوێت دایکم هیچی بەسەر بێت من دەمەوێت لەو ژیانە رزگارم بێت ئەوە باشترین رێگەیە بۆ ئەوەی لەو ئازارەی ناخم رزگارم ببێت، کە دایکم خیانەت لە باوکم دەکات.

نەخێر ناتوانم ئەوەش لە باوکم بشارمەوە کە دایکم لەگەڵ ئەو پیاوەی دراوسێمان خەریکی خیانەت کردنە.

هاواری دەکرد خودایە ئەو مێشکە بچوکەی من چۆن بەرگەی ئەو هەموو خەمە گەورەیە دەگرێت، باوکم خەریکە بۆ ئێمە خۆی بەکوشتن دەدات بۆئەوەی ئێمە بە سەلامەتی بژین دایکیشم خیانەتی هاوسەری لێدەکات.

لەو رۆژە بۆم دەرکەوت ئەو کەسانەی لەسەر وولات خۆیان بەکوشتن دەدەن و ژنەکانیان دەبێتە کاڵای دەستی دەوڵەمەندەکان و منداڵەکانیشیان بەبێ باوك دەبنە دەرۆزەکەری دەرگای دەوڵەمەندەکان.

باشە ئەو دراوسێیەمان چۆن هەست و دڵی بۆ ئەوە دەچێت کارێکی وا لەگەڵ باوکم بکات، کەباوکم بۆ پاراستنی خێزان و ماڵ و سامانەکەی ئەو چۆتە جەنگکردن.

كچە بێنازەكە بەشەو خەریكی ئەو بیركردنەوانەو بەرۆژیش خەریكی خزمەتكردنی ماڵەوە بوو، دایكیشی هەر خەریكی هەوس بازی نابەجێی بوو لەگەڵ دراوسێیەكان، بۆیە حیهان كە چاوی بەو كارانە دەكەوت و نەیدەتوانی هیچ بڵێت نەیدەتوانی پڕ بەگەرووە بچووكەكەی هاواربكات ئەو تۆ خەریكی چیت؟، چۆن دەتوانیت ئەو كارە لەگەڵ باوكم بكەیت؟، ئەو خەریكی بەرگری كردنیەتی لە ناموسی خۆی كەچی نازانێت نامووسی لێرە بەدەست دەوڵەمەندەكانەوە دەكڕێت و دەفرۆشرێت، دڵنیام ئەگەر ئەوەی بزانیبایە هەرگیز بۆ جەنگكردن نەدەچوو.

ئیتر كچە بچكۆڵەكە لەگەڵ ئەوەی لەلایەن دایكی ئازار و ئەشكەنجەیەكی زۆر دەدرا ئەو خەمە گەرورەی لە مێشكی ئەودا بوو، بووە هۆی ئەوەی بۆ چەند رۆژێك هیچی بۆ نەخورێت زۆر بەخراپی نەخۆش كەوت.

دوایی ئەوەی بۆ چەند رۆژێك لە نەخۆشخانەدا پاڵكەوت هەر بیری لەوە دەكردەوە، كە ئەو بابەتە لەلای باوكی باس بكات یا باسی نەكات یاخود هەر رێگایەكی تر هەبێت بیگرێتە بەر، هەر بۆیە دەیگووت واباشترە باپیرم حاجی نووری لە كارەنەشیاوانەی دایكم دەیكات ئاگاداربكەمەوە، بەڵام ئەوان خۆشیان لەناو هەزار و یەك كێشەو گرفتدان لە نێو كێشە و لەلایەك سەركەوتی كوڕیان دڵی بە كچێكەوەیە كەچی باپیرم رێگەنادات لەگەڵ ئەو كچە هاوسەرگیری بكات، بۆیە بەزۆری كچی پووری خۆی بۆ هێناوە و بەردەوام كێشەیان هەیە، هەروەها داپیریشم هیچ كاتێك باپیرمی بەدڵ نەبووە بۆیە هیچ كاتێكیش كێشەی ئەوانیش لەو تەمەندا تەواو نابێت.

خۆزگە باوكی دایكم مام احمد زیندوو بووایە خۆ تاوەكو ئەو لە ژیاندا مابوو دایكم نەیدەتوانی هیچ كارێكی خراپ بكات، كەچی ئەویش لە چانسی من و باوكم چەند مانگێك دەبێت مردووە، بەمردنی ئەو هەموو دەرگاكانی خراپەكاری بۆ دایكم كرایەوە، ناتوانم ئەو نهێنیە لای داپیرم مەكیە باس بكەم، ئەویش خۆی داماوەی هەر رۆژە و لەلای كەسێكە تەنانەت غەریبی كوڕی زۆر جار لەبەر چاوی ئێمە لەدایكی خۆی داوە، بۆیە هەموو كاتێك

داپیرم دووعای لێدەکات کوڕم خودا کۆرەت بکات، من کە چاوم نابینێت شتێك لەدەستم دەکەوێت بۆچی لێم دەدەی؟.

ئەویش دەڵێت خۆ تەنها من کوڕی تۆ نیم ئەی بۆ ناچیتە لای محمدی کوڕت ئەویش کوڕی تۆ نیە؟.

داپیرم دەڵێت با کوڕی منە بەڵام ئەویش دەرم دەکاتن و بەخێوم ناکات.

منیش بیر دەکەمەوە ئەی ئەویش دایك نیە بۆچی خودا ئەوی خۆشناوێت و دووعاکانی قبوڵناکات، تۆبڵێت لەلای خودا جیاوازی لەنێوان دایکەکاندا هەبێت؟، نەخێر هەرگیز شتی وانابێت، لەبەر ئەوەی تاوەکو ئێستا گوێم لەهیچ کەسێ نەبووە بڵێت خودا جیاوازی دەکات، بەڵام دڵنیاشم خودا هەقی دەکات و ڕۆژێك دێت دووعاکانی قبوڵ دەکات.

ئەگەرچی من هەموو جارێك بەدایکم دەڵێم داپیرم زۆر گوناهە هیچ کەسێك نیە پاکی بکاتەوە و بەخێوی بکات، بۆیە بابێتە ماڵی ئێمە من بەخێوی دەکەم و پاکی دەکەمەوە بەڵام دایکم زۆر بەتوندی بەرپەرچم دەداتەوە، لەبەر ئەوەی دەزانێت ئەگەر دایکی بێتەماڵی ئێمە ئەو مەرامە گڵاوانەی هەیەتی ناتوانێت بەدڵی خۆی پێی بگات.

ئیتر کچە بێنازەکە دوایی ئەوەی بەدرێژای ئەو ماوەیەی لە نەخۆشخانەدا مایەوە بیری لەو بابەتە کردەوە، لەکۆتایدا بڕیاریدا خۆی لەو ئازارەی ناخی رزگاربکات و هەرچی رووبدات هەموو شتێك بەباوکی بڵێت.

کەچی لە چانسی کچە بێنازەکەدا ئەوجارەش لەجەنگدا باوکی زۆر بە سەختی بریندار بوو، کە باوکی دوای گەڕانەوەی بۆ ماڵ هەردەیگووت خودا منی پاراست، جیهانی بێنازیش چۆن باوکە خودا تۆی لە مردن پاراست؟.

کچم کاتی من لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم لەسەنگەردا دانیشتبووین خودا مشکێکی نارد زۆر بێزاری کردم، هەرچەندە هاوڕێیەکانم گوتیان دە ئەو مشکە بکوژە...منیش دڵم

نەهات بیکوژم بۆیە بڕیارمدا شوێنەکە بەجێ بهێڵم،دوایی ئەوەی کەمێك دوورکەوتمەوە گوللە تۆپێك هات و هەموو هاوڕێیەکانمی مردن و منیش برینداربووم.

واتا باوکە گیان خودا تۆیی زۆر خۆش دەوێت بۆیە تۆ لەو ڕووداوە ڕزگار کرد... باوکە لەبەر ئەوەی خودا هێندە تۆی خۆش دەوێت دووعایەك بکە من بتوانم خۆڕاگربم، بتوانم ئەو نهێنیەی دڵم تەنگ دەکات لە دڵم دەری بکەم.

نهێنی چی کچم تۆ بەو منداڵیە چی هەیە دڵت تەنگ بکات؟،دەی ئەگەر شتێك هەیە بەباوکی خۆت بڵی.

باوکە گیان دەمەوێت پێت بڵێم...

لەوکاتەدا دایکی هاتە ژوورە و گوتی جیهان کچی شیرینم دەتوانیت بچیتە دەروە هەندێك کاری تایبەتم بەباوکت هەیە.

کچم تۆ چیت لەدڵی بوو دەی پێم بڵێ؟.

نانا هیچ باوکە هەرئەوەندە بوو دەمەوێت پێت بڵێم تۆم زۆر خۆش دەوێت.

کچی جوانم منیش تۆم زۆر خۆش دەوێت.

دەی کچم ئێستا بەجێمان بهێڵە بزانم دایکت چی دەوێت پێم بڵێ...

بڵێ شادی چیت دەوێت دەڵێ قسەیەکی گرنگت هەیە؟.

دەمەوێت پێت بڵێم ماڵی خالیدی دراوسێمان خۆت دەیان ناسیت هاتوون بۆ داواکردنی جیهان بۆ کوڕەکەیان شێرکۆ، خۆت دەزانی ئەوانیش ماڵێکی باش و دەوڵەمەندن کچەکەمان ئەگەر بچێتە لای ئەوان دڵنیام زۆر دڵخۆش دەبێت.

ئای!ژنەکە ئەوە تۆ ئاگات لەخۆتە چی دەڵێت؟، جیهان تازە تەمەنی نزیکەی دوانزە ساڵە ئەو چی لەبارەی ماڵ و مێرد دەزانێت جارێ زۆر منداڵە.

منداڵ منداڵی چی ئەی من تەمەنم سیانزە ساڵ نەبوو شووم بەتۆ کرد و ماڵیشم بەڕێوە دەبرد، لەکچەکە خۆی دەپرسم ئەگەر خۆی رازی بێت دەیدەین بەشوو ئەگەر رازی نەبێت نایدەین.

سعدالله ی داماو بێئاگا لەوەی کە خێزانەکەی لەگەڵ خالیدی دراوسێیان دەستی تێکەڵکردووە و ئەو پلانەیان داناوە بۆ ئەوەی زیاتر و ئاسانتر بە مەبەستە گڵاوەکانی خۆیان بگەن ئەو پلانەیان دارشتووە.

گووتی ئافرەت من چیم دەوێت تەنها دەمەوێت کچەکەم دڵخۆش بێت و ژیانێکی پڕ لەکامەرانی سەرفرازی بەڕێبکات.

سعدالله گیان بەخوا منیش هەر ئەو هیوایەتەم هەیە بۆ کچەکەمان بۆیە من خۆم قسەی لەگەڵ دەکەم تۆ هیچ خەمت نەبێت قابیلە من خراپی کچی خۆم بوێت.

ئیتر دوایی باشتربوونی برینەکی سعدالله جارێکی تر بەناچاری بۆ بەرەکانی جەنگ گەڕایەوە.

جیهان کاتێك چاوی بەباوکی کەوت بۆ بەرەکانی جەنگ دەگەڕێتەوە، هەستی بەوە دەکرد ئیتر ئازار و ئەشکەنجەکانی دەست پێدەکاتەوە، بۆیە دەیگوت ئازار و ئەشکەنجەکانی دایکم بۆ من گەلێك زۆرە بەڵام هیچ کام لە ئازارەکانی ئەو ناکاتە ماڵئاوایکردنی باوکم.

کچە بێنازەکە دوایی رۆیشتنی باوکی وەك هەمووجارێك خۆی بۆ دەستپێکردنی ئازارەکانی دایکی ئامادەکرد، بەڵام ئەمجارە زۆر لەجاران جیاوازتر دایکی مامەڵەی لەگەڵ جیهان دەست پێکرد، لەبەر ئەوەی هەمووکاتێك لەدوایی رۆیشتنی باوکی شادی دەستی

دەکردە دارێك تاوەکو ماندوو دەبوو لە جیهانی دەدا و پێدەگووت من هیچ باوکتم خۆشناوێت لەبەر ئەوەی باوکت هێندە تۆی خۆش دەوێت من تۆشم خۆش ناوێت.

لەبەر ئەوەی ئەمجارە پلانێکی گلاۆی هەبوو کچە بێنازەکەی هەر بە گیانەکەی دایە بانگ دەکرد، لەوکاتەدا شادی بۆ جیهان بووبە فریشتەیەك کە هەر کەسێك ئەوی ببینیبوایە هیوای دەخواست دایکێکی وەك شادی هەبێت.

کچە بێنازەکە زۆری لەلاسەیر بوو دوو رۆژ بەسەر رۆیشتنی باوکی تێپەڕیووە دایکی هیچ ئازارێکی نەداوە، بەڵکو بگرە زۆریش لەگەڵی باش بووە...تەنانەت نەیدەهێشت هیچ کارێکیش ئەنجامبدات، هەرکارێکیشی پێدەکات چەندین جار بە گیان بانگی دەکات، کچە بێنازەکەش بیری لەوە دەکردەوە تۆ بڵێت دووعاکانم قبوڵبووبێت خودا دایکمی بۆم باش کردبێت...

دوایی ئەوە رۆژێك شادی بانگی جیهان دەکات کچی شرینم تا لای دایکی خۆت دێت کاریکم پێتە.

ئەی ئەوە دەبێ دایکە من بێت بەمجۆرە بانگی من دەکات، خۆزگە دایکم هەموو کاتێك هەروا دەبوو، ئەوکات خۆم دەمزانی چۆن دەبێت خزمەتی بکەم، هەرشتێکی بویستایە ئەگەر گیانیشم بێت دەبووایە پێیبدەم.

گووتم فەرموو دایکە گیان چ کارێکت بەمن هەیە؟، بەڵام ئەو گیانە گووتم هەرگیز لەناخی دڵمەوە دەرنەچوو چونکە دەگووت چۆن دەبێت دایکم خیانەت لەباوکم بکات؟.

گووتی کچی شیرینم بەشیر کوڕەکەی خالیدی دراوسێمانت بینیوە، کوڕێکی زۆر جوان و رێك و پێکە، خالید بەمنی گووتووە تەمایی ئەویان هەیە تۆ بۆ کوڕەکەی خۆیان خوازبێنی بکەن، منیش بەهۆی ئەوەی لەوان باشتر بۆ تۆ نابینمەوە پێم گووتون بێنە داوات، بۆیە نامەوێت لەلای تۆوەش هیچ کێشەیەك دروست بکەیت.

من کە گوێم لە ناوی ئەو دراوسێیە پیسەمان بوو خەریك بوو ببورێمەوە، بەلاّم بۆ ئەوەی دایکم هەست نەکات من بە نێوانی ئەوانم زانیوە زۆر خۆم تێك نەداو گووتم ئاخەر دایکە من تەمەنم زۆر بچووکە و نامەوێت لەگەڵ هیچ کەسێك هاوسەرگیری بکەم، تەنانەت من لە مانای هاوسەرگیری هەر تێناگەم.

زۆر بەتوڕەییەوە گووتی وسبە وس دەم درێژی زیاتر نەکەیت من پێت دەڵێم مێرد بەکێ دەکەیت و چ کاتێك دەیکەیت، سەبارەت بەو بابەتە قسەم لەگەڵ باوکت کردووە ئەویش رازییبووە مێرد بەو کوڕە بکەیت، منیش نامەوێت گوێم لە هیچ قسە و پێشنیارێکی تۆ بێت تەنها بۆ ئەوە پێم گووتی کە لەو رۆژانە دێنە ماڵمان پێویستە خۆت بۆ ئەو بابەتە ئامادەبکەیت.

نەخێر من هەرگیز شووناکەم جارێ...

ئیتر دوایی ئەوە دایکم بەدار وەك هەمیشە کەوتە سەرگیانی ناسکم تا ئەو کاتەی خۆی ماندوو بوو بەس بەدار لە سەر و سینگمی دا، دوایی ئەوەش منی خستە ژوورەوە و بۆ ماوەی دوو رۆژ هیچ نان و ئاوێکی نەدامی، بەلاّم کاتێ زانی ئەو رەفتارەی ئەو سوودی نابێت و رەنگە هەتا دەمرم رازی نەبم، بۆیە بیری لە رێگایەکی تر کردووە و خۆی خالیدی دراوسێمان هاتە ژوورەوە و گووتیان ئەگەر تۆ رازی نەبیت شوو بکەیت ئەوا ئێستا بانگی بەشیر دەکەم دەست درێژی سکسی بکاتە سەرت و دوایی دەڵێن تۆ پێوەندیت لەگەڵ کوڕی تر هەیە، بەمشێوەیە تۆش جگەلەوەی دەکوژرێت باوکیشت کە بەتۆوە سەربەرزە سەری شۆڕدەبێت تالەژیاندا مابێت نەفرەتت لێدەکات.

گووتم دایکە لەبەر خاتری خودا وازم لێبهێنن من زۆر بچووکم هیچ لەبارەی خێزانداری و هاوسەرگیری نازانم، تۆ چ جۆرە دایکێکی؟، چۆن دڵت دێت وا لەکچی خۆت بکەیت؟.

شادی گووتی بەسە بەس دەست لە فیکە فیك هەڵگرە رازیت شووبکەیت بەسەر بەرزی دەچیتە ماڵی مێردی خۆت، ئەگەر رازی نەبیت بەسەر شۆڕی دەچیتە ژێر خاك

تەنانەت باوکە گێژەکەشت ڕەنگە بەرگە نەگرێت و بمرێت، ئێستا تاوەکو بەیانی بیربکەوە ئەمە دواین هەلّی تۆیە لەژیاندا.

ئیتر بینیم دایکم وەك ئەوە هەر هیچ نەبوو بێ لەگەڵ خالیدی دراوسێمان بەتەنیا چوویە ژوورەکەی تر، لەگەڵ ئەو ئازارەی من هەمبوو کەچی ئەو لەگەڵ خالید خەریکی کەیف و سەفایی خۆیی بوو.

ئەوەشەوە تاوەکو بەیانی کچە بێنازەکە هەر لەبیری ئەوەدابوو چۆن خۆی لەو ڕووداوە ڕزگاربکات، زۆر دەپاڕایەوە لە خودا کە گیانم بکێشێت و هیچ شتێکم نێتەوە سەری، ژوورێکی تاریك و ناخۆش تەنها تروسکێکی مانگ ڕووناکیەکەی خۆی دەکات بەژوورەکەیدا، هیچ ئومێدێك لە ژیانی ئەو و ژوورەتاریکەکەدا بەدی نەدەکرا، هەرچەندە دەیویست خۆی بکوژێت بەلاّم لەو ژوورەدا هیچ شتێك نەبوو گیانی ئەو ئاسودەبکات و کۆتایی بەژیانی بهێنێت.

هەرچەندە تاوەکو تروسەکەکانی خۆر بەدیارکەوت چەندین بیری جۆراو جۆری بۆ هات بەلاّم هیچ کامێك نەدەبووە هۆکاری ڕزگارکردنی کچە بێنازەکە، بۆیە بەناچاری بڕیاری ئەوەی دا کە شوو بە کوڕەی دراوسێیەکەیان بکات.

ئیتر لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم تروسکی خۆر شادی و خالید لە ژوورەی کە بەدرێژایی شەوەکە کەیف و سەفایی خۆیان تیادا بەسەر بردبوو هاتنە درەوە و خێرا بۆ ژوورەکەی جیهان بەڕێکەوتن، لەگەڵ دەرگا کردنەوە جیهان زۆر بەپەشۆکاوی سەیری دەکردن.

بەیەکەوە گووتیان ها چیت کردەوە بیرت لێکردەوە چاوەڕێی وەلاّمی تۆین زیاتر ڕاناووەستین ئەگەر ڕازی نیت تاوەکە بانگی بەشیر بکەین چی پێ خۆشە لەگەڵت بکات.

لەوکاتەدا خالید بەدەنگێکی بەرز گووتی تۆ بۆچی رازی نیت؟، ئەوەتا ئەگەر رازی بیت وەك چۆن دایکت شەوێکی خۆشی لە نێو باوەشی من بەسەر برد ئاواش تۆ لە نێو باوەشی کوڕەکەمدا شەو گەلێکی خۆش بەڕێدەکەیت.

کاتێ گوێم لەوە بوو خەریك بوو شێت ببم ئاخەر دایکم چۆن دەتوانێت خیانەت لە باوکم بکات؟، باوکم کەسێکی زۆرباش و چاکە بۆ ئەو...منیش ناچارم رازی بم بۆ ئەوەی هەم باوکم بەهۆی منەوە ئابرووی نەچێت هەمیش باوکم زۆر خۆش دەوێت نامەوێت شتێکی بەسەر بێت، لەبەر ئەو بەدڵێکی زۆر سارد گووتم ناچارم رازیم.

دوایی ئەوە شادی و خالید گوێبیستی ئەوە بوون هێندە دڵخۆش بوو هاواریان دەرکرد و باوەشی یەکتر و ماچی یەکتریان دەکرد، منیش دەمگوو ئەوە چ داکێکە بۆ خۆشی ژیانی خۆی ژیانی کچەکەی دەفەوتێنێ.

ئیتر دایکم دەیویست کارەکانی هاوسەرگیری زۆر بەخێرای بکرێت، بۆ ئەوەی لەدوایی ئەوە زۆر بەئاسانی خۆی لە خالید نزیك بکاتەوە، ئەگەرچی لە ئێستا داپیرم مەکیە کۆچی دوایی کرد، لەبیری خۆم گۆتم دەی بەهۆیی ئەوەوە کەمێك کارەکە دوادەکەوێت، بەلاَم دایکم بەهیچ شێوەیەك رێگەی ئەوەی نەدا کارەکان دوابکەوێت، رێك لەدوایی پرسەی داپیرم نامەیەکی بۆ باوکم نارد گووتی ئەوە جیهان زۆری پێخۆشە مێرد بەو کوڕەبکات بۆیە مۆڵەت وەربگرەوە بەزووترین کات وەرەوە.

من چێم پێخۆشە لەوکاتەدا لەمردن زیاتر هیچی ترم پێخۆش نەبوو، دەمگووت ئایی خودایە جگە لەتۆ کەسی تر ئاگاداری ئەو دڵە بچوکە نیە یا ئەو دڵە راگبرە یاخود کەمێك ئازارەکانی کەم بکە، باشە چۆن دەبێت من لەگەڵ کوڕی ئەو کەسە هاوسەرگیری بکەم کە خیانەت بەباوکم و ئێمە دەکات؟.

دایکم زۆر بە پەلە بوو لە جێبەجێکردی ئەو کارە بەرلەوەی باوکم بگەڕێتەوە هەموو کارەکانی زێڕو جل و بەرگی ڕێکخست تەنها ئەوە مایەوە باوکم لە بەرەکانی شەڕ مۆڵەت بدرێت هەموو شتێك تەواو ببێت.

ئیتر دوایی ئەوەی باوکم مۆڵەت درا و گەڕایەوە ماڵەوە هێشتا ماندوویەتی ڕێگای لە لەشی دەرنەکردبوو، دایکم بەزووترین کات ڕۆژی مارەکردنی دیاریکرد.

دایکم بەباوکمی  گووت با مارەکردنەکە تەواو بێت بۆ گواستنەوە هیچ پێویست ناکات تۆ لێرە بیت یاخود لێرە نەبیت ئەوەیان زیاتر کاری ژنەکانە نەوەك پیاوەکان.

باوکم گووتی زۆرباشە من خۆم بۆ کاتێکی زۆر مۆڵەتیان نەداوم جگەلەوەش ئەمجارەیان ئەگەر بگەڕێمەوە شەر زۆر زوو مۆڵەتم نادەن بگەڕێمەوە بۆیە کاری خێریش چەند زووتر بکرێت باشترە منیش حەزناکەم ئەو کچە بە مارەکراوی زۆر بمێنێتەوە.

لەوکاتەدا دایکم نەیدەهێشت زۆر لە باوکم نزیك ببمەوە نەوەکو شتێك بدرکێنم و باسی کارە چەپەڵەکانی بکەم، منیش نازانم چۆن ئەو کارەی ئەو ئاشکرا بکەم؟، زۆر دەترسام لەبەرئەوەی ئەو کارانەی ئەوە مەبەستی بوو زۆر بەخێرایی بەرەو پێش دەچوو،لەخەیاڵی خۆم وام لێکدەدایەوە کە خودا ئەوی زۆر خۆش دەوێت چونکە ئەو دایکە، هەر لەبەر ئەوەشە کارەکانی ئەو زۆر بەخێرایی بەرەو پێشەوە دەچێت، جاربەجارێکیش دەمگووت تۆ بڵێت شەیتان لە کارەکانی یارمەتی نەدات، نەخێر وانازانم وابێت لەبەر ئەوەی خودا دەڵێت نابێت هیچ بەرپەرچێکی خراپی دایکەکان بدرێتەوە، تەنانەت ئەگەر بەدایك و باوکتان بڵێ ئۆف دەتانخاتە نێو ئاگری جەهەنەمەوە، لەبەر ئەوە ناتوانم هیچ قسەیەکیش بکەم.

ئەوەی زیاتر ئازاری منی دەدا ئەوە بوو دایکەکانی ترم دەبینی لەگەڵ کچەکانیان بەمشێوەیە نەبوون، ئەوەتا دایکی سارای دراوسێمان کە بەتەمەن ساڵێکیش لە من گەورەترە ناهێڵێت کچەکەی هیچ ماندوو ببێت، ئیتر من خەریکە تێك بچم نازانم ئافرەت

فریشتەیە یاخود شەیتانە، لەبەر ئەوەی دایکی ئەویش وەك دایکی من ئافرەتە ئەی بۆ ئەو وانیە؟.

ئیتر بەهەرجۆرێك بوو مارەبڕینی من وەك رەشەبا بەخێرایی هات و رۆیشت، من خۆشم نەمزانی دایکم چۆن چۆنی هەمووکارەکانی بەو خێراییە لە ڕادەبەدەرە بەڕێکرد؟.

لەکاتی مارەکردنی مندا خەڵك بەهۆی منە دڵی خۆشە شیرینی دەخوات کەچی منیش خەم و خەفەتی ژەهراویم دەخواردەوە، ئەوەی ئازاری منی زیاتر کرد خالید بوو کە دەستی لەملی باوکم دەکرد دەیگووت بابەیەکەوە وێنەیەك بگرین بۆئەوەی ئەو رۆژە خۆشەمان بۆ یادگاری بمێنێتەوە، ئای ئەگەر باوکم دەزانێت ئەوە مارە چۆن لە ژێرەوە پێوەدەدات هەرگیز بۆیەك چرکەش دەستی لەملی نەدەکرد، هەرکە زانیم باوکم بانگی دایکمی کرد دەتۆش وەرە ئافرەت باتۆش لەو وێنەیە لەگەڵ دابیت، ئیتر هەردوو لای باوکم بە دوو ماری ژەهراوی پیس دەوردرا نەمدەزانی چی بکەم فرمێسکی چاوەکانم وەك ئاو دەهاتە خوارەوە ئەو خەڵکانی دەوروپشتم دەیانگووت فرمێسکی خۆشی دەبارێنێت، دەمگووت ئای کە چ فرمێسکێکی خۆشییە ئێوەهەستی پێناکەن.

زۆر جار لەدڵی خۆم دەمگووت ئاخەر خالید خۆ تۆ خێزانی خۆت هەیە بۆچی خیانەت لە ئەو و باوکم دەکەیت، نازانم بۆچی دەبێت مرۆڤەکان هێندە پیس بن؟.

کەچی لەگەڵ ئەوە هەموو ئازارەی هەمە کەسەیری نێو چاوە میهرەبانەکانی باوکم دەکەم ناتوانم کارێك بکەم ئەو بە هۆیەوە دڵ تەنگ بێت، چاوەکانی زۆر زەردو جوانن میهرەبانی لێدەبارێت خودایە چۆن کاری وادەبێت ئەها ئەو کەسەی کە خیانەت لەباوکم دەکات لەتەکی دێت و دەچێت دەستی لە ملی دەکات.

ئەو رۆژە رەشەی ژیانم هەرچۆنێك بوو بەدڵخۆش و هەڵپەڕینی خەڵك و شەکراو خواردنەوە ئەوان و فرمێسکە بێنازەکانم و ژەهر خواردنی من کۆتایی پێهات و تەواو بوو.

دوایی ئەوە باوکم بەناچاری گەڕایەوە بەرەکانی جەنگ و ئەوەش دەرگای بۆ دایکم کردەوە کە زیاتر هەوڵی ئەوە بدات خۆی لە خالید نزیك بکاتەوە، ئیتر دوایی مارە بڕینی من کارەکە بۆ هەردوو کیان زۆر ئاسانتربوو، ئێستا دەتوانن زۆر بەئاسانی بەبێ ئەوە یەك قسەش بێتەوە سەرئەوان هەرچی لە هەواو هەوەسی خۆیان هەیە ئەنجامی بدەن.

هەفتەیەك تێنەپەڕی بەسەر مارەبڕینی من دایکم خێرا کاروباری گواستنەوەکەمی ڕێکخست و من گواسترامەوە لای ئەو کوڕەی کە بەهیچ شێوەیەك بەدڵم نەبووە شوو بەو بکەم، جگەلەوەش دایکی کورەکە هەستی بەوە کردبوو کە دایکم خۆی زۆر لە مێردەکەی ئەو نزیك کردۆتەوە بۆیە ئەویش رازی نەبوو بەو هاوسەرگیرییەی من.

ئیتر بیرم لەوە کردەوە کە چۆن تۆڵەی خۆم لەدایکم بکەمەوە بۆیە لەکەم رۆژی گواستنەوەمان خۆم بەبەردەستی بەشیر نەدا، ئەویش هێندە دڵڕەقی زۆر خراپی کەوتە کوتاو لێدانم، بەڵام من لەگەڵ ئەوەی تەمەنم بچوك بوو بەرگەی هیچم نەدەگرت کەچی ڕێگەم نەدا تۆزێکیش لێم نزیك ببێتەوە.

یەك هەفتە بەو شێوەیە بەسەر ژیانمان تێپەڕی بەردەوام لەژووری نووستنی ئێمە شەڕوئاژاوە بوو، بۆیە ئەو کوڕە دوایی ئەوەی بێزاربوو لە لێدان و تێهەڵدانم گووتی هیچ کەڵکی نیە بەیانی تۆ رەوانی ماڵی دایکت دەکەمەوە.

دوایی ئەوەی بەوە هەموو برینەی جەستەمەوە گەڕامەوە ماڵەوە، دایکم سەرەتا وایزانی بەسەردانی گەڕاومەتە ماڵەوە بۆیە زۆر بەجوانی پێشوازی لێکردم.

منیش لای شەرمینی خوشکم کە بەدووساڵ لەخۆم بچوکتربوو دەردە دڵی خۆم کردوو و گووتم خوشکی شیرینم من تاوەکو ئێستا هەرکچم نەمهێشتووە ئەوە کوڕە نزیکم بکەوێتەوە، ئەگەرچی ئەوە هەموو شەوێك زۆرم لێدەدات بەڵام تاوکو ئێستا خۆم بەدەستەوە نەداوە، نازانم چی بکەم پەنا بۆ کوێ ببەم خۆم دەکوژم بەڵام دەترسم باوکیشم لە داخی من بمرێت، لەبەر ئەوە ئەوکارەناکەم.

گووتی نانا خوشکم خۆکوشتنی چی ئەو کارە نەکەی باوکم راست شێت دەبێت، بەقسەی من دەکەی هەموو شتێك بۆ دایکم باس بکە و راستیەکەی پێبلێ بەڵکو ئەو دلی نەرم بێت شتێکت بۆبکات.

گووتم زۆر باشە هەموو شتێك بەدایکم دەڵێم کە من نامەوێت لەگەڵ ئەو کوڕە بژیم هەمیش ئەو کەسێکی تری لە دڵە، دەیەوێت من تێك بدات و دواتر تەلاقم بدات من زۆر دڵنیام لەوەی ئەو کارە دەکات.

دوایی ئەوەی هەموو جورئەتی خۆن کۆکردەوە و چوومە لای دایکم، گووتم دایکە گیان کارێکی زۆر گرنگم پێتە.

فەرموو کچی شیرینم چیت لە نێو دڵدایە بەدایکی خۆت بلێ.

دایکە من بە هیچ شێوەیەك حەزم نەکردووە مێرد بکەم بەتایبەتی بەو کوڕە، دایکە گیان لێت دەپاڕێمەوە کەمێك لەگەڵ من بەزەییبە، من تاوەکو ئێستا خۆم بەدەستەوە نەداوە هەتاوەکو ئێستاش من هەرکچم.

ئەوە تۆ چی دەڵێت ئەوە شێت بوویت، من وامزانی تۆ بۆ سەردانی ئێمە هاتوویتەوە ئێرە، دەی هەر ئێستا خۆت ئامادەبکە و بگەڕێوە نێو ماڵ و مێردی خۆت کێ وەکو تۆ بە چانسە مێردێکی وەك ئەو کوڕە دەوڵەمەندەی بەدەست دەکەوێت.

نەخێر دایکە من نامەوێت بگەڕێمەوە ئەو ماڵە لەبەر خاتری خودا وازم لێبێنن من نامەوێت ژیانم بەهۆی ئەو کوڕە و لەکیس بچێت.

دوایی ئەوە وەك هەموو جارێك دایکم دارەکەی دەست دایەوە و تاوەکو توانا لەگیانی دابوو لێمیدا، بەجۆرێك لێمیدا توانایی ئەوەم نەما بلێم بەسە لێم مەدە.

ئیتر دوایی ئەوەی توانایی هیچم نەما من بەزۆری هەڵگرت و بۆ ماڵی ئەو کوڕەی کە لەلای من وەك دڕندەیەك وابوو بردەوە، گووتی ئەوە ئیتر کچی ئێوەیە هەرچییەك بێت نامەوێت بگەڕێتەوە ماڵەوە، چۆن بەجلی سپی لەماڵ دەرچووە ئاواش بەجلی سپیی دەبێ بێتەوە ماڵەوە.

کاتێ ئەوان زیانیان تاوەکو ئێستا من کچم و نەمهێشتووە کوڕەکەی ئەوان دەستم لێبدات، زۆر توڕە بوون منیان لە ژوورێك بەند کرد تاوەکو مامی کوڕەکە هات.

گووتی کچی بێکەڵك دەتەوێت ئابڕووی ئێمە ببەیت، دایکت بە هەموو شێوەیەك تۆی رادەستی ئێمە کردووە تاوەکو تۆ لەگەڵ کوڕەکەمان نەخەویت رێگەیەکی زیندوو مانەوەت نیە.

کوڕەکە و مامی منیان بردە ژووری نووستن و تا توانایان هەبوو کەوتنە لێدانم، منیش لەگەڵ ئەوەی زۆر بچووك بووم بەهۆی ئیشکردنی زۆرمەوە هیچ توانایەکم نەمابوو، ئیتر مامی بەشیر گووتی ئێستا هیچ توانایەکی نیە تۆ لێرەبە و کارەکەی خۆت تەواو بکە، بۆ ئەوەی کارەکەی خۆت بەئاسانی تەواو بکەیت ئەوا دەستی دەبەستمەوە.

ئیتر لەدوایی ئەوە ئەوەی نەمدەویست روویدا شتێکم بەسەر هات تاوەکو لەژیاندا مابێتم ناتوانم لەبیری بکەم، ژیانم لەگەڵ ئەو کوڕە هەربەو شێوەیە بەردەوام بوو هەموو رۆژێك لێدان و جنێوی ناشرین.

هەروەها دایکی کوڕەکەش بە هۆی ئەوەی هەستی بە پێوەندنییەکی نێوان دایکم و مێردەکەی کردبوو هەرچۆنێك بوو دەیوست من لەو ماڵە بەدەربنێت.

بەمشێوەیە هەموو رۆژێك شەڕی خالید و ژنەکەی بەردەوام بوو، هەرشەڕکیش لەماڵەوە دەکرا منی تیادا تاوانبار دەبوو، لەوەش ناخۆشتر ئەوە بوو کە من هەرکاتێك

لەگەڵ ئەو کوڕە دەنووستم وەك ئەوە وابوو بە زۆر سکسم لەگەڵ دەکات، ئەو لێدانە زۆرەی من بۆم دەکرا باوەڕ ناکەم هیچ کەسێك بۆی کرابێت.

ژیانم بەو شێوەیە بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی خالید تەواو لە هەواو ئارەزووکانی خۆی لەگەڵ دایکم تێربوو هێواش هێواش خۆی لە دایکم دوور دەخستەوە، جگەلەوەش ئافرەتێکی تری دۆزییەوە، ئەمجارە کاتەکانی خۆی لەگەڵ ئەو ژنەی تر بەسەردەبرد.

کاتێ دایکم هەستی بەوە کرد زۆر توڕە بوو کە ئەو پیاوە ئیتر نە هەست و سۆزێکی بۆ ئەو هەیە نەگرنگیشی پێدەدات، بۆیە وەك تۆڵەیەك لەوان بە هەموو شێوەیەك کاری بۆ ئەوە دەکرد من لەلای ئەو کوڕە بگەڕێنێتەوە، لەوکاتەشدا سعدالله لەبەرەکانی جەنگ مۆڵەت دەدرێت و دەگەڕێتەوە ماڵەوە.

دوایی گەڕانەوە شادی بۆ ئەوە تۆڵەی خۆی لە خالید بکاتەوە هەموو خراپییەکانی بەشیر بە سعدالله رادەگەیەنێت بۆ ئەوەی بچێت بیهێنێتەوە، سعدالله زۆر توڕە دەبێت بۆیە بەرلەوەی ماندوویەتی رێگا و جەنگی لە گیان دەرچێت بڕیاردەدات بەدوایی کچە خۆشەویستەکەیدا بچێت و بیهێنێتەوە.

کاتێ دەگاتە ماڵی کچەکەی سەیر دەکات لەو کاتەوەی کچەکەی نەبینیوە هێندە لاواز بووە توانای رۆیشتنی نەماوە، کە سعدالله بەو جۆرە چاوی بەکچە شیرنەکەی دەکەوێت خۆی بۆ ناگیردرێت و دەست بەگریان دەکات، دوایی یەکتر لەباوەشکردن و ماچ کردنی یەکتر دەڵێت کچی شیرینم بمبەخشە کە من رازی بووم لەو تەمەندا تۆ بە شووبدرێت دەزانم لەو ماوەیەدا زۆر ئازاردراویت خۆت ئامادەبکە لەمەودوا تۆ لەو ماڵەدا ناژیت ئێرە شوێنی ژیانی تۆ نیە.

من لەدوایی بەشوودانی تۆ زۆر نامەم بۆ دایکت دەنارد لە هەواڵی تۆم دەپرسی، کەچی ئەو هەمووجارێك دەیگووت جیهان زۆر زۆر دڵخۆشە لەگەڵ مێردەکەی و باروودۆخی زۆرباشە، ئەمڕۆ بەمن دەڵێت کە تۆ لە نێو ئەو ئازار و لێدانەدایت.

منیش لە دڵی خۆم گوتم خودا پاداشتی خالید بداتەوە کە وازی لەتۆ هێناو بەدوایی کەسێکی تر کەوت، ئەگەرنا دایکم هەرگیز ئەم جۆرە ئافرەتە نیە قسەی لەو جۆرە بکات.

گەڕامەوە ماڵ هێندە دڵخۆش نەبوو هیچ کەسێك بیزانێت، دەمگووت لەمەودا دایکم ناتوانێت بە ئاسانی خیانەت لە باوکم بکات، ئەگەرچی ژیانی من لە ناچوو بەلام دایکم ناتوانێت بە بیانووی من هیچ کاتێکی تر بچێتە ماڵی خالید.

دووبارە ژیانم لەگەڵ گەورەترین شەیتانی ژیانم دەستی پێکردەوە، لەوکاتەشدا هەستم بەوە دەکرد باوکم بەهۆی بەشوودانی من بەهەڵە زۆر غەمباربوو، چەندین جار کە بۆ شەڕ دەچوو دووعایی دەکرد زۆر زوو بگەڕێتەوە بەڵام ئەجارە هەر دووعایی ئەوەی دەکرد خودا شەهید بوونی بە قسمەت بکات.

زۆر دڵم بە گوێبیست بوونی ئەو ووتانەی باوکم تەنگ دەبوو، بەتایبەتی ئەوکاتەی باوکم جارێکی تر ماڵەوەی بۆ بەرەکانی جەنگ بەجێهێشت، ئەمجارەیان باوکم بە جۆرێك منی لە باوەش کرد و گووشی وەك ئەوەی پێم بڵێت کچم تۆ ئاگات لە خۆت بێت جارێکی تر من تۆ نابینمەوە، جارێکی تر ناتوانم تۆ لەباوەش بگرمەوە، لەوکاتەدا بینیم فرمێسکەکانی ئەوەم پێدەڵێت ناتوانم جارێکی تر تۆ ببینمەوە.

گومانەکانی من راست دەرچوو ئەمجارەیان بۆ کۆتا جار توانیم باوکم لە باوەش بگرم، بۆ کۆتاجار چانسی ئەوەم هەبوو چاوە میهرەبانەکانی ببینم، لەکۆتا شەڕی نێوان عیراق و ئێران باوکم شەهیدکرا.

بەمردنی باوکم ژیانی ئێمە تەواو پێچەوانە بوویەوە، ئەو کەتاکە پشت و پەنایی من بوو لەسەر زەوی ئەویشم لەدەستدا، دایکم هیچ کاتێك هێندە خەفەتبار نەبوو بە لەدەستدانی باوکم لەبەر ئەوەی دایکم هەرگیز باوکمی خۆش نەویستووە تاوەکو بۆی خەمباربێت.

ساڵێك بەسەر مردنی باوكم تێپەڕی خودا ژیانێكی نوێی كردە بەشی من ئەویش ئەوە بوو كە كوڕی پووری باوكم هاتە داوام وویستی شووی پێبكەم، بەڕاستی تەها كوڕێكی زۆر جوان و رێك و پێك بوو، بۆیە كاتێ لەگەڵ دایكی هاتنەماڵمان نەمتوانی بڵێم شووی پێناكەم، ئەگەرچی تەمەنم زۆر بچووك بوو بەڵام هەرچۆنێك بوو دەموویست لە دەستی ئەو ئازارو ئەشكەنجەدانی دایكم رزگارم ببێت، بەتایبەتی لەدوایی مردنی باوكم ئازار و ئەشكەنجەكانی زۆر زیاتر ببوو، بۆیە هەرچۆنێك بوو بڕیاری ئەوەم دا شوو بە تەها بكەم.

لەرۆژی مارەكردنمدا ئەمجارە بە پێچەوانەی جاری یەكەم زۆر دڵخۆش بووم، ئەو خۆشیەی من بەردەوام نەبوو تا ئەو كاتەی باپیرم حاجی نووری هات و بەماڵی تەهای گووتی ئێمە بە بەلاش كچ نادەینە ئێوە یاخود ئێوەش كچێك لە كوڕێكی ئێمە مارەدەكەن یاخود ئەو مارەكردنە نابێت ئەنجامبدرێت.

برای تەها كە ناوی حوسێن بوو بۆ ئەوەی كارەكە تێك نەچێت گووتی هێلین كچە یەك ساڵانەكەم لە علی برای جیهان مارەدەكەین، ئەوكات دەكات ئێمەش كچێكمان بە ئێوە داوە.

ئابەم شێوەیە كێشەی ئەوجارە مارەكردنی من كۆتایی هات، بەڵام ئەوە كۆتا كێشەی ژیانی من نەبوو، دایكی هێلین كەناوی حەبیبە بوو بە هۆی ئەوەی كچەكەی لە پێناو من مارەییبڕا زۆر رقی منی لە دڵ گرت و بەردەوام دەیویست تۆڵەی خۆی لە من بكاتەوە، ئەویش بەتەمەن زۆر لە من گەورەتر بوو زۆر كاری ئەنجامدەدا وامدەزانی لەبەرژەوەندی منە ئەو كارە دەكات كەچی دواتر پلانە شەیتانییەكانی بەدیاردەكەوت وئازارەكەی و لێدانەكەی بۆ من بوو.

هەمووجارێك هاواری ئەوەم دەكرد خودایە من تاوەكو لەدەست شەیتانێك رزگارم بوو زۆر پاڕامەوە كەچی ئێستا شەیتانێكی گەورەترم لێپەیدابوو، كە جگەلەخۆی هەموو رۆژێك حوسێن و مێردەكەمی هاندەدا لێمبدەن، تەنانەت دایكی تەها كەناوی موعتەبەر

بوو زۆر رقی منی لەدڵ دەگرت و زۆر جنێو لێدانی بۆم دەکرد، تەنانەت من وام دەهاتە بەرچاو کە ژیان هەربۆ خۆی وایە دەبێت تاوەکو دەمرم گەورەکان لێمبدن بەبێ ئەوەی هەڵەیەکیشم هەبێت.

زۆرجار ئازار و ناخۆشی زۆری بۆ دەهێنام کە بگەڕێمەوە ماڵی باوکم، بەڵام کامە ماڵی باوکم لەدوایی شووکردنی من دایکیشم مێردی بە پیاوێك کردن ناوی قادر بوو، ئیتر هەموو منداڵەکانی لەسەر کەس و کاری ماڵی باپیرم و مامەکانم بەجێهێشت، تەنانەت بەو کارەشی نەوەستا هەڵسا خانووەکە فرۆشت و پارەکەی لەگەڵ خۆیدا برد، جگەلەوەش حکومەتی ئەکات هەرکەسێك لە بەرەکانی جەنگ شەهیدبووایە سەیارەیەکی باشی پێدەدا دایکم پارەی سەیارەکەشی بۆ خۆی برد و ئیتر خوشك و براکانم کەوتنە خانووی کرێ و کارکردن و دەرۆزەکردنەوە.

شەرمین خەریکی کاری ماڵەوە و بەخێوکردنی علی و کاروان بوو،شەوین کەئەویش لە تەمەن زۆر گەورە نەبوو قژی وەك کوڕان کورت کردبوویەوە و جلی کوڕانی لەبەر دەکرد بۆ ئەوەی کەس نەزانێت کە ئەو کچە سێنییەکی لەسەر سەری دادەنا گولەبەرۆژەی دەفرۆشت.

شیرینیش لەگەڵ داپیرم دەچوون بۆ ماڵە دەوڵەمەندەکان زەکات و پارەی سەدەقەیان کۆدەکردەوە، بەڵام هەموو جارێك داپیرم وەك ئافرەتێکی شەیتان کە پارەکەی بەناوی ئەو منداڵە هەتیوانە کۆدەکردەوە نیوەی زیاتری بۆ منداڵی کوڕەکانی تر دەبرد، نازانم بۆچی ئافرەتەکان دەبێت وەك شەیتان وابن، من کە بچووك بووم هەروام دەزانی پیاو زۆردار و ستەم کارە کەچی ئێستا دەبینم ئافرەتەکان زۆر خراپترن.

هێرشی براشم کە لەتەمەن زۆر گەورە نەبوو لەگەڵ نورەدینی مام لە کۆنە فرۆشی کاری دەکرد.

تەهای مێردم لەگەڵ من زۆر باشبوو تەنانەت زۆرجار یارمەتی خوشك و براكانمیشی دەدا، بەڵام بەهۆی ئەوەی تەها دەكەوتە ژێركاریگەری ووتەكانی دایك و براكانی ئەو كات لەمن تورە دەبوو.

جگەلەوەش تەها دوو خوشكی بەناوەكانی (فاتیمە و گوڵنان)هەبوو، ئەگەرچی ئەوان مێردیان كردبوو بەڵام بەهۆی ئەوەی دایكی من مێردی كردبوویەوە هیچ خۆشەویستییەكیان بۆ من نەبوو لەوەش زیاتر بگرە زۆر منیان ئازار دەدا و بەردەوام بە هۆی دایكمەوە قسەی نەشیاویان پێدەگوتم.

من بەهەموو باروو دۆخێكی ژیانم رازی بوو خۆم لەگەڵ هەموو ناخۆشییەكان رادەهێنا و تەنانەت لەو ناخۆشیانە كە خودا بۆمی دیاریكردبوو راهاتبووم، بەو باروو دۆخەوە ساڵ و نیوێك بەسەر هاوسەرگیرم تێپەری من هیچ منداڵێكم نەبوو، بۆیە دایكی تەها و خوشك و براكانی دەرگایەكی تریان بۆ كرایەوە تاوەكو سەرزەنشتم بكەن و قسەو ووتەی نەشیاوم پێبلێن.

جگەلەوەش خێزانی حوسێن جگەلەوەی بەردەوام قسەی نەشیاوی پێدەگووتم هەرجارە و لەكەل و پەلی ناو ماڵ شتێكی دەشكان و دەیخستە ئەستۆی منەوە، تائەو كاتەی جارێك من لەسەر رستەكی سەربان خەریكی جل هەلخستن بوو، كاتێ تەواو بووم و چوومە خوارەوە بینیم حەبیبە چووە سەرەوە بەخێرایی هاتە خوارەوە گووتی جیهان هێندەی جل لەسەر رستەكەدا هەڵخستووە پچراوە، منیش گووتم تۆ درۆ دەكەیت خۆم چاوم لێبوو تۆ بە پلایس رستەكەت پساند، ئیتر لە دوایی ئەوەی بۆ ماڵەوە روونبوویەوە كە ئەو پساندوویتەی بەڵام هیچ ووتەیەكی نەشیاویان پێی نەگووت، تەنها ئەوە نەبێت گووتیان جارێكی تر كاری لەو شێوەیە نەكەیت، نازانم جیاوازی نێوان من و ئەو دەبێت چی بێت هیچ كەسێك بۆی نەبوو قسەی پێبلێت، تەنها ئەو نەبێت مێردەكەی زۆر پشتی خێزانەكەی دەگرت.

ئەگەرچی تەها کەسێکی زۆر باش بوو بەڵام زۆر خێرا بە قسەی برا و خوشکەکانی هەڵدەخەڵەتا، هێندە کەسێکە میهرەبان بوو برابچووکەکەی زانا کە قوتابی بوو هەمووجارێك بەدزییەوە پارەی دەخستە نێو قەمیسەکەی بۆ ئەوەی خۆی هەست نەکات و شەرمەزار بێت.

بەهەرحاڵ دەنگۆیی ئەو بلاوبوویەوە کەمن نەزۆکم و منداڵم نابێت، ئیتر ئەوە هەواڵە وەك ئاگری نێو کا خێرا تەشەنەی سەندوو تەنانەت گەیشتە دەورو دراوسێیەکانیشمان، بۆیە هەرکە لە دەرەوە دەرۆیشتم خەڵك سەیریان دەکردم و بە چرپە چرپ دەیاتگووت ئەوەیە ژنە نەزۆکەکە زۆر گوناهە، منیش لە هەموو شوێنێك سەری خۆم دادەخست و دەرۆیشتم بۆ ئەوەی کەس نەمبینێت و قسەیەکم لەسەربکات، وەك ئەوە وابوو بۆم کە خیانەتێکی زۆر گەورەم کردووە و رووی ئەوەم نیە جارێکی تر بە نێو خەڵکدا بگەڕێم و چاوم بەرز بکەمەوە.

بەمشێوەیە هەموو رۆژێك بە جنێوەی ناشرین و قسەی ناخوش و لێدان بەرێم دەکرد، تاوەکو کار گەیشتە ئەوەی گووتیان ئەگەر منداڵت نەبێت ناچار دەبێت تەلاق بدرێت ئێمە رازی نین کوڕەکەمان بەبێ نەوە بمێنێتەوە، منیش هەر لەخودا دەپاڕامەوە منداڵێکم پێبدات، تاوەکو رۆژێك تەندروسیتم تێکچوو کە چوومە نەخۆشخانە دکتۆر گووتی مژدە تۆ دووگیانیت بۆیە تەندروستیت تێکچووە.

منیش لە خۆشی ئەوە قسەیە نەمدەزانی چۆن گەیشتمەماڵەوە تاوەکو ئەوهەواڵە خۆشەیان پێبدەم و ئەوانیش لەگەڵ بیستنی ئەو هەواڵە دڵخۆش بن، بەڵام من بێئاگالەوەی کە ئەوان هەرگیز ئارەزووی نەکردووە من دووگیان ببم، لەبەر ئەوەی ئەوان بەردەوام بیریان لەوە کردۆتەوە کە من دووگیان نەبم و بەتەلاق دانم بدەن، بۆیە کاتێك ئەوە هەواڵەم بە ئەوان گەیاند زۆریان پێناخۆش بوو، بەدەرلەوش قسەی ئەوەیان بۆ هەڵبەستم کە ئەو منداڵە لە کوڕەکەی ئەوان نیە.

ئاخەر خودایە گیان من چی گوناهێکم کردووە دەبێ لەپای ئەودا هێندە ئازار بکێشم، تەنها وەك حەبیبە خاوەن دایك و باوك نیم بۆیە دەبێ هێندە ئازارم بدەن، ئەگەرچی ئێستا دووگیانم بەڵام دەبێت تا ئەو منداڵە لەدایك دەبێت بەرگەی ووتە نابەجێ و ناخۆشەکانی ئەوان بگرم.

بەرلەوەی منداڵەکەم بێتە دوونیاوە ناخۆشییەکی گەورە تووشی هەموو میللەتی کورد بوو ئەویش ئەو کۆڕەوە مەزنە بوو کورد ئەنجامی دا، منیش وەك هەموو تاکێکی کورد بەوەر ووڵاتی ئێران بەڕیکەوتم، ئەگەرچی من बارووdۆخم زۆر باش نەبوو بەڵام تەهای مێردم گووتی من دەگەڕێمەوە و بەرگریی لە خاك و ووڵاتی خۆمان دەکەم، هەرچەندە هاوارم کرد نەگەڕێتەوە و لەگەڵ من بێت یارمەتیەکی من بدات، کەمن خۆم توانایی ڕۆیشتنی زۆرم نیە بەهۆی ئەوەی من دووگیانم و منداڵەکەشم هێندەی نەماوە بێتە دوونیاوە، بەڵام ئەو بە قسەی منی نەکردوو گەڕایەوە.

ئیتر من بەتەنیا لەگەڵ ماڵی خەسوو ئەو ڕێیە دوورو درێژەم گرتەبەر، ئەگەرچی تەها داوایی لە زانای برای کرد یارمەتی من بدات بەڵام بەهۆیی ئەوەی ئەوان منیان خۆش نەدەویست بەهیچ شێوەیەك یارمەتی منی نەدەدا.

ئەوان زۆر بەخێرایی دەرۆیشتن بەهۆیی ئەوەی یارمەتی یەکتریان دەدا بە ئاسانی بەسەر شێوێنە بەرزەکان سەردەکەوتن کەچی هیچ کەسێك لە ئەوان یارمەتی منیا نەدەدا، ئەگەر لەگەڵ ئەوانیش دابڕابام ئەوا چاوەڕێی منیان نەدەکرد جگەلەوەش کاتێ بەئەوان دەگەیشتمەوە تێر بەدڵی خۆیان قسەی ناشرینیان پێدەگووتم.

بەم دەردەسەرییەو بەتەنهایی بەردەوام بوو تاوەکو گەیشتمە نزیك ووڵاتی ئێران، لەگەڵ ئەوەی زۆر ماندوو بووم نەمدەزانی ئەو منداڵەی دەمێکە چاوەڕوانی ئەوەم بێتە دوونیاوە ماوە یاخود بەهۆی ماندوو بوونی زۆرم گیانی لەدەستداوە، بەدەرلەوەش هەر بیرم لە تەها دەکردەوە دەمگووت دەبێ ئەو چی بەسەر هاتبێ؟، خۆ ئەگەر ئەو شتێکی

بەسەر بێت من دەبێ چی بکە هەر ئەو تاکە پشت و پەنایی منە، ئەگەر ئەو نەمێنێت دەبێت منیش لەگەڵ ئەو خۆم بکوژم.

دوایی ئەوە ماوەیە زۆرە چاوەڕێبوون بۆ گەڕانەوەی تەها هیچ هەواڵێکی ئەوم دەست نەدەکەوت نەمدەزانی چی بکە جگەلە خودا هیچ کەسێکی ترم بەدەستەوە نەما رووەکردە ئاسمان وەك هەمووجارێك ئەستێرەکان و مانگم بینی، ئەمجارە بەهەموو توانایەکەم هاوارم کرد خودایە ئەو بەندەی تۆ زۆر دوایی رەتکراوەتەوە تەنها ئەو داوایەی رەت مەکەوە چاوەڕێی مێردەکەم و منداڵەکەم دەکەم ئەو دووەم لێمەستێنە، ئەوشەوە ئەگەرچی دوونیا زۆر ساردبوو بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بەسەر خۆمدابدەم بەدەم دووعاکردنەوە خەوم لێکەوت، هەرکە زانیم بەیانی تەها لەسەر سەرم بوو گووتی هەڵسە ئەو تۆ سەرمات نابێت، منیش هیچ گوێم پێی نەدا هەر وام دەزانی لە خەودام و خەو دەبینم، بەلام ئەو جارە تەها منی بانگ نەکرد بەڵکو نوقورچەکی بەهێزی لێدام ئەوکات زانیم خودا ئەوی داوەتەوە من و ئەوەی دەیبینم خەو نیە.

کاتی زانیم ئەوەی دەیبینم خەو نیە نەمدەزانی لەخۆشیان چی بکەم هێندە جنێو بە تەهای دا دەمگووت بۆچی منت بەتەنیا بەجێهێشت؟، تۆنازانیت بەتەنیا من چیم چێشت.

گووتی دەی دڵی خۆت تەنگ مەکە ئەوە جارێکی تر بە سەلامەتی گەیشتینەوە یەکتر.

گوێم لێبوو زۆر کەس لەوانەی کە گەڕاونەتەوە کوژراون منیش زۆر خەمم بوو گووتم نەکا شتێکت بەسەر هاتبێت.

گیانەکەم منیش زۆر بە سەختی رزگارم بوو بووستە هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم کە چۆن توانیمان رزگارمان ببێت.

دوایی ئەوەی لەگەڵ سەلیمی ئامۆزام ئێوەمان بەجێهێشت، لەرێگادا شەش کەسی ترمان بینی ئەوانیش هەورەك ئێمە بۆ پارێزگاری کردن لە خاك و وولات گەڕابوونەوە، کە

گەیشتینەوە ناو شاری هەولێر بۆنی خوێنی لێدەهات، هیچ کەسێکت بە زیندووی نەدەدۆزییەوە تەنها هەزاران لاشەی مردوو لەسەر زەوی کەوتبوو.

ئیتر ئێمە کاتێك زانیمان مەحاڵە بتوانین رێگە لەو هێزە بگرین کە هاتووە ناچار کەوتینە خۆ رزگارکردنمان، لەهەرلایەکی خانووەکان عارەب دەهاتنە دەرەوە و تەقەیان لێدەکردین، ئێمە لەگەڵ ئەوەی بەرگرییمان لە خۆمان دەکرد هەوڵی ئەوەشمان دەدا ئاسانترین رێگا بدۆزینەوە بۆ رزگاربوونمان، دوایی ئەوە گەیشتینە کۆڵانێك بینیمان پیاوێکی پیر رووی دەمانچەکەی لە ملی خۆی کردووە، کاتێ چاوی بە ئێمە کەوت وەك گوڵێکی ووشك چۆن ئاوی بدەیت ژیان بەبەری دابێتەوە ئەو پیاوە داماوەش وابوو، گووتی من ئەگەر سەربازی رژێمی بەعس بهاتبایە دامنابوو خۆم بکوژم، بەبەردەوام بوونمان لە رۆیشتن ئەمجارە دوو پیششمەرگەی گەنجان بینی لەلای دۆشکەیەك بوون، گووتمان ئێوە چی دەکەن لێرە وەرن بەگەڵ ئێمە بکەون، گووتیان نەخێر ئێمە چاوەڕێی هاوڕێ پێشمەرگەکانی ترمان دەکەین و پارێزگاری لەو دۆشکەیەش دەکەین، گووتمان زۆر باشە ئێمە لە رۆیشتن بەردەوام دەبین بەڵام ئاگاتان لەخۆتان بێت سەیارەی بەعس لەناوشار دەسورێتەوە نەکا زەفەرتان پێببەن، زۆر دوور نەکەویتەنەوە گوێبیستی دەنگی گوللە بووین کاتێ گەڕاینەوە بینیمان هەردووکیان کوژرابوون.

ئیتر زۆر بەخێرایی ناوچەکەمان بەجێهێشت نەکا ئەوان جارێکی تر بگەڕێنەوە، ئەمجارەیان کچێکی زۆر جوان بالاً بەرز شەروالکی لەبەر کردبوو رووبەڕووی ئێمەهات گووتی ئەوە ئێوە پیاو نین چۆن رادەکەن، منیش گووتم خوشکی من ئەو هێزە لەتوانایی ئێمەدانیە چۆن دەتوانین بەو چەکە بچووکانەوە بەرگری بکەین، وەرە تۆش لەگەڵ ئێمە خۆت رزگاربکە تۆ ئافرەتیت با زیانت پێنەبەن.

گوتی نەخێر ئێوە کەسانی ترسنۆکن من باوك و براکانم هەموویان کوژراون بۆیە ناگەڕێمەوە تاوەکو تۆڵەیان نەکەمەوە، تەنها ئێوە چاکەیەکم لەگەڵ بکەن و چەکێکم پێبدەن.

هەرچەندە هەولّی ئەوەمدا پەشمانی بکەمەوە بەلاّم بیّ سوود بوو بۆیە چەکێکمان پێیدا و بەرەو هەولێر گەڕایەوە، تاوەکو لەچاوەکانم وون بوو هەرسەیرم دەکرد.

زۆر زیاتر دوور نەکەوتینەوە بینیمان گەنجێك لە نێو دووکانێك دایە بەتەنیا شەڕ لەگەلّ یەك سوپا دەکات ئێمەش هەرچەندە هەولّماندا رزگاری بکەین لەگەلّیان کەوتینە شەڕکردن برایی یەکێکیش لە ئێمە شەهیدبوو، بەداخەوە نەمانتوانی ئەو گەنجە رزگاربکەین ئەویش شەهیدبوو.

ئیتر هەرچۆنێك بوو توانیمان خۆمان لە ناو شار رزگاربکەین کاتێك لەبەرزایی سەیری شاری هەولێرم کرد یەکپارچە ئاگر و دووکەلّ بوو چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك.

زۆریش بەدوایی ئێوەدا گەڕام تاوەکو ئێوەم دۆزییەوە زۆر زۆرم پێچوو، ئەی باروودۆخی مندالّەکەمان چۆنە؟.

هەست دەکەم لە نێو زگم جوولّەی هەیە بەلاّم لە رێگا زۆر ماندوو بوو کەسێك نەبوو یارمەتیم بدات بەسەر بەرزاییەکاندا سەربکەوم، دەترسم مندالّەکەمان لە ژیان بەردەوام نەبێت.

گیانەکەم مەگری هیچ نابێت ئەوەتا من گەڕامەوە لەمەودوا ناهێلّم هیچ ماندوو ببیت.

ئەگەرچی ئەوکات ئێمە مالّی خۆمان بەجێهیشتبوو بەلاّم نازانم چۆن باسی خۆشی ئەو رۆژانە بکەم کە لەو دەشت و دەر بەڕێم کرد، لەبەر ئەوەی هەموویان بەکێشەکانی خۆیان سەرقالّبوو هیچ کەسێك بیری بۆ ئەو نەدەچوو من سزابدات و جنێوی ناشرین و لێدانم بۆ بکات، رەنگە ئەو رۆژانە لای زۆرێك لەخەلّکی تەنانەت دەتوانم بلّێم لای هەموو خەلّك ناخۆش بووبێت، کەچی لەلای من هێندە خۆش بوو هیچ کاتێك ئارەزووی ئەوەم نەدەکرد بۆ مالّەوە بگەڕێنەوە.

ئەوە خۆشییەی من بەردەوامی نەبوو کاتێ پێشمەرگە توانی بگەڕێتەوە هەولێر ئیتر ماڵی خەسووم زوو بڕیاریاندا بگەڕێنەوە ماڵەوە، هەرچەندە من داوام لە تەهای مێردم کرد کە ئێمە با نەگەڕێنەوە و خێرا بۆ خۆمان بچینە دەروەی وولات بەلاّم ئەوە گووتی نەخێر من ناتوانم دایك و خوشك و براکانم بەجێبهێڵم.

بەناچاری جارێکی تر من گەڕامەوە ناو ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەی جاران تیایدا ژیانم بەسەر دەبرد، دووبارە دەستیان بەوە کردەوە کە ئەو منداڵەی نێو زگم لە تەها نیە لە کەسێکی تر، زۆر دووعایی ئەوەم دەکرد خودایە گیان ئەو منداڵە بە هۆی ئەو ماندووبوونەی رێگاوە هیچی بەسەر نێت، لەلایەکی تر بە هۆی کۆچکردنمانەوە هیچ شتێك لەماڵ نەمابوو بیخۆین، کەچی بەر لە هەلاّتنمان لە هەولێر تەها خاوەنی دووکانی تەلەفزیۆن بوو زۆر دەوڵەمەندبووین، بەلاّم رژێمی بەعس هەموو تەلەفزیۆنەکانی لەگەڵ خۆیدا بردبوو.

دوایی دوومانگ لەگەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە کاتی ئەو هات منداڵەکەم بێتە دوونیاوە، ئەگەرچی خێرا مامانیان هێنا بەلاّم گووتی دەبێت ئەوە نەخۆشە ببرێتە نەخۆشخانە لەبەر ئەوە باروودۆخی زۆر باش نیە، بۆیە منیان بردە نزیکترین نەخۆشخانە و خودا کوڕێکی زۆر جوانی پێداین، لەوکاتەدا خوشك و براکانی تەها لەبری ئەوەی لەبیر مندابن سەیری منداڵەکەیان دەکرد بزانن بە ئەوان دەچێت یاخود نا، کاتێ فاتیمە خوشکە گەروەکەی تەها سەیری دەستی منداڵەکەی کرد گووتی تەواو ئەوە لە ئێمەیە لەبەر ئەوەی پەنجەکانی هەندێك خوارن، خۆی لەعەشیرەتی ئێمە زۆر بەیان کەمێك پەنجەیان خوارە.

لەدوایی ئەوە هەرکەسە کەوتە بیری ئەوەی چ ناوێك بۆ ئەو کوڕە دابینرێت، منیش وەك دایکی گووتم زۆر حەزدەکەم ناوی بنێن محمد، زۆر بەتووندە گووتیان نەخێر دەبێت تیروپشك بکرێت، بەمشێوەیە زیاتر لە دە ناویان خستە نێو شتێکەوە گووتیان کامە ناو دەریچێت ئەوەی لێدەنێن، جاری یەکەم ناوەکەیان راکێشا ناوی محمد دەرچوو لەبەر ئەوەی من حەزم لەو ناوە بوو گووتیان ئەوەنابێت دەبێت جارێکی تر رابکێشنەوە، بەلاّم

وویستی خوا وابوو بۆ جاری دووەمیش هەرناوی محمد دەرچوو،کەچی ئەوان جاری دووەمیش گووتیان نا جوان تێکەڵ نەکراوە بۆیە ئەوە دەرچۆتەوە دەبێت جارێکی تر ناوەکان رابکێشینەوە، ئەوە بوو بۆ جاری سێیەمیش هەر ناوی محمد دەرچوو بۆیە ئەوان بێزاربوو گووتیان دەی دیارە ناوی محمد باشترین ناوە کە لێی بنێن.

ئیتر بەم شێوەیە ژیانی محمد کە دەکاتە نووسەر ئەو رۆمانەیە لەنێو ئاو دۆزیوتەوە دەست پێدەکات.

نازام لە کامە رووداوی ژیانم دەست بە تەواو کردنی ئەو رۆمانە بکەم، هە ر لەدوایی لەدایك بوونم هیچ خۆشییەکم لە ژیانی خۆم نەبینیوە، ئەگەرچی هەندێك لە رۆژەکانی ژیانم بە خۆشی تێپەڕیوون بەڵام هەر زوو ناخۆشییەك وەك مارێکی ژەهراوی گازی لێگرتووم و پێوەداوم.

من هەرکە چاوەکانم کردەوە لەنێو بنەماڵەیەکدا لەدایك بووم لەوە پەڕی هەژاریدا ژیانمان دەگوزەراند، جگەلەوەش بە هۆی دایکمەوە هەموو خزم و کەس و کارەکانی لای باوکم زۆر ئێمەیان خۆش نەدەویست.

لەتەمەنی چوار ساڵیەوە هەستم بە ناخۆشییەکانی ژیانم کرد، بەتایبەتی دوایی ئەوەی هەستم دەکرد کە مامەکانم و خوشکەکانی باوکم دایکمیان زۆر خۆش ناوێت، ئەوکات من نەمدەزانی هۆکاری چیە بە جۆرە رق ئەستوورن بەرامبەر دایکم، جگەلەوەش ئاگاداری ئەوە بووم بەردەوام بوهتانیان بۆی هەڵدەبەستی، لەبیرمە ئەو رۆژەی کە کچی مامەکەم هەنار کەوتە ژێر پاسێك و کۆچی دوایی کرد، من ئەوکاتە زۆر بچوك بوو لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم کچە مامەکەم یاریمان دەکرد، دوایی ئەوەی من زۆر تێنووم بوو گەڕامەوە ژوورەوە بینیم دایکم خەریکی جل شووتنە.

دایکم گووتی کوڕم بۆ واماندوویت.

گووتم دایە لەدەروە یاری دەکەین زۆرم تێنووە هاتووم ئاو بخۆم و بگەڕێمەوە دەرەوە.

لەو قسەکردنەدابووین لە دەرەوە بوو بە هات و هاوار و بوەستە بوەستە، دایکم زۆر بەخێرایی رایکردە دەرەوە یەك بەدەنگی خۆی هاواری کرد، وەرەن وەرن هەنار سەیارە لێداوە !.

زۆر بەخێرایی مام و مامۆژنم و ئەوانەی لە ژوورەوە بوون رایانکردە دەرەوە و منیش کاتێ چوومە دەرەوە بینیم تازە کار لەکار ترازاوە و کچە مامەکەم گیانی سپاردووە، بەهۆی ئەوە پاسەکە بەسەر سەری کەوتبوو مێشکی لەسەر جادەکە ڕژابوو، بەراستی کە ئەو دیمەنەم بینی هێندە لەلام ناخۆشبوو تاوەکو مردنیش ناتوانم لەیادی بکەم، هەرلەوکاتەشدا دایکم بە هۆی بینینی ئەو رووداوە لە هۆش خۆی چوو، لەبەر ئەوەی دایکم ئەو مندالەی زۆر زۆر خۆش دەویست بگرە لە ئێمەش زیاتر.

ئەگەرچی دایکم بەردەوام هەولێدەدا هەرچۆنێك بووە مام و مامۆژنم و کەس وکاری بابم والێبکات رق و کینەیان بەرامبەری نەبێت، بەلاّم ئەوان هێندە رق ئەستور بوون تەنانەت لە نێو پرسەی هەنار بوهتانێکی گەورەیان بۆ دایکم دروست کرد و دەیانگووت یەکێك بینیوەیەتی کە جیهان ئەو مندالەی بۆ ژێر پاسەکە پالّناوە.

منیش هەرچەندە مندالبووم دەمگووت نەخێر ئەوکاتەی سەیارە لە هەناری دا من لەلای دایکم بووم ئەو خەریکی جل شووشتن بوو.

ئەوان دەیانگووت تۆ مندالّی و دەتەوێت دایکت لەو تاوانە دەربهێنیت، هەرچەندە باوکیشم بە قسەکانی ئەوان باوەڕی نەدەکرد، بەلاّم ئەوان دەیانگووت کەسێك ئەوی بینیوە کە هەناری بۆ ژێر پاسەکە پالّناوە، باوکم گووتی زۆر باشە ئەو کەسە بهێنن ئەگەر راست بێت خۆم دەزانی چی بەسەر دەهێنم.

دایکم بیینی بە شێوەیەك دەستی بەگریانكرد چاوەكانی فرمێسكی تیادا نەما و سور وەك گۆماوی خوێنی لێهات، بەردەوام دەیگووت خودایە كەی دەبێت لەدەست ئەو زاڵمانەی دوونیا رزگارم بێت، ئەی ئەگەر ئەوان لە داخی من كەسێكی ساختەیان هێناو پارەیان پێدا بۆئەوەی من لە ناوبەرن من چی بكەم خودایە؟.

دوایی ماوەیەك بەسەر تێپەڕبوونی ئەو رووداوە ئەوان هیچ كەسێكیان دەست گیر نەبوو لەگەڵ خۆیاندا بیهێنن بۆیە لە نێوان خۆیان ئەو بابەتەیان داخست.

باروودۆخی ژیانی ئێمە زۆر خراپ بوو، كەچی نەمدەزانی بۆچی هەرچی تیری ناخۆشی لە دوونیا هەبوو رووی لە ئێمە بوو؟، دایك لەترسی ئەوەی لەلایەن كەس و كاری تەها بە تەلاق دان نەدرێت رێگەی دابوو هەموو ساڵێك منداڵێكی ببێت، ئەوە بوو لەدوایی من بە دوو ساڵ خوشكێكم بە ناوی ماردین برایەكم بەناوی ماهیر لەدایك بوو.

بەداخەوە لەگەڵ لەدایك بوونی ماهیر ژیانمان زۆر بەرەو خراپتر چوو بەتایبەتی دوایی ئەوەی بۆمان بەدیاركەوت ماهیری برام نەخۆشی دڵ كونی هەیە، بەم هۆیەوە ئەگەرچی ئەو پارەیەی باوكم رۆژانە پەیدایی دەركرد بەشی نانخواردنی ئێمەی نەدەكرد، لەمەوداو دەبوایە بەشێكیش لەو پارەیە بۆ ماهیر برام بە دەرمان و نەخۆشخانە خەرج بكەین.

ئەگەرچی ئێمە لەگەڵ ماڵی مامەكانم و داپیرم دادەنیشتین، ئەوانیش زۆر دەوڵەمەند بوون، بەهۆی ئەوەی مامەكەم خەریكی بازرگانی بوو لەگەڵ خەڵكانی ئێرانی، زۆرجار دەمانبینی بە فەردە پارەی لەژێر زەوی دەشاردەوە، بەڵام هەرگیز رۆژێك لە رۆژان هەست و سۆزیان بۆ ئەوە نەجولا یارمەتیەكی ئێمە بدەن، تەنانە بگرە زۆر دژایەتی و سووكایەتیان پێدەكردن، زۆرجار دەمبینی مامۆژنم لە رقی ئێمە گۆشت و جەرگی ئاژەڵی هەڵدەدایە نێو تەنەكەی خۆڵ و نەیدەدا بە ئێمە.

زۆرجار برا بچووكە نەخۆشەكەم برسیەتی زۆری بۆ دەهێنا لەكاتی ناخواردن ناچار قاپەكەی لە ترسان لەپشتی خۆی دەگرت و دەچوویە بەردەركەی ژووری ماڵی مامەكەم،

مامە بچوکەکەم زانا بەهۆی ئەوەی نانی لەگەڵ ماڵی مامە گەورەکەم دەخوارد، بۆئەوەی خۆی لەلای ئەوان خۆشەویست بکات بەبرا بچوکەکەمی دەگووت سەگی سەگباب برۆ لێرە لە دەست ئێوە نان خواردنێکی ئارامان نەماوە، دایکشم لەداخی ئەوان برا بچوکەکەمی بەزۆری دەهێنایەوە، من هەرگیز ئەوکارەم نەدەکرد بە هۆی ئەوەی کەمێك لە براکەم گەورەتربووم دانم بەخۆم دادەگرت.

لەبیرمە جارێك هیچ خۆراکێکمان لەماڵەوە نەبوو بیخۆین، ماڵی مامەکەشم چووبوونە دەرەوە، ئەکات باوکم بەدایکمی گووت تۆ برۆ سەری دەرگا ئەگەر کەسێك هات خێرا بانگم بکە منیش دەچم هەندێك نانی ووشك دەهێنم دێمەوە، بەمشێوەیە پلانیان دانا بۆئەوەی نانەکە چۆن بدزن، زۆرجار لەژیانی ئەوهادا خۆشی هەیە بلێیت هیچ خۆشی نیە درۆیە، خۆشیەکە ئەوە بوو باوکم دەستی بۆ نانەکە برد و نەبرد دایکم زۆر بەبەهێزی بانگی باوکمی کرد، باوکی داماوم رێگەی هاتنە دەرەوەی لێوون ببوو دووجار خۆی بەدیوار داکێشا و کاشی زەویەکەس بەهۆی لووسی چەندجارێکیش کەوت و هەڵساوە تاوەکو گەیشتە دەرەوە، گووتی چی بووە کێ هاتەوە ئافرەت؟.

دایگم گووتی هیچ کەسێك نەهاتۆتەوە بەلاّم من زۆر دەترسم کەسێك بێتەوە.

ئافرەت منت زۆر ترساند نەمزانی چۆن گەیشتمە دەرەوە جەندین جار کەوتم، کەمێك سەبرت هەبێت خۆ دزی کردن ئاسان نیە.

منیش لەگەڵ ئەوان دەترسام دەمگووت دزیکردن دەبێت چی بێت ئەوانە هێندە لێی دەترسن، بۆیە ئەو ترشە لەناو دڵی من دامایەوە تاوەکو گەورەبوم ئەوکات زانم ئەوەی دایك و باوکم ئەنجامیاندا دزی نەبوو زۆر زیاتر لەیاری مندالآن دەچوو، ئاخەر ئەوە چ جۆرە دزییەکە بزانیت پارە لەکوێیە دەستی لێنەدەیت بچیت چەند نانێکی ووشك بدزیت.

بەهەرحاڵ هەرچۆنێك بوو دزییە گەورەکەیان ئەنجامداو چەند نانێکی ووشکیان دزی گەڕانەوە ژوورەکەی خۆمان و کەمێکیان زۆر بەجوانی شاردەوە و کەمێکیشیان هێنا

خواردمان، بەڕاستی ئەوە نانە ووشکە نازانم بەهۆی ئەوەی زۆر برسیم بوو هێندە بەتام بوو لەلام یاخود لەگەڵ نان خواردنەکەدا دایك و باوکم باسی ئازایی ولێهاتووی خۆیان دەکرد لە دزینی نانەکە و ئەوە ڕووداوەی بەسەر باوکم زۆر کۆمیدی بوو هێندەی تر تام و لەزەتی نانەکەی لەلا خۆشکردبووم.

هەرگیز ئەو جەژنە لەبیر ناکەم زۆر دڵم بۆ خواردنی گۆشت دەچوو، هەرچەندە بەر لە جەژن زۆر داوام دەکرد باوکم گۆشتمان بۆ بکڕێت، بەردەوام بەڵێنی ئەوەی پێدەدام کە جەژن بێت بۆمان دەکڕێت، ئیتر بۆ بەیانیەکەی دەبوو بە جەژن مام احمد ناوێك دراوسێی ئێمە بوو کاری سەبڕینی ئاژەڵی دەکرد، ڕۆژێك بەر لە جەژن زۆر زوو لە خەو هەڵسام بینیم مام احمد ئاژەڵێکی زۆری کوشتۆتەوە، هەر لەبەیانی زووەکەوە من داوام لە باوکم کرد بچێت گۆشتمان بۆ بکڕێت تاوەکو دوایی نێوەڕۆ باوکم گووتی تەنها سێ دینارم هەیە، چۆن دەتوانم گۆشت بکڕم؟، ئەو ڕۆژە مامە گەورەکەم بینی جگەلەوەی نیوەی ئاژەڵێکی کڕی بەدەنگێکی بەرز بۆ ئەوەی ئێمە خەم بخۆین گووتی مام احمد جەرگێکیشم بۆ دابنێ بۆ نانی ئێوارێ دیم دەیبە.

لەبیرمە هەر هاوارم دەکرد باوکە دە تۆش برۆ گۆشت بکڕە ئەوە خەریکە تەواو دەبێت تا تەواو نەبووە دە تۆش بڕۆ، ئیتر باوکم ئەو ڕۆژە لە سێ دینار زیاتر هیچی تری نەبوو بڕیاریدا بەو سێ دینارە بچێتە بازار ئەگەر هەرچی نەبێت برادەرێکی لەوێ ببنێت و پارەیەکی بە قەرز لێوەربگرێت.

کاتێ دوونیا تەواو تاریك بوو باوکم گەڕایەوە بینم جل و بەرگی بۆ ئێمە هێناوە جگەلەوە گۆشتێکی گەلێك زۆری کڕیووە، ئێمەش زۆر سەیرمان لەوە هەتا کە ئەوە پارەیەی لە کوێ هێناوە، بەتایبەتی دایکم گووتی تەها ئەو ماڵی کێت بڕوە؟ خواردن و جل و بەرگت پێ کڕیووە؟.

گووتی دانیشە ئافرەتماڵی کەسم نەبڕیوە بابۆتی باس بکەم کە چوومە بازار چی روویدا.

دایکم گووتی چی روویدا پیاوەکە دەخێرا پێم بڵێ خەریکە دڵم شەق دەبات؟.

باوکم گووتی لێرە کە چوومە بازار زۆر دڵم تەنگ بوو چوومە چایەخانەکە دانیشتم گووتم بەڵکو کەسێك ببینم و پارەیبەکی بەقەرز لێوەربگرم، بەلاّم دوایی ئەوەی چایەکم خواردەوە بیرم کردەوە تەنها یەك دینارم پێدە مێنێت پێی بگەڕێمەوە ماڵەوە، دوونیاش بەرەوە تاریك بوون دەچوو، لەو کاتەدا پیاوێکی بە رووالەت زۆر هەژار هات گووتی لە بەر خاتر خودا ئەگەر دینارێك پێیە بمدێ، منیش بیرم کردەوە تەنها یەك دینارم پێیە خودایە چی بکەم گووتم دەی ئەو دینارە لە بەرخاتر خودا دەدەم بە پیاوە و خۆشم لە بێزارییان بە پێیان دەگەڕێمەوە ماڵەوە.

دوایی ئەوەی دینارەکەم بە پیاوە هەژارەکە ونبوو وونەبوو یەکێك هات گووتی تەها لێرەیە کارم پێیەتی، منیش گووتم فەرموو من تەهام.

گووتی پێان گووتم کە تۆ کاری دەراری کرین و فرۆشتنی شیشی سەبە دەکەیت ئێستا من پێویستم بە یەك تۆن شیش هەیە، ئەگەر ئێستا بۆم بدۆزیتەوە ئەوا هەزارو پێنج سەد دینارت پێدەدەم.

منیش یەك مانگ بەر لە ئێستا هاوڕێیەکم پێی گووتم یەك تۆن شیشم هەیە دەیفرۆشم ئەگەر بۆمی بفرۆشیت ئەوا دووهەزار دینارت پێدەدەم، ئافرەت بەم شێوەیە خودایی گەورە دەرگایی خێری لێمان کردەوە، کە گەڕامەوە بینم مام احمد هەرئەوەندە گۆشتەی مابوو منیش کڕیم.

لەوکاتەدا بیرم لەوە کردەوە من هێندە حەزم لە گۆشت بووە، مادەم خودا بۆمانی رەوانکرد من بۆچی لە بەیانیەوە داوا لەو ناکەم داوا لە باوکم دەکەم، ئیتر لەو رۆژە بە

دواوه هەر شتێکم بویستایه داوام له خودا دەکرد، به هۆی نەزانی و بچوکیمەوه هەندێك کات که داوام دەکرد بۆم نەدەبوو دەمگووت خودایه ئەوه توڕه بووم بۆچی ئەو کارەت بۆ جێبەجێنەکردم؟.

ئیتر ئەوه ڕۆژه خۆشەی ئەوه جەژنه هەرگیز له بیر ناکەم، بەلاّم نازانم بۆچی هەر خۆشییەکی ژیانم هاتبێت خێرا لەدەوایی ئەودا ناخۆشییەك هاتووه، هەر دوایی جەژن لەلایەك ماهیری برام نەخۆشی زۆری بۆ هێنا لەلایەکی تر دایکم دووگیان بوو، ئیتر باوکم زۆر پێویستی به پاره هەبوو چووه لای مامه گەورەکەم پارەی به قەرز لێوەرگرت.

ئەکات براکەم بۆ ماوەی یەك هەفته له نەخۆشخانه دا خەوێندرا، ناچار دایکشم لەگەڵ ئەوەی بارووذۆخی خۆی تەواو نەبوو لەگەڵ ئەوه له نەخۆشخانەدا مایەوه، باوکیشم به هۆی نەبوونی پارەوه ناچار دەبوایه بچێته سەرکاره، ئیتر تەنها من و خوشکه بچووکەکەم له ماڵەوه دەماینەوه، ئەگەرچی من زۆر بچووك بووم نەمدەزانی چۆن شتێك بۆخۆمان ئامادەبکەم و بیخۆین ناچار نانی ووشك و ئاومان دەخوارد تەنها ئەوه کاتەی باوکم دەهاتەوه شتێکی سادەی بۆ ئامادە دەکردین، ماڵی مام به هیچ شێوەیەك لەو ڕۆژه ناخۆشانەی ژیانماندا یەك تۆزیش یارمەتیان نەدەداین، ناچار له دراوسێیەکی ئێمه کەسێکیان مردبوو، کاتی نیوەڕۆیان نانیان ئامادە دەکرد منیش دەچووم هەرچۆنێك بێت شتێکم بۆ خۆم ماردینی خوشکم دەهێنایەوه و دەمانخوارد.

هەرلەکاتەوه تێگەیشتم ژیان ڕاکردنه به دوایی خۆ تێر کردن، ژیانێك چاوەڕێی من دەکات دەبێت له پێناو خوشك و براکانم بجەنگم جەنگێك هەرگیز من تیادا سەرکەوتوو نابم تەنها ئەوه نەبێت دەبێت بەرگری بکەم بۆ ئەوەی هەرچی نەبێت ئەوان کەمێك له ژیانێکی خۆشدا بژین.

دوایی یەك هەفته براکەم کەمێك باشتر بوو لەگەڵ دایکم گەڕانەوه ماڵەوه، سەیری چاوەکانی دایکم کرد خودا ئەو چاوەی ئەوه دەبێ چی بێت هێنده ئارامیم پێدەبەخشێت،

ئەوە دەبێ چ فریشتەیەك بێت خودا بۆمنی ناردبێ، دیاربوو کە گەیشتەوە ماڵ زۆر برسیی بوو هەر دەیگوت خۆزگە نان و تەماتەیەك هەبووایە بمخواردایە زۆر دڵم بۆی دەچێت دەمێکە تەماتەم نەخوادووە، داریبوو دایکم بەهۆی دووگیانییەکەیەوە زۆر حەزی بە خواردنی نان و تەماتەیەك دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەی نرخی تەماتە ئەوکات زۆر گران بوو کەچی باوکم خاوەنی یەك دیناریش نەبوو پارەیەکی زۆریش هی مام قەرزاربوو.

هەرکە زانیمان لە ماڵی مام بووبە دەنگە دەنگ و ژاوە ژاوی کاتێك چووین بینیمان مام باروودۆخی زۆرباش نیە، بۆیە خێرا بردیان بۆ نەخۆشخانە، دوایی ئەوەی لە نەخۆشخانە گەڕایەوە گووتی تەنها دڵم بۆ خواردنی نان و تەماتە دەچێت، زۆربەخێرایی مام زانا کە تەنها لەبەربەرژەوەندی خۆی خۆی بەخەمخۆری مامە گەورەکەم دەزانی چووە دووکان سەمون و تەماتە کڕی گەڕایەوە، هەربەخێرایی سەموونێکیان پڕ لەتەماتە کردوو و دایانە دەست مامە گەورەکەم بەڵام یەك قەنپاڵی لێنەدا باروودۆخی کەمێك خراپ بوویەوە و گووتی پێم ناخورێت، لەوکاتەدا سەموونەکەیان لێوەرگرت و دایانە دەست دایکم، دایکشم بەبێ ئەوەی گوێ بەهیچ بدات چوویە دەرەوە و وەك شێتێکی برسی کەوتە سەر سەموونەکە، دوایی تەواو بوونی ئاگام لێبوو کەهاتەوە سەرەخۆی گووتی خودایە ئەی ئەگەر گووتیان حوسێن داوای نانەکە دەکاتەوە من چی بەوان بڵێم؟.

هەرچەندە بچووك بووم کاتێك گوێبیستی ئەوە قسەیە بووم نەمدەزانی چ دووعایەك بکەم خودا لەو نەهامەتیەی تیایداین رزگارمان ببێت، فرمێسکانی چاوە بچووکەکانم وەك باران دەهاتە خوارەوە، بۆم دەرکەوت ژیان بەو ناخۆشییە بچووکانەوە کۆتایی نایێت، هێشتا ناخۆشی زۆر گەورەتر ماوە و چاوەڕێی زیاتر بەهێز بوون و گەورەبوونی من دەکات، تاوەکو رووبەڕووم ببێتەوە.

نەمدەزانی بۆچی ژیان هێندە رقی لە منە بەردەوام دەمگووت دەبێت رۆژێك دابێت خۆشی ببینم هەرکە بەمشێوەیە خۆم لەبەرامیە ژیان بەهێزدەکرد، بەڵام من وەك ئەوە وابووم لەبەردەم زریانێکی گەورەدا بەلەمێك بییەوەێت خۆی رابگرێت، چۆن بەلەمەکە زۆر

هەوڵی خۆ رزگارکردن دەدات لە شەپۆلە بەهێزەکان، منیش هەروا نەمدەویست نقوومی دەریایی کێشەکانی ژیان ببم، کەچی من کاتێك بەرگریم دەکرد ژیانیش سەیری بچووکی منی دەکرد پێی سەیر بوو چۆن من دەتوانم بەرگەی ئەوە کێشانە ئەو بگرم کە رووبەڕوومی دەکاتەوە، بۆیە ژیان بەردەوام لێم رق ئەستوور تر دەبوو زۆر بەبێ بەزەییانە گەورەتریش شەپۆلەکانی خۆی بۆم دەنارد.

ئەمجارەیان کاتێ مام لە نەخۆشییەکی چاکتر بوویەوە بانگی باوکمی کرد گووتی وەرە کارم پێتە، دوایی ئەوەی باوکم چوویە ژوورەکەی ئەوان زیاتر لە نیو سەعاتێك لەوێ مایەوە، کەهاتەوە زۆر مات و خەمبار دیار بوو.

دایکم گووتی ها پیاوەکە چی بووە هیچ شتێکی باش لە چاوانت ناخوێنمەوە؟.

باوکم گووتی بڵێم چی ژنەکە براکەم داوای ئەو پارەیەم لێدەکاتەوە کە ئەوکاتەی ئێوە لە نەخۆشخانە بوون لێیم وەرگرتووە، گووتی یان دەبێت بۆ دوومانگی تر پارەکەم بدەنەوە یاخود ئەوە دەبێت ئەو خانووە چۆڵبکەن بۆ من بێت.

دایکم گووتی هیچ گوێی مەدێ پیاوەکەم من هەندێك زێرم هەیە بۆ کاتی تەنگانە هەڵم گرتبوو ئێستا برۆ ئەو زێرە بفرۆشە و پارەکەی بدەوە.

باوکم گووتی نەخێر ئافرەت ئەو زێرە دەفرۆشم داری نەجاری لەگەڵ سعدالله هاوڕێم پێدەکرم ئەگەر ئەو کارەبکەم لە ماوەیەکی کەمدا پارەیەکی باشم دەست دەکەوێت هەم پارەکەی ئەو دەدەمەوە هەمیش دارەکەمان دەمێنێتەوە.

زۆرباشە پیاوەکە خۆت باشتر دەزانیت چی لە پارەکە دەکەیت.

ئیتر رۆحێك بەبەرمن داهاتووە کە ئەو خانووە جێناهێڵین ئاخەر بەپێ پارە چۆن ئەو خانووە جێبهێڵین لەکاتێکدا دایکم تەنها ماوەیەکەی کەمی مابوو منداڵی ببێت، لەدڵی

خۆم دەمگووت بەخوا دایکم کەسێکی زۆر زیرەکە لە هەموو ژیانمدا دڵم تەنها بە خۆش بوو دەمگووت خودایەگیان زۆر سوپاس بۆ ئەو فریشتەی بەمنت داوە.

بەهەرحاڵ باوکم چووە لای سعداللە ی هاوڕێی بەیەکەوە بڕیاریاندا داری نەجاری بکڕن و دەست بەکارکردن بکەن، یەکەم کارییان کە ئەنجامیاندا پارەیەکی زۆر باشیان قازانج کرد، لەوکاتەدا نەمدەزانی چ جۆرە دڵخۆشییەکم هەیە، دڵم وەك پەپولەیەك وابێت لە خۆشییان دەفڕی و بەهاری جوانی دروستکراوی خودایی دەبینی و بۆنی گوڵە جوانەکانی هەڵدەمژی، بەڵام هەروەك چۆن ئەو ژیانە جوانە پەپولەکان هەیانە تەنها یەك رۆژە، خۆشییەکانی ئێمەش هەروابوو، لەبەر ئەوەی زۆری نەبرد دوایی گەڕانەوەی باوکم زۆر بە بەهێزی لە دەرگایی ئێمە درا کەسێك هاواری دەرکرد مام تەها مام تەها خێرا وەرە دارەکانی ئێوە ئاگری تێبەربووە، کاتێ چووین سەیرمانکرد تەنها یە تەختەش لە دارەکەمان رزگاری نەبوو بوو هەمووی ببووە خۆڵەمێش، خۆشییەکەمان زیاتر لە چەند سەعاتێکی نەخایاند ناخۆشییەك یەخەی پێگرتین هیچ خۆشییەکی ژیانمان ئەگەرچی نەماندیبوو لەبەرچاودانەما.

ئاگاداربووم باوکم هێندە خەمی ئەوەی نەبوو دارەکە سووتاوە هێندە خەمی ئەوەی بوو دەگووت پارەی حوسێنی برام لە کوێ پەیدابکەم، هەرچۆنێك بوو دانمان بەخۆداگرت ماوەیەکی زۆر نەمابوو دایکم منداڵەکەی ببێت، مام دووبارە بانگی باوکمی کردەوە گووتی دوایی ئەوەی ئەو ئافرەتە منداڵەکەی دەبێت راستەوخۆ دەبێت ئەو خانووە بەجێبهێڵن.

بەچەند رۆژێك دوایی ئەو رووداوەی روویدا لە خێزانەکەی ئێمە کچێکی ترمان بۆ زیاد بوو ناویان لێنا سۆزان، ماوەیەکی زۆر بەسەر لەدایك بوونی سۆزانی خوشکم تێنەپەڕی مام گووتی هەرچۆنێك بێت شوێنێك بۆ خۆتان بدۆزنەوە و ئەو خانووە بەجێبهێڵن، هەرچەندەی زۆر پاڕاینەوە کە بەو زستانە ساردە دەرمان نەکەنە دەرەوە کەمێك لەسەرمان بووەستن، گووتیان بۆ یەك هەفتە زیاتر مۆڵەتی ئەوەتان نیە بمێنەوە ئەگەرنا هەموو کەل و پەلەکانتان هەڵدەدەینە دەرەوە، بەمشێوەیە باوکم زۆر بەدوایی شوێن دا

گەڕا تاوەکو لە ناوچەیەکی دوور لە ئاوەدانی خانوویەکی دۆزییەوە وماڵمان بۆ ئەوێ گواستەوە.

ئیتر بارووودۆخی ژیانی ئێمە تادەهات قورستر و قورستر دەبوو، پێشتر پارەمان لە دەمی خۆمان دەگرتەوە بۆ برا نەخۆشەکەمان ئەمجارە دەبوایە بۆ کرێی خانووش پارە کۆبکەینەوە.

ئەوساڵەی ماڵی خۆمان گواستەوە دوونیا زۆر سارد بوو بەتایبەتی ئەو شیوێنەی ئێمە بۆی چووین بە هۆی ئەوەی ناوچەیەکی زۆر چۆڵ بوو زۆر ساردتربوو، جگەلەوەش ئێمە نە نەوتمان هەبوو نە سۆپامان هەبوو، تەنهائەوەی هەمانبوو تەباغێکی بچووك بوو کە هەم خواردنمان پێی لێدەنا هەمیش خۆمان پێی گەرم دەرکردەوە، لە بیرمە ئەو ساڵە ئەستێریەك لە زەوی نزیك بوویەوە پێیان دەکووت ئەستێرەی کلکدار بەهۆی ئەو ئەستێرەوە دوونیا هێندە ساردبوو زەوی یەکپارچە دەبوویە شەختە، بەهۆی ساردی ئەو ساڵە نینۆکی پەنجەی گەورەی پێم لیبوویەوە.

دایکم لەترسی ئەوەی ئێمە نەخۆش نەکەوین شوێنی خەوتنی ئێمەی هیچ کۆنەدەکردەوە ئێمەی بەردەوام لەژێر جیگا دادەنا بۆ ئەوەی سەرمای زستان کاریگەری لەسەرمان نەبێت، لەلایەکی تر بەهۆی ئەوەی سەدام حوسێن سەرۆکی عیراق لەساڵی 1991پەلاماری سەر کوێتی دا، وولاّتانی دوونیا گەمارۆی ئابوورییان خستەبووە سەر عیراق و ڕێگەیان نەدەدا هیچ جۆرە خۆراکێك هاوردەی عیراق بکرێت، بەم هۆیەوە ژیانی ئێمە زۆر سەخت و ناخۆش ببوو، نرخی هەمووجۆرە خۆراکێك بەرزببوویەوە، باوکم نەیدەزانی بۆ کرێ پارە خانوو کۆبکاتەوە یاخود بۆ خۆراك و دەرمانی برا نەخۆشەکەم.

ئێمە هیچ ئومێدی ژیانمان نەمابوو هەموو رۆژێك دووعای ئەوەمان دەکرد خودا هەمووومان بەیەکەوە بۆ خۆی بباتەوە، هیچ کەسێکمان بۆ خەم خواردن لەسەر دوونیا نەمێنیەوە، هیچ رۆژێکمان نەبوو خۆشی تیادا ببینین، هەمووومان چاوەڕێی ئەوەمان

دەکرد تاوەکوو باوکمان نان و تەماتەیەکمان بۆ بهێنێتەوە خواردنی رۆژانەمان بۆ تەنها یەك ژەم کەمکردبوویەوە هەرچەندە ئەو ژەمەش پڕ بەسکی خۆمان نەبوو بخۆین.

رۆژێك باوکم چووە دەرەوە بۆ کارکردن ئێوارە داهات نەگەڕاییەوە، برا نەخۆشەکەشم لە برسان دەستی بەگریانکرد تا ئەوە کاتەی خەوبردییەوە لەبرسان لەگریان نەوەستا، لەبیرمە منیش لەیرسان خەوم لێنەکەوت لەلایەکی تر دەمبینی دایکم بەهۆی نەگەڕانەوە باوکم دەگریا نەمدەزانی چی بکەم، کات لە نیوەی شەوی تێپەڕکرد لە بێتاقەتیان چوومە دەرەوە دوونیا زۆر سارد بوو ئاسمان سامالێك بوو تیشکی مانگ و ئەستێرەکان زەوییان رووناك کردبوویەوە، دەست بە پاڕانەوە کرد بەجۆرێك سەیری مانگم دەکرد وامدەزانی خودا لەسەر مانگە بەردەوام دەمگووت خودایە تۆ کە لەسەر مانگی ئەو شوێنە بەرزە هەموومانت لێدیارە کەی ئەو ناخۆشییەی ئێمە کۆتایی دێت.

خەریك بوو خەو منیشی دەبردەوە دایکم لە کاتە هاتە دەرەوە کوڕم ئەوە بەو سەرمایە لە دەرەوە چی دەکەیت؟.

دایکە لەژوورەوە بێزاربوو لە ژێرپێخەفە شڕەکانمان بێزاربوو، رۆژ و شەوە بۆ ئێمە هەر وەکو یەکی لێهاتووە هێندەی لەژێر بەتانیەکان پاڵبکەوین، پێش ئەوەی تۆ بێت قسەم لەگەڵ خودا دەکرد، دەمگووت مادەم خودا لەسەر مانگە دەبێ ئێمە ببینێت، ئەی بۆچی یارمەتییەکی ئێمە نادات؟.

دایکم بەپێکەنیەوە گووتی کوڕم خودا زۆر لەمانگ دوورتر و بەرزترە، لەوە زیاتر چیترت دەوێت ئەها خودا دەست و باڵایەکی جوان و عەقلێکی باشی پێداویت، قیقەی درواسێمانت نەبینووە عەقلی تەواو نیە بە قەپاڵ هەموو پێستی دەستی خۆی لێکردیتەوە.

ئەوکات دەمزانی دایکم زۆر لە من دڵی خەمگینترە بەڵام بۆ ئەوەی من خەم نەخۆم ئەو پێکەنینە درۆیەی خستە سەر رووخسارە جوانەکەی، گووتم ئاخ هەژاری تەنانەت

پێکەنینانەی پێششمان دەبەخشی بەڕاستی نیە درۆیە، هەرچۆنێك بێت بەو قسانەی دایکم کەمێك ئارامیم هات، بەڕاستی قیقە دراوسیمان هەرچەندە ناوی قیقە نەبوو بەهۆی قیژەکانیەوە ئەو ناوەیان لێنابوو ئەو بارووڕۆخی زۆر خراپ بوو، منیش گووتم سوپاس بۆ خوا هەر وەك ئەو نیم.

لەگەڵ دایکم لەو قسانەدابووین لە دوورەوە بینم تارمایی کەسێك بەدیارکەوت بەرەومالّی ئێمە دێت، دایکم زۆر ترسا لەوەی باوکم نەبێت هەواڵێکی خراپی باوکمیان بۆ هێنابێت.

گووتی کوڕم من باش چاوەکانم نابینێت ئەوە دەبێت باوکت بێت؟.

گووتم دایکە بەباوکم دەچێت بەڵام زۆر دوورە ناتوانم بزانم باوکەم یاخود هەونیە.

ئیتر تاوەکو نزیك بوویەوە دایکمم بینی وورده وورده و بەبێدەنگی فرمێسکی چاوەکانی دەهاتە خوارەوە، ئەگەرچی بێدەنگ بوو گریان و فرمێسکەکانی،کەچی هەستم بەو گڕکانەی ناخی دەکرد کە لەناخیەوە هاوارێکی گەورەی هەبوو.

کەمێکی تر نزیك بوویەوە سەیرمکرد باوکەمە خێرا گووتم دایکە ئەوە باوکمە هاتەوە،بەسە مەگری.

گووتی کوڕم لێم گەڕێ تائێستا فرمێسکی خەمم ڕژاندووە با ئێستاش کەمێك فرمێسکی خۆشی گەڕانەوە باوکت بڕێژم.

کاتێ باوکم نزیك بوویەوە گووتی ئەوە بەو سەرمایە چی دەکەن لە دەرەوە بابچینە ژوورەوە نان و خیار و تەماتەم هێناوە، ئیتر هەمووومان چووینە ژوورەوە و خوشك و براکانی تریشم لە خەو هەڵسان و دەستمان بەنان خواردن کرد، نانەکە زۆر گەرم و بەتام بوو بەڕاستی دەمێك بوو نانی لەو جۆرەم نەخواردبوو.

ژیانمان هێواش هێواش ناخۆشتر و ناخۆشتر دەبوو تاوای لێهات کاری باوکم تەنها بەشی کرێی خانووەکەی دەرکرد، ئیتر لەکاتە بەدواوە دەستمان بە خواردنی ئەو نانە ووشکانەکرد کە خەڵك فرییان دەدا، رۆژێك فەردەیەك پەلکە نانی ووشك لەبەر دەرگای ماڵێك بوو، بۆ ئەوە دانرابوو هەرکەسێك ئاژەڵی هەبێت بۆ ئەوان بیبات، ئێمەش هینامانە ماڵەوە  و سەری فەردەکەمان کردەوە و نانەکەمان رشتە سەر زەوی بۆئەوەی هەندێکی باشی لێدەربکەین و بیخۆین، لەوکاتەدا مشکێك لە نێو نانەکە هاتە دەرەوە و خۆی کرد بە نێو شەرواڵی باوکم، باوکیشم لە ترسان هێندە بەخێرایی هەڵسایەوە شەرواڵەکی لەبەرداهاتە خوارەوە، ئەوە بووە یەکەم رووداو لە ژیانم کە بووبێتە هۆی پێکەنینێکی راستەقینەم، دوایی ئەوە بەبێ ئەوەی گوێبدەینە پیسی و خاوێنی نانەکە دەستمان بەخواردنی کرد.

ئەمرۆ کەش و هەوا زۆر سارد نەبوو بۆیە لەگەڵ دایکم کەمێك چووینە دەرەوەی، سەیرم کرد هەموو منداڵەکان زۆر دڵخۆشن هەموو پێمیان دەیانگووت بەیانی جەژنە چیت بۆ جەژن کڕیووە؟.

منیش لە زاری ئەوان گوێم لەوە بوو کە بەیانی جەژنە لەبەر ئەوەی ئێمە خواردنمان نەبوو چ جای بگاتە ئەوەی جل و بەرگ بکڕین، هیچ وەڵامێکی ئەوانم نەدایەوە... لەوکاتەدا بینم کوڕێك هاتە لای دایکم کە تەمەنی بەچەند ساڵێك لە من  گەورەتر بوو ئەو کوڕەم پێشتر نەبینی بوو، دایکم خێرا بانگی منی کرد گووتی ئەوە پوورت گوڵناز کوڕەکەی خۆی ناردووە گووتوویەتی هەتا ماڵی ئێمە وەرە کارم پێتە، تۆ برۆ ژوورەوە ئاگات لە خوشك و براکانت بێت  هەتا من دێمەوە بەڵکو پوورت پارەیەك خواردنێکی داناوە بماندات.

منیش گووتم زۆرباشە دایکە گیان هیچ خەمت نەبێت، گەڕامەوە ماڵەوە زۆر دڵم خۆش بوو لەبەر ئەوەی مێردی پوورم هونەرمەند بوو زۆر دەوڵەمەندبوون، پێم وابوو دایکم

بچێت پارەیەکی باشی پێدەدەن، من و خوشك و براکانیشم دەتوانین جلی جەژن و خواردنی خۆش بکڕین.

دوایی رۆیشتنی دایکم پوورم شیرین هاتە ماڵمان گووتی هەندێك برنج و فاسولیا و چەند پێداویستسەکی ترم بۆ هێناون دایکت چۆتە کوێ.

گووتم دایکم چۆتە ماڵی پوورم گوڵناز وابزانم شتێکی بۆ ئێمە دانابوو.

ئەوکاتە کەمێك بارووذۆخی خوشك و براکانی دایکم باش ببوو، ئەوان بەهۆی مردنی باوکیان حوکومەت خانووی پێدابوون جگەلەوەش مووچەیەکی مانگانەی بۆ بڕیبوونەوە، بەهۆی ئەوەی بارووذۆخیان باشبوو شادی لەگەڵ مێردەکەی چووبوویەوە ناو ئەوان و لەگەڵیان دەژیا، ئەوانیش بەهۆی ئەوەی شەرمین کە دوایی دایکم کچە گەورەی ماڵەوە بوو مێردی کردبوو رێگەی دایکیان دا بێتەوە ناو ئەوان.

بەهەرحاڵ ئەو رۆژە دایکم لەماڵی پوورەکەم زۆر درەنگ کەوت، من لەدڵی خۆم دەمگووت پوورم پارەی بە دایکم داوە ئەویش چووە جل و بەرگمان بۆ بکڕێت لەبەر ئەوە درەنگ کەتووە، کەچی کاتێ دایکم گەڕایەوە بینم نیو کیلۆ برنج و قوتوویەکی بچووکی رۆن لە دەستیەتی بەدەم گریانەوە هاتە ژوورەوە، منیش گووتم دایکە چی بووە بۆچی دەگریت؟.

گووتی کوڕم لەو ماوە زۆرەی من رۆیشتووم هەر خەریکی کۆکردنەوەی ماڵی پوورتم، پوورت بۆ ئەوە منی بانگ کردبوو زۆریان قەل و مریشك کڕیی بوو، گووت بەتەنیا ئەو هەمووە بە من چاك ناکرێت تۆ یارمەتیم بدە.

منیش بیرم لەوە کردەوە ئەگەر یارمەتی بدەم بەڵکو هەندێك گۆشتیش بە من بدات بۆ ئێوە بیهێنمەوە و بەیانی کە جەژنە کەمێك خواردنێکی جیاواز بخۆن، قەل و مریشکەکان هێندە قەلەو بوون توانای بڵند کردنیانم نەبوو، لەدڵی خۆم گووتم لە هەریەکێکیان

چارەگێك بەمن بدات زۆرە بۆ ئێمە، بەڵام کاتێك هەموو کارەکانم تەواو کرد بە منی گووتی خێرا مەڕۆ هەندێك ئەشیام بۆ داناویت لەگەڵ خۆت بیبە، زۆر دڵم خۆش بوو وامدەزانی هەر کارم نەکردووە، کاتێ کەچوو گووتم کارەکان هیچی نەماوە کاتیش درەنگە خۆت دەزانی پارەی تەکسیم نیە وماڵیشمان دوورە دەبێت بە پیادە بگەڕێمەوە بۆیە مۆڵەتم بدە بڕۆم.

گووتی زۆرباشە ئەوە نیو کیلۆ برنج و هەندێك رۆنم بۆ داناویت لەگەڵ خۆت بیبە بەیانی جەژنە بۆ منداڵەکانت ئامادەی بکە.

کوڕم لەوکاتەدا چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك لە دڵی خۆم گووتم ئەو برنج و رۆنە ببەم ئاخەر هەروا چۆن دەخورێت خۆ هیچ شتێکی تریش لەپاڵ ئەوە شك نابەم ئامادەی بکەم، هەرچۆنێك بوو ماڵی ئەوانم بەجێهێشت تا گەیشتمەوە هەر گریاوم و لەخودا پاڕاومەتەوە، نازانم هیچمان نیە بۆ بەیانی بۆتانی ئامادەبکەم.

گووتم زیاتر مەگری دایکە پوورم شیرین هات برنج و فاسۆلیا و چەند پێداویستیەکی تری بۆ هێناوین، دایکم نەیدەزانی لە دڵخۆشیان چی بکات هەر دەیگووت زۆر سوپاس خودایە دووعاکانمت رەتنەکردەوە.

پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت (هەرچی بەردە لە رێی کوێرانە) بەردەوام دایکم ئەو پەندەی دووربارە دەرکردەوە، من ئەوکات هیچ لە مانای ئەو پەندە تێنەدەگەیشتم تائەوکاتەی رۆژێك باوکم هاتەوە ماڵ بە دایکمی گووت کارێکی گەورەم کردووە،بەیانی ژیانمان تەواو دەگۆڕێت و دەوڵەمەند دەبین.

دایکم گووتی چۆن پیاوەکە بەو خێراییە تەواوی ژیانمان دەگۆڕێت؟.

باوکم گووتی پارەیەکی زۆرم قەرزکردووە و کەل و پەلێکی زۆری ناو ماڵم کڕیوە بەیانی بەفرۆشتنەوەیان ژیانمان تەواوەن دەگۆڕدرێت.

من كه گوێم لەو قسانەی باوكم بوو هێندە دڵم خۆش بوو هەزاران خەیاڵم بۆ بەیانی دروست كرد، ئیتر بەیانی دەتوانم پڕ بەدڵی خۆم نان بخۆم و جل و بەگێكی جوان و گەرم بۆ خۆم بكڕم، دەبێ كەی بەیانی دابێت و ئەو گۆڕانكارییانەی ژیانم ببینم، هیچی تر بیر لەوە ناكەمەوە كە برا نەخۆشەكەم بە برسیەتەی دەنووێت هەروەها بە باوكم دەڵێم پاسكیلێكی جوانم بۆ بكڕێت لەوەی ئامانجی هاوڕێم بچێت ئەو پاسكیلەكەی زۆر جوانە، هێندەم نەماوە بچم بۆ قوتابخانە تەواوی كەل و پەلی قوتابخانە بە باوكم دەكڕم بە پاسكیلە جوانەكەشم دەجم بۆ قوتابخانە،دەبێت خۆم زۆر زیرەك بكەم و ببم بە دكتۆر تا چارەسەری براكەمی پێبكەم، بەو خەیالأنەی هەزاران خەیاڵی تر چاوەڕوانی خۆر هەلأتم دەكرد، ئاگادارم باوك و دایكیشم خەویان لێناكەوێت لە چاوەڕوانی گۆڕانی ژیانیانن.

خەریك بوو لە نێو بەهەشتی خەیاڵە خۆشەكانم خەو دەیبردمەوە، بەلأم گوێبیستی دەنگی هەندێك گوللە بووین، من باوكیشم چووینە لای پەنجەرەكە گوللەكانم زۆر پێ جوان بوو یەكەمجارم بوو لە ژیان گوللە ببینم ئارەزوو دەكرد تاوەكو بەیانی بەردەوام بێت، دەمگووت خوایە من زۆر بەچانسم ئەم شەو باوكم ئەو هەواڵە خۆشەی پێدام و ئەو گوللە جوانانەشم بینی.

دەنگی گوللەكان هیچ نەدەبڕایەوە هەركە زانیمان لە كۆلأن بوو بە ژاوە ژاو دەنگە دەنگ، باوكم گووتی دەڕۆمە دەرەوە دەپرسم بزانم چی روویداوە، باوكم چووە دەرەوە منیش چوومە لای دایكم، گووتم دایكە ئەو شەو زۆر خۆشە بەیانی ژیانمان تەواو دەگۆڕێت دەبا ئەو شەو هەر نەنووین.

كوڕم هەر باوكت بێتەوە خێرا دەنووین باوكت بەیانی زوولە خەو هەڵدەستێت دەچێتە كار.

گووتم زۆرباشە دایكە گیان، باوكم كەهاتەوە ژوورەوە لە رووخساری هیچ خۆشی پێوە دیار نەبوو، دایكم خێرا هەستی پێكرد گووتی ئەو چی بوو پیاوەكە؟.

باوکم گووتی چی بڵێم ژنەکە هیچ شتێکی وانەبووە بابنووین.

نەخێر شتێك بووە خەڵك لەدەرەوە هەتا ئێستا دەنگیان دێت راستم پێبڵێ چی بووە؟.

باوکم گووتی نازانم چی بڵێم لە دەرەوە خەڵك شایی و هەڵپەرکێی دابەستیووە دەڵێن گەمارۆی ئابووریمان لەسەر نەما ئیتر نەوت دەڕوات بۆ دەرەوە.

جا پیاوەکە لەوە باشتر هەیە ئیتر هەموو جۆرە خۆراکێك هەرزان دەبێت.

ژنەکە تۆ نازانیت ئەو کەل و پەلانەی من کڕیوە چارەگێکی پارەی خۆی ناکاتەوە، هەتا سەر ئێسقان من زەرەر دەکەم، نازانم ئەو پارە زۆرانەی قەرزمکردووە چۆن بیدەمەوە؟، بەیانی خێرا دەچمماڵەکە بەخاوەنەکەی دەدەمەوە ئەگەر بە بڕێکی کەمیش زەرەر لێم وەربگرێتەوە باشە.

دوایی ئەوە لەنێو بەهەشتی خەیاڵەکانمەوە کەوتمە نێو جەهەنەمێك ئەمجارە رزگاربوون تیادا وەك خەوێك وایە، ئێستا لەبری ئەوە بیر لەوە بکەمەوە تێر بەسکی خۆم نان بخۆم و جلی جوان لەبەر بکەم، دەبێ لەبیری ئەوەدابم چۆن بە برسیەتی دەتوانم لە ژیان بمێنمەوە و ئەو جلە شڕەی کە بۆم بچوك بۆتەوە دەبێت چەند ساڵێکی تریش لەبەری بکەم، لەبری ئەوەی بیر لەوەبکەینەوە خانوویەکی جوان بکڕین دەبێت بگوازینەوە بۆ خانوویەکی زۆر خراپتر تاوەکو کرێیەکەی کەمتر بدەین.

بەمشێوەیە ماڵمان گواستەوە بۆ خانوویەك کە تەنها یەك ژووری هەبوو، جگەلەوەش خانووەکە لە قوڕ دروستکرابوو، نەماندەزانی سك تێربوون و خواردنی خۆش چیە، وامان لێهات تامی گۆشتمان لەبیر کردبوو کە تامی چۆنە؟، خۆشترین خواردنی ئێمە لەو کاتدا نان و رۆن و چایە بوو ئەو خواردنەش هەموو رۆژێك نەبوو بیخۆین.

ژیان زۆر دوور و درێژه لەگەڵ روودانی هەر رووداوێکی خراپ دەڵێت ئیتر ئەو کۆتایی ژیانەمە دەمرم، بەڵام لە ژیانیش هەر بەردەوام دەبیت لەگەڵ بەردەوام بوونیشت رووداوی زۆر خراپتر دەبینیت، ئەوەی گرنگ بێت تۆ لە ژیانیت و دەبێت بەردەوام بیت، ئیتر ژیانمان زۆر خراپتر بوو کاتی چوونە قوتابخانەی من هات نەمتوانی ئەو خەونەی هەمبوو جارێکی تر بیریشی لێبکەمەوە، وامدەزانی من هەقی خوێندنم نیە و دەبێت ئەو خولیاو ئاواتەی هەمە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی براکەم رێگایەکی تر بدۆزمەوە، بۆیە دەستم بە فرۆشتی گولەبەرۆژەکرد لەسەر سنی، ئەمجارە گووتم دەبێت هەرچۆنێك بووە دەوڵەمەند بم بۆ ئەوەی براکەم رەوانەی دەرەوەبکەم و لەوێ چارەسەر وەربگرێت.

هێواش هێواش ژیانمان بەرەو ناخۆشی زیاتر دەرۆیشت، تائەو کاتەی باوکم توانایی دانی هیچ کرێیەکی نەما، بۆیەماڵمان گواستە بۆ خانوویە کە سێ ماڵی ترو خاوەن خانووە کە کە پیرەژنێك بوو بەناوی بەدری تیادا دەژیان.

لەکاتەدا خودا دەرگایەکی بەزەیی خۆی لێکدرینەوە باوکم کارێکی دەست کەوت، هەرچەندە هەمووومان لە دەست ئەو پیرەژنە زۆر بێزاربوون زۆر ئازاری ئێمەی دەدا، بەڵام باوکم دەیگووت پێویستە کەمێك لێرە دان بەخۆمان دابگرین تاوەکوو هەندێك پارە کۆبکەینەو خانوویەك بۆ خۆمان بە یەکەوە بنێن، ئەو پیرەژنە هێندە خراپ بوو تەنانەت دەبووایە پرس بەو بکەیت و ئەوکات بچتە سەر ئاو، لەبیرمە رۆژێك منی لەسەر ئاو بە گوێچکە دەرهێنا گووتی تۆ ئەمڕۆ دووجار چوویتە سەر ئاو ئاوابڕوات خێرا بیرەکە پڕدەبێتەوە.

ژیانی کرێچیاتیمان هێندە ناخۆش بوو لەبیرم نایەت چەند خانوومان گۆڕیوە، ناخۆشترین ژیانمان لەگەڵ ئەو پیرەژنە بەڕێکرد، هەرچۆنێك بوو دوایی دانبەخۆ داگرتنێکی زۆرمان باوکم کەمێك پارەی کۆکردەوە و دوایی دانەوەی قەرزە کۆنەکەمان لە نزیك ماڵی گوڵناز پوورم پارچە زەوییەکی کڕی، بەڵام هیچ پارەیەکمان نەبوو لەسەر ئەو پارچە زەوییە تەنها یەك ژووریش دروست بکەین.

هەرچۆنێك بوو خۆمان دەستمان بەكار كردن كرد تیایدا، ئەگەرچی لەو كاتەدا دایكم دووگیان بوو، بەلاَم لەگەڵ باوكم هەموو كارێكی ئەنجام دەدا رۆژانە بەجۆرێك ماندوو دەبوو هەندیكجار دەیگووت واهەست ناكەم ئەو مندالّەی نێو سكم مابێت.

ژیان بەهەموو جۆرە سەختیەكی تێپەڕدەبێت منیش دەمگووت دەبێت بەرامبەر هەموو سەختیەك بووەستم چۆك دانەدەم، بەهەرجۆرێك بوو تەنها یەك ژوورمان لەسەر پارچە زەوییەكەمان دروست كرد، بەلاَم جارێكی تر كەوتینەوە ژێرباری قەرزكردن، ئەمجارەیان باوكم هەندێك پارەی لە مالّی پوورم گولّناز وەرگرت، بەدەرلەوەش مێردی شادی كە ناوی قادر بوو پیاوێكی زۆر باش بوو، خاوەنی شوێنی فرۆشتن چیمەنتۆ و قوم بوو، ئەویش بۆ دروست كردنی ئاودەست و حەمام یارمەتی داین هەندێك كەل وپەلی بۆ ناردین، وەك گووتم ئەوكات ئەویش لەگەڵ مالّی خالّەكانم ژیانی بەسەر دەبرد، شادی لەو پیاوەدا سێ كوڕی هەبوو بەناوەكانی (محمد، زیاد،هاودەنگ).

لەگەڵ ئەوەی خانوەكەمان تەواو ئامادە نەبوو بۆ ژیان، پیرەژن گووتی چیتر نابێت لێرە بمێنن دەبێت مالّتان بگوازنەوە، ناچار مالّمان بردە نێو خانووە تەواو نەكراوەكە، بەدر لەوەش رۆژانە كارمان تیایدا دەكرد، ئەوسالّە زستانەكەی زۆر سارد بوو، لەگەڵ ئەوشدا سۆپامان نەبوو ئەوكاتە گولّناز گوایە بەزەی بەئێمە دێتەوە سۆپایەكی پێداین كە پێدەگووتر سۆپای عەلائەدین، زۆر دلّمان بەو سۆپایە خۆش بوو گووتمان ئیتر سەرمامان نابێت، بەلاَم دوایی ئەوەی سۆپاكە بۆ ماوەی بیست خولەك كاری كرد بە جۆرێك گرپەی كرد هەریەكەو بەلایەكدا رامانكرد باوكم بۆ ئەوەی مالّەكەمان ئەوەی هەیە و نیە نەسوتێ سۆپاكەی بە ئاگرەكەوە بردە دەرەوە هەندێكی دەستیشی سوتا، ئێمە وەمانزانی هیچ كێشەیەك لە سۆپاكەدا نیە دواتر بۆمان دەركەوت كێشەكەلە سۆپاكەدایە و كە چەندین جار دووبارە بوویەوە، باوكم گووتی ئەگەر ئەو سۆپایە باش بووایە ئەوا گولّناز بە ئێمەی نەدەدا بۆیە سۆپاكەمان فڕێدا.

ئەو ساڵە ئەگەرچی خانووی خۆمان کرد و کەمێك دڵخۆش بووین، خانووەکەمان تەنها بەناو خانوو بوو، جۆرەها زیندەوەری لە نێو کەلێنی دیوارەکان دەهاتنە دەرەوە، هەربەیانیەك چاوەکانم دەکردەوە سەیرم دەرکرد کرم لەسەر دەم و چاومە، جگەلەوەش ئێمە تەنها دەمانتوانی لەلایەکی ژوورەکە بنوین بە هۆی ئەوەی تەواوی لاکەی تری ژوورەکە دلۆپەی دەکرد و ئاوی باران دەهاتە ژوورەوە.

باوکیشم بە هەموو شێوەیەك کاری دەرکرد بۆ ئەوەی قەرزەکان بداتەوە بەتایبەتی ئەوەی ماڵی خوشکەکەی گوڵناز هەموو رۆژێك کوڕەکەیانی بەناوی رێبین دەنارده سەرمان بۆ دانەوە پارەکەیان، لەلایەکی تر دایکم تازە منداڵی ببوو بەمجۆرە ژمارەمان بوو بە پێنج منداڵ، ناوی منداڵە نوێیەکەمان نا چنار.

لەگەڵ ئەوەی دایکم تازە منداڵی ببوو بەڵام هەر خەریکی رێکسختی خانووە کە بوو، رۆژێك خوشکەکەم شاناز کە بە چوار ساڵ بەر لەچنار لەدایك ببوو، بانگی منی کرد کاکە وەرە سەیربکە جوجەکان سەری چناری خوشکم دەخۆن، زۆر بەخێرایی رامکرد کە چوومە ژوورەوە بینم ژمارەیەکە زۆر مێروستا لە نێو بێشکەی چنار دینە دەرەوە و گۆشتیان بە دەمەوەیە، خێرا هاواری دایکم کرد وەرە دایکە مێروستانەکان خەریکە چنار پارچە پارچەی دەکەن و دەیخۆن.

دایکم لەگەڵ ئەوەی تازە منداڵی ببوو زۆر بەخێرایی هاتە ژوورەوە و سەیری کرد مێرووستانەکان خەریکە سەری چنار کوون دەکەن و دەچنە ناو سەرییەوە، زۆر بەخێرایی هەموو مێرووستانەکانی لێکردووە خوێن بەسەری چنار دادەهاتە خوارەوە.

بەدەبەختیەکانی ئێمە هەر بەوەندە نەوەستا دایکم بەهۆی ئەوە تازە منداڵی ببوو زۆر بەخێرای ریکرد زۆر بەخراپی نەخۆش کەوت، هیچ کەسێك نەما خزمەتی ماڵەوە بکات، لەبەر ئەوە پوورم شەوین هاتە ماڵی ئێمە، کەبینی بارووودۆخی ئێمە زۆر تەواو نیە هەڵسا ئەلقەکەی دەستی خۆی فرۆشت بۆ ئەوەی جگەر بۆ دایکم بکرێت، دکتۆر گووتی

ئەو ئافرەتە ماوەیەکی زۆرە خواردنێکی باشی نەخواردووە پێویستە جگەر بخوات بۆ ئەوەی کەمێك هێزی بێتەوە بەر.

ئەوشەو بۆ یەکەمجار دوایی ماوەیەکی زۆر لە ژیانمدا خواردنێکی خۆشم خوارد، دایکم گووی خوشکم پارەت لە کوێ هێنا؟.

پوورم گووتی ئەلقەکەی دەستم فرۆشت تازە هیچ کارم بەو ئەلقەیە نەماوە، لە فاخیری مێردم جیابوومەوە.

دایکم گووتی من ئاگام لەوە نیە تۆ چۆن لەگەڵ ئەوە کوڕە هاوسەرگیریت کرد و چۆن تەلاقت وەرگرت؟.

پوورم گووتی بوەستە هەموو شتێکت لە سەرەتاوە بۆ باس دەکەم، ئەوەکاتەی هێرشی برامان لە کۆڵان بەشەڕ هات و کەوتە زیندان لە زیندان هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەو فاخیرە پەیداکرد، کە فاخیر بەهۆی دزیکردنەوە کەتبووە زیندانەوە.

کاتێ هێرش لە زیندان ئازاد بوو گەڕایەوە گووتی لە زیندا کەسێکم ناسی ناوی فاخیر بوو نامەیەکی داوەتە من بۆ ماڵی باپیری ببەم کە خوشکەکەی لەوێ دەژی، گووتی ئێمە دایك و باوکمان کوژراوە و لەلای باپیرم دادەنیشن بە هۆی هەژاریەوە دزیم کردووە وماوەیەکی زۆر لێرە نامەێنەوە هەر تەنها دوومانگ دەمێنەوە، ئیتر ئەو کوڕە ناونیشانی ماڵی باپیری داوەتە من لەو رۆژانە بۆیان دەبەم، خۆشت دەزانی دایکیشم چەند مانگێك بەر لەئێستا لەلای قادر نەحەواوە و تەلاقی وەرگرت، بە هێرشی گووت کوڕم مادەم دەزانی کوڕێکی باشە زۆر ئاساییە بیهێنتەوە ماڵەوەش.

دوایی ئەوەی هێرش نامەکەی بۆ ماڵی باپیری کچەکە برد، کە گەڕایەوە هێندە باسی جوانی و بە ئەخلاقی خوشکی ئەو کوڕەی دەکرد، دایکم هەستی پێکرد هێرش هەستێکی بۆ ئەو کچە هەیە، گووتی مادەم کچێکی باش و بە ئەدەبە بۆچی بۆ خۆت نایهێنی؟.

هێرش زۆری پێ خۆش بوو گووتی ئاخەر دەبێت ئەو کوڕە لە زیندان ئازاد بێت ئەو کات دەتوانین داوای بکەین.

دوایی ئازاد بوونی فاخیر هێرش خێرا ئەو کوڕەی هێنایە ماڵەوە، لە سەرەتادا هیچ باسی ئەوەی نەکرد تەمای ئەوەی هەیە خوشکەکەی بهێنێت، بەمشێوەیە هەموو رۆژێك یان فاخیر لەماڵی ئێمە بوو یان ئێمە لەماڵی ئەوان بووین.

رۆژێك هەمووومان دانیشتبووین زۆر بێتاقەت بووین شیرینی خوشکمان گووتی هەڵسن با هەندێك دڵی خۆمان خۆش بکەین تەمسیل دەکەین و دەنگەکان خەزن دەکەین وەك یادگاری دەمێنێتەوە.

لەو تەمسیلەدا من رۆڵی بووکم دەبینی و فاخیریش رۆڵی زاوی دەبینی، سیناریۆکەمان وابوو بەر لە هاوسەرگیری کردن ئێمە یەکترمان خۆش دەویست بەڵام رێگری زۆر هەبوو بۆ ئەوەی بەیەك نەگەین، فاخیر هەموو شتێکی کرد بۆ ئەوەی بەمن بگات لە کۆتایدا بەیەك گەیشتن و هاوسەر گیریمانکرد.

لەو رۆژە بەدواوە من وفاخیر دڵمان کەوتە سەر یەکتر، لەبەر ئەوە کاتێ هێرش داوای نازەنین خوشکی فاخیری کرد، فاخیریش گووتی دەبێت شەوین بەمن بدەن.

بەم شێوەیە هاوسەرگیریمان کرد، فاخیر بەڵینی دا واز لە هەموو کارێکی خراپ بهێنێت و بەڵێنەکەشی بردەسەر، بەڵام ئەوەی کێشەی بۆ ئێمە دروست کرد شادی دایکم بوو، بەڕاستی لەگەڵ نازەنین زۆر خراپەکاری بەکاردەهێنا، بەهۆی ئەوەی نازەنین رۆژێك ئەوەی لەگەڵ پیاوێك بینی بوو، دایکیشم لەترسی ئەوەی ئاشکرا نەبێت هەموو رۆژێك بە دەستی هێرش نازەنینی بە لێدان و تێهەڵدان دەدات، هەتا رۆژێك دایکم هێرش نازەنینان بردە ژوورەوە جلەکانیان لەبەر کردبویەوە هێندەیان لێدا نازەنین بەرگەی نەگرت بە رووتی رایکردە دەرەوە، بینم هێرش یەك تۆپ پرچی ئەوە ئافرەتە بەستەزمانەی لە نێو

دەست دایە، ئەو ئافرەتە دەپاڕایەوە و دەگریا دەیگوت بەس لێمەدەن هیچم نەکردووە، دایکم هەر ڕۆژێك و جۆرە بوهتانێکی بۆ ئەو داماوە هەڵدەبەست.

کارەکان تا ئەو ڕادەیەش هەر باشبوو تاوەکو ڕۆژێك فاخیر شادی لەگەڵ پیاوێکی هاوڕێی دەبینێت ئەویش هیچ قسەیەك ناکات و خۆی پێیان نیشانناداتت، دواتر فاخیر بە هاوڕێیەکەی دەڵێت فلاّنە ڕۆژ ئەوە ئافرەتە کێ بوو لەگەڵ تۆ دابوو، ئەویش هەموو شتێك بە فاخیر دەڵێت بۆیە فاخیر بە هێرش دەڵێت دایکت کارێکی لەو جۆرە دەکات پێویستە ئەو ژنە بکوژرێت ئەگەر تۆ ناتوانیت من دەیکوژم کاری زۆر خراپ دەکات هەروەك شەیتان وایە نێوانی هەموومان تێکدەدات.

هێرشی برام جگەلەوەی ڕازی نەبوو ئەو کارە بکرێت هەمووشتێکی بەدایکیشم گووت، لەبەر ئەوە دایکمان بەڕێوەبەری پۆلیسی دەناسی بە تاوانێکی درۆینی دزی فاخیر خستە زیندانەوە، دوایی ئەوە دایکم گووتی ئەو کوڕە دزی کردن تەرك ناکات شەوین دەبێت لەو کوڕە جیاببیتەوە، منیش بەدزی چوومە لای فاخیر گووتی لەو کاتەی بەڵێنم بەتۆ داوە دزیم نەکردووە.

کاتێ دایکم زانی بە بێ پرسی ئەو چوومەتە لای فاخیر دایکم و هێرش زۆریان لێدام، منیش گووتم هەرچیەك بکەن بشم کوژن لەو کوڕە جیانابمەوە من ئێستا لەو کوڕە دووگیانم، کاتێ ئەوان زانیان من لە فاخیر دووگیانم، دایکە شەیتانەکەم دەست و پێیەکانمی بەستایەوە و منی گرت گووتیە هێرش بەسەر سکی بکەوە، ئەویش بەسەر سکم کەوت و هێندەی لێدام تاوەکو منداڵەکەم لەبارچوو، ئیتر ژیانم لەبەر چاو کەوت خێرا شادی نازەنینی بە هێرش تەڵاق داو من و فاخیریش بەگریانەوە لەیەکتر جیابووینەوە، زۆر حەزدەکەم جارێکی تر فاخیر ببینمەوە.

ئیتر ئەوە شەوە ئەگەرچی خواردنێکی خۆشم خوارد کە دەمێك بوو خەوم بە جۆرە خواردنەوە دەبینی بەڵام خەمێکم بینی تاوەکو بەیانی خەو نەچوویە چاوەکانم، خودایە

داپیرم دەبێت شەیتان بێت یاخود مرۆڤ، ئەو هەموو کارە خراپە چۆن دەتوانێت ئەنجامبدات؟!.

لەگەڵ خوشکەکەم ماردین کاتی ئەوەمان هات بچینە قوتابخانە و دەست بەژیانێکی نوێ بکەین، دایکم بۆ ئەو بابەتە قسەی لەگەڵ باوکم کرد گووتی ناردنی محمد و ماردین بۆ قوتابخانە پێویستی بە هەندێك پارە هەیە، ساڵی پار دەبوایەو ئەو کوڕە بچێتە قوتابخانە بەڵام گووتت ئەو ساڵ بانەچێت بەڵکو ساڵی دابێت پارەم دەبێت جل و بەرگی بۆ بکڕم و رەوانەی قوتابخانەی بکەم.

باوکم گووتی قوتابخانەی چی من خۆم یەك دینارم نیە چۆن دەتوانم جل و بەرگ بۆ ئەو دووانە بکڕم و رەوانەی قوتابخانەیان بکەم، وازیان لێبهێنە کەی پارەی ئەوەم هەبوو جل و بەرگیان بۆ بکڕم دەیان نێرینە قوتابخانە.

ئەو رۆژەی بەبیردێتەوە وەك ئەوە وایە بە خەنجرێك جەرگم پارچە پارچە بکرێت، دایکم و باوکم کردیانە دەمەقاڵێ، دایکم دەیگووت رێگە نادەم ژیانی ئەو مندالأنە وەك ژیانی ئێمە لە ناوبچێت.

باوکم گووتی من یەك دینارم نیە خۆت چۆن دەیانێریت بۆ قوتابخانە بیاننێرە، پارەی وێنە گرتن و جل و بەرگ و ئەو شتانە لە کوێ بهێنم... پارەمان نیە نانی پێبکڕین.

دایکم گووتی زۆرباشە تەنها پارەی تەکسیم پێبدە بچمە ماڵی باوکم لەوێ هەندێك پارەیان لێوەردەرگرم دیاننێرینە قوتابخانە.

باوکم گووتی تۆ دەڵێت لە زمانی کوردی تێناگەیت کە پارەم نەبێ چۆن پارەی تەکیست بدەمێ.

منیش گووتم دایکە تەخوا مەیکەن بەشەڕ و ژاوەژاو ناچم بۆ قوتابخانە تەنها ئێوە مەیکەنە شەڕ.

دایکم گووتی رێگە نادەم ژیانی ئێوە وەك ئێمە بە کۆلەواری و نەخوێندەواری بچێتە سەر، هەرچۆنێك بێت ئێوە دەبەمە ماڵی باوکم لەوێ پارەیان لێوەردەرگرم ڕەوانەی قوتابخانەتان دەکەم، ئەو عارەبانەکەی خاڵت لێرەیە چەند رۆژێك بەر لەئێستا هات و نەیبردۆتەوە ئێستا ئێوە هەمووتان سواری عارەبانەکە دەکەم دەچینە ئەوێ، هەم ئەمڕۆ هیچ نانێکمان نیە لە ماڵەوە بیخۆین هەمیش پارەیان لێوەردەگرم بۆ ئێوە.

دایکم هەرچەندە نەخۆش بوو بەلاَم بۆ ئەوەی ژیانی ئێمە تێك نەچێت شەرواڵێکی باوکمی لە پێکرد و هەموومانی خستە سەرعارەبانەکە و بۆ ماڵی داپیرم بەڕێکەوتین، هەرچۆنێك بوو پارەی ئەوە پەیدابوو بچینە قوتابخانە، من و خوشکەکەم لە تەك یەکتر دادەنیشتین مامۆستاکان وایان ئەزانی ئێمە دووانەین نەیاندەزانی من ساڵێك لە خوێندن دواکەتووم، دواتر بەهۆی ئەوەی خوشکم لە پۆلی یەك دەرنەچوو لەیەکتر دابڕاین.

لەو رۆژەی کە جلی قوتابخانەم لەبەرکرد نەمدەزانی چۆن خۆشی خۆم دەربڕم، ئەو خۆشییەی من هەمبوو باوەڕناکەم هیچ کەسێك لە ژیاندا هەیبووێت، لەبەر ئەوەی پێم وابوو دەتوانم ببم بە دکتۆر و ژیانی براکەم رزگار بکەم، وەك هەموو جارێك ئەو خۆشییەم تاوەکو سەر نەبوو، من خوشکەکەم سێ رۆژ جارێك یەك دینارمان بۆ قوتابخانە دەبرد، رۆژێك کاتی ئەوە بوو باوکم پارەکەمان بداتێ بەلاَم نازانم نە پێی نەبوو نە لەبیری کرد بمانداتێ چووە دەرەوە، منیش گووتمە خوشکم تۆ بەدوام مەکەوە دەزانم باوکم لەماڵی مامە دەچم پارەکە دەهێنم و دێمەوە و دەچینە قوتابخانە، من کە بەرەو ماڵی مام بەڕێکەوتم بێئاگالەوەی خوشکەکەم بەدزییەوە بەدوام کەوتووە، لەشەقامی سەرەکی پەڕیمەوە هەرکە زانیم پاسێك ستۆپی کرد بینم خوشکم لەپاسەکە رزگاری بوو سەیارەیەك زۆر بەتووندی لێدا، منیش زۆر ترسام گووتم خوشکەکەم مرد، لەترسان چوومە ماڵی مام باوکیشم لەوێ بوو دانیشتم بەبێ ئەوە هیچ شتێك بڵێم.

هەرکەزانیمان زۆر بەبەهێزی لە دەرگادرا و کەسێك خۆی بە ژوورەوە داکرد، هاواری کرد مام تەها مام تەها کچەکەت سەیارە لێیدا و کەتووبووە ژێر سەیارەکەوە ئێستا دەریان هێناوە و رەوانەی نەخۆشخانەیان کردووە.

باوکم بە خێرایی هەڵسایەوە گووتیە من برۆ بەدایکت بڵێ بێتە نەخۆشخانە، منیش کە زۆر زووتر دەمزانی خوشکەکەم سەیارە لێیداوە لەترسان هیچ قسەیەکم نەکرد، چوومەوە ماڵەوە سەیرم کرد دایکم دەگریت، گووتی دایکە چی بووە بۆچی دەگریت؟.

گووتی کورِم زۆر خەمی ئەوەمە ماردینی خوشکت لەبەیانیەوە داوای ماستی دەکرد پارەمان نەبوو بۆی بکرین ئێستا دەمێکە چۆتە دەرەوە غەریبم هەڵسا کاتێ بەبیرم هاتەوە دەستم بەگریانکرد.

گووتی بەراست ئەوە تۆ بۆچی نەچوویتە قوتابخانە؟، ئەی ماردینی خوشکت لە کوێیە؟.

گووتم دایکە ماردین سەیارە لێداوە.

گووتی چی یەك بە دەنگی هاواری کرد و لە خۆدانی دەست پێکرد، ئەی ئێستا کچەکەم لەکوێیە؟.

گووتم باوکم منی ناردووە تاوەکو تۆش بچیتە نەخۆشخانەی فریاکەتن ئێستا ماردینیان بۆ ئەو نەخۆشخانەیە بردووە.

گووتی خێرا بچۆ ماڵی پوورت گوڵناز دە دیناری تەکسی لێوەربگرە لەگەڵ پیلاوکیش بهێنە من پێلاوم نیە لەپێ بکەم.

منیش بەخێرایی رامکرد ماڵی پوورم دە دینار و پێلاّوێکم لێوەرگرت و گەڕمەوە ماڵەوە، دایکم گووتی کوڕم تۆ لەماڵ بمێنەوە تاوەکو ئێمە دەگەڕێنەوە ئاگات لە خوشك و براکانت بێت.

دوایی ئەوە من زۆر نەفرەتم لە خۆم دەکرد چۆن خوشکەکەم لەگەڵ خۆم نەبرد، ئەی ئەگەر ئەو جارێکی تر نەگەڕایەوە من چۆن بچمە قوتابخانە و لەگەڵ کێ بچمە قوتابخانە؟.

ئەو رۆژە تاوەکو ئێوارە هیچ هەواڵێکی خوشکەکەم نەدەزانی، جگەلەوەش هیچ شتێکمان نەبوو لەو ماڵەوە بیخۆین، خوشك و براکانم دەستیان بەگریان کرد ناچار منیش قاپێکم لە دەستم گرت و چوومە ماڵی پوورم گوڵناز گووتم منداڵەکانی ماڵەوە زۆر برسیانە ئەگەر شتێکمان پێبدەیت بیخۆین.

گووتی وەرە ژوورەوە سەیرم کرد دۆڵمەیەکی زۆر خۆش لەسەر سنی رووکراوە، سەیرم کرد وەك گاڵتەکردنێك بە ئێمە ئەو پەلکانەی لەسەر سفرەی نانخواردن کەتووە کۆیکردەوە و لەگەڵ هەندێك نان بە منی دا گووتی برۆ وابزانم زۆر دەمێکە خواردنی واتان نەخواردووە.

ناچار من هەرچۆنێك بێت نانەکەم وەرگرتووە بە چاوە پڕلەفرمێسکەکانم گەڕامەوە ماڵەوە و خواردنەکەم بۆ خوشکەکانم و براکەم دانا و بەهۆی کەمی خواردنەکە من خۆم نەمخوارد.

دەمەو ئێوارە دایك و باوکم و خوشکم گەڕانەوە ماڵەوە لەو کەسەش خۆش ببوون کە بەسەیارەکەی لە خوشکمی دابوو.

جارێکی تر کەمێك دڵخۆشی باڵی بەسەر خێزانەکەماندا کێشایەوە، ئەو دلخۆشییەمان زۆری نەخایاند بۆ بەیانیەکە براکەم باروو دۆخی تێکچوو ناچار دایکم لەگەڵ ئەو بۆ

نەخۆشخانە گەڕایەوە، ژیانمان بەجۆرێك ناخۆش ببوو، هەموو کەسێك دڵی بە ئێمە دەسووتا تەنها خزم و کەس و کاری باوکم نەبێت کە وەك شەیتان وابوون.

دایکم یەك هەفتە لە نەخۆشخانە لەگەڵ براکەم مایەوە ناچار منیش لەو ماوەیە ئاگاداری خوشك و براکانم بووم، وام لێهاتبوو خوشکە بچووکەکەم بەمنی دەگووت دایکە، دوایی ئەم هەموو ڕووداوەی ژیانم وامدەزانی ئەگەر خۆشییەك ببینم دەبێ خێرا ناخۆشییەکی گەروەتر ببینم، بۆیە دوایی ئەوە دووعایی ئەوەم نەدەکرد هیچ خۆشییەك ببینم دەترسام لەوەی ناخۆشییەك بەدوایدا بێت.

دوایی گەڕانەوە دایکم لە نەخۆشخانە پوورم گوڵناز خێرا خۆی گەیاندە ماڵی ئێمە، وامانـدەزانی لەبەر ئەو ڕووداوە ناخۆشانەی ڕوویانداوە هاتووە، بەڵام بەدایکمی گووت کوا ئەو دەدینارەی پێتم دا لەگەڵ پێڵاوکەم بدەوە، دایکیشم گووتی بەخوا هیچم پارە پێنیە پێتی بدەمەوە، بەڵام ئەوەتا پێڵاوکەت ببەوە دواتر پارەکەت بۆ دەنێرمەوە.

گووتی باشە بەڵام لەبیر نەکەیت زوو پارەکەم بۆ بنێرەوە، کاتێ سەیری پێڵاوکەی کرد گووتیە دایکم ئەوە تۆ مرۆڤی بنی پیلاوکە زۆر خراپبووە دیارە گەلێك زۆر بەو پێڵاوە گەڕاویت.

دایکم گووتی بەخوا پیلاوکەی تۆ هەر خۆی وابوو، من لە نەخۆشخانە زیاتر نەچوومەتە هیچ شوێنەك پێڵاوکەت هەر خۆی وابوو.

پوورم گووتی ئاخ لەدەست ئێوە بەڵێن بێت بە مێردەکەم بڵێم ئەو خانووە بفرۆشێت و لە ئێوەی دەرۆزەکەر ڕزگارمان بێت.

دایکم لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەی هەیبوو دەستی بەگریانێك کرد هەزارجار گووتی خودایە کەی ڕۆحم بۆ خۆت دەبەیتەوە.

بەمشێوەیە لەگەڵ ناخۆشییەکانی ژیان رێمان دەکرد تا ئەو کاتەی باوکم ئیشێکی باشی دەست کەوتوو برە پارەیەکی کۆکردەوە، بڕیاری دا بەیارمەتی کەمێك لە هاوڕێیەکانی سەری خانووەکەمان بکاتە چیمەنتۆ، بۆیە ئەو ناو ماڵە کەمەی هەمانبوو گواستیەوە بۆ ماڵی مامم، من وباوکم لە ماڵی مامم دەماینەوە دایکم خوشك و براکانیشم لە ماڵی شادی داپیرم دەمانەوە.

ئەو رۆژانەی باوکم دەچوو بۆ کار یاخوود دەچوویە سەرکاری خانووەکەمان من دەبووایە لەو سەرمایەی زستان لە دەروە بمێنمەوە لەبەر ئەوەی مامۆژنم زۆر خراپ لێیدەدام دەری دەکردمە دەرەوە، منیش بۆ ئەوەی باوکم تورە نەبێت هیچم لەلای باوکم باس نەدەکرد، تاوەکو رۆژێك بارانێکی زۆر بەهێز بوو مامۆژنم منی رەوانەی کۆڵان کرد و دەرگایی لەسەر من داخست هەرچەندەی لە دەرگام دا دەرگای لێم نەکردەوە، زۆر لەدەرەوە مامەوە بەهەموو گیانمدا ئاو دەهاتە خوارەوە لەوکاتەدا باوکم هاتەوە گووتی ئەوە چی دەکەیت لە دەرەوە؟.

منیش گووتم بۆ خۆم هاتووەمەتە دەرەوە.

گووتی ئەوە مامۆژنت دەگووت ئەو کوڕەی تۆ زۆر بەڕەڵایە باوەڕم پێینەدەکرد ئەو ئێستا بەچاوی خۆم بینم.

باوکم زۆر تورە بوو کەوتە لێدانم هێندەی لێدام هیچ توانام نەما، بەڵام هەر خۆم راگرت و باسی هیچم نەدەکرد تا ئەو کاتەی باوکم بەجگەرەکەی دەستی زۆر شوێنی لاشەمی سوتان توانایی بەرگە گرتنم نەما گووتم بەسە هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم، کاتێ هەموو شتێکم بۆ باوکم باسکرد باوکم زۆر تورە بوو خێرا چووە ژوورەوە زۆر قسەی بە مامۆژنم گووت.

مامۆژنم گووتی زیاتر قسه بکەیت کەل و پەلەکانتان هەمووی هەڵدەدەمە درەوە، بۆ نازانم ئێوه که کچەکەتان سەیارە لێدا پارەیەکی زۆرتان لەو داماوە وەرگرتووە تاوەکوو خانووەکەتان چاك بکەن.

باوکم که گوێی لەو قسەیە بوو زلەیەکی له مامۆژنمدا، لەبەر ئەوە بوهتانێکی زۆر گەورەیان بۆ دروست کردبووین که گوایە پارەمان لەو کەسەی به سەیارە له خوشکمی داوە وەرگرتووە،ئەوەی راستی بێت ئەو ماڵە دووجار هاتن بۆ ماڵی ئێمە هەندێك میوەیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا، باوکم پێی گووتن ئەگەر وەك میوانێك دێنە ماڵی ئێمە ئاساییە بەڵام ئەگەر لەسایەی ئەوە دێن که له کچەکەی منتان داوە جارێکی تر بۆ ماڵی ئێمە مێن، دوایی ئەوە جارێکی تر من ئەوانم نەبینی بێنەوە ماڵ ئێمە.

دوایی ئەوە مامۆژنم له باوکمی دایەوە رووخساری باوکمی به نینۆکەکانی هەمووی بریندار کرد.

باوکم زۆر تورە بوو گووتی هیچ هەڵەی تۆی تیادانیە هەمووی تاوانی برا بێکەڵکەکەمە تۆ هێندە زمان و دەستت درێژبووە، دوایی ئەوە باوکم سەیارەیەکی هێنا و هەموو کەل و پەلەکانمانی خستە ناو سەیارەکە ئەگەرچی تا ئەو کاتە خانووەکەمان هێشتا کاری تیادا مابوو ناچار گەڕاینەوە ماڵەوە و بەمشێوەیە پێوەندیمان لەگەڵ ماڵی مام پچڕا.

بەمشێوەیە نێوانی ئێمە و ماڵی مامم بەردەوام بوو تائەوکاتەی مامم زانا ژنی مارەکرد له کاتی مارە کردن به ئێمەیان نەگووت، بەڵام زۆر شەرمیان له خۆیانکردبوویەوە لەبەر ئەوەی له کاتی مارەکردن ماڵی بووکەکە گووتبوویان بۆچی براکەی تر نەهاتووە؟، ئەوانیش وەك پیشەی هەمیشەی خۆیان درۆیەکیان بۆ باوکم هەڵبەستبوو گووتوویان منداڵەکەی زۆر نەخۆشە نەیتوانیوە بێت، بۆ ئەوەی ئەو شەرمەیان دووبارە نەبێتەوە مامم زانا به باوکمی گووت فلاڵنە رۆژ ژن دەگوازمەوە پێویستە تەنها خۆت بێت و

منداڵەکانت نەهێنیت، لەبەر ئەوەی براگەورەکەمان و ژنەکەی دەلێن نابێت جیهان بێتە ماڵی ئیمە.

نازانم ئێمە چ خراپەیەکی ئەوانمان هەبوو بە هەموویان تیری رق و قینەیان لە ئێمە بوو، وەك دایکم هەموو جارێك دەیگووت خودا لەسەرووی هەموومانەوەیە یارمەتیمان دەدات، هەرواش دەرچوو رۆژی گواستەوە ئێمە بۆ ماڵی مامم نەچووین لەبەر ئەوەی ئێمە بانگ نەکرابووین، بەلاّم وویستی خودا وابوو ئێمە لەو ئاهەنگەدا بەشدار بین، لەوەش زیاتر بگرە ئەوان خۆیان بە ناچاری بەدوایی ئێمەیان دانارد، بەهۆی ئەوەی ماڵی مامە گەورەکەم لەو رۆژەدا بەهۆی خواردنی بەسەرچووەوە ژەهراوی ببوون baroodoxi منداڵەکانیان زۆر خراپ بوو، بەمشێوەیە خوشکەکانی باوکم و هەندێك لە کەس و کارەکانی ترمان چووبونە سەردانی ئەوان لە نەخۆشخانە هیچ کەسێك لە ماڵەوە نەمابوو چێشتێك بۆ میوانەکان ئامادەبکات، ناچار بەدوایی بەشەرمەزارییەکی زۆرەوە بەدوایی دایکمیاندا نارد بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات، زۆر دڵمان بەوە خۆش بوو کە خودایی گەورە جارێکی تر کەمێك خۆشی بە ئێمە دایەوە.

وەك هەمووجارێك ئەو خۆشییەی ئێمە بەردەوام نەبوو، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانە باوکم پارەی بەقەرز لێوەرگرتبوون داوایی پارەکانیان دەکردەوەو بەتایبەتی گوڵنازی پوورم هەموو رۆژێك دەهاتنە دوایی پارەکەیان لە کۆتاجار گووتیان هیچ چارەیەك نیە پارەکەمان نەدەنەوە دەورو دروسێیەکانتان هەموویان دەهێنینە سەرتان، لەبەر ئەوە باوکم ناچار هەڵسا بە فرۆشتنی خانووەکە و پارە قەرزەکانی دایەوە، ئەو پارەشی کەمایەوە هەڵسا داری نەجاری پێکڕی و دەستی کردەوە بەکاری نەجاری، دووبارە ئێمەش کەوتینەوە خانووی کرێ و هەمان باروو دۆخی جاران.

نەمدەزانی بۆچی هەموو ناخۆشییەکانمان لە دوایی یەکتر وەك زنجیر بەدوایی یەکتر دا دەهاتن، ئەمجارەیان کەوتینە خانوویەك تەنها یەك ژووری بچووك بوو، بەزۆر جێگای نووستی ئێمەی تیادا دەبوویەوە، لەلایەکی تر هیچ جل و بەرگێکی قووتابخانەم نەبوو،

خوشکەکەم کچێکی دروا‌سیمان دوو کراسی سپی قوتابخانەی بۆ هێنا، منیش هیچ کراسێکی سپیم نەبوو لەبەری بکەم هەموو رۆژێك جلی رەنگاو رەنگم لەبەر دەکرد، تائەوکاتەی رۆژێك مامۆستا گووتی نابێت بێتەوە قوتابخانە تاوەکوو کراسی سپی لەبەر نەکەیت، ناچار من کراسێکی خوشەکەکەمم لە بەردەکرد، لەبەر ئەوەی کراسەکە تایبەت بە کچان بوو یەخەی کراسەکە گوڵ گوڵی بوو، زۆر شەرمم دەکرد ئەو کراسە لەبەر بکەم هیچ رێگەیەکی ترم لە پێش نەبوو، کراسەکەم لەبەر دەکرد و یەخەی کراسەکەم دەخستە ژووەرە، زۆرجار وا خۆم نیشان دەدا کە من ئاگام لەوە نیە یەخەی کراسەکەم چۆتە ژوورەوە، تاوەکو رۆژێك مامۆستا لە نێو پۆل گووتی هەڵسە ئەوە پرسیارە لەسەر تەختەکە وەڵام بدەوە، کاتیَ چوومە سەر تەختەکە.

مامۆستا گووتی ئەوە بۆچی یەخەی کراسەکەت چۆتە ژوورەوە دەزانی تۆ دایکت هیچ گرنگییەکت پێنادات.

گووتم نەخێر مامۆستا دایکم زۆرباشە زۆر گرنگم پێدەدات، بەلاّم کراسەکەم یەخەی تەڕبوو بۆیە وام لێکردووە تا ووشك دەبێتەوە.

قووتابیەکیش وەك شەیتان لە من پەیدابوو گووتی نەخێر مامۆستا ئەوە ماوەیەکی زۆرە هەموو رۆژێك من دەبینم یەخەکەی وایە.

مامۆستا گووتی یەخەکەت بهێنە دەرەوە پێت دەڵێم.

گووتم مامۆستا دواتر ئەو کاتەی ووشك بێتەوە دەیهێنمە دەرەوە.

گووتی پێت دەڵێم ئێستا واتا ئێستا تێگەیشتی.

ناچار یەخەی کراسەکەم هێنایە دەرەوە هەموو قوتابییەکان دایانە قاقای پێکەنین، منیش هێواش هێواش فرمێسك لە چاوەکانم دەهاتە خوارەوە.

مامۆستاکە گووتی بەسە گریان مادەم دایك و باوکت توانای کڕینی کراسێکیان نیە بۆچی تۆ دەنێرنە قوتابخانە؟ تۆ دەستبەرداری خوێندن ببیت زۆر باشترە یۆت.

دوایی ئەوە لە قوتابخانە زۆر دڵ تەنگ بوو هیچ کاتێکی تر یەخەی کراسەکەم نەدەخستە ژوورەوە هەموو قوتابیەکان گاڵتەیان پێدەکردم، لەبەر ئەوە منیش هەموو رۆژێك بەرۆکی دایك و باوکم دەگرت تاوەکو کراسێکم بۆ بکڕن.

باوکم گووتی کوڕم کارێکمان تەواو کردووە بەیانی جلی تەواوی قوتابخانە بە زیادەوە بۆ تۆ و خوشکت دەکڕم، من بەیانی زوو دەچمە سەر کارەکەم پارە وەردەگرم و لە بازار جل و بەرگت بۆ دەرکڕم.

ئیتر دڵم خۆش بوو بیرم لەوە دەکردوە جارێکی تر پێویست ناکات خۆم لەخەڵك بشارمەوە بۆ ئەوە کراسەکەم نەبینن، بەدڵی خۆم دەچمە گۆڕەپانی قوتابخانە و پیاسە لەگەڵ هاوڕێیەکانم دەکەم، هیچ کەسێك شەرم لەوە ناکات لەگەڵ من ببێتە هاوڕێ.

بەیانی زۆر زوو لەخەو هەڵسام گووتم باوکە ناچمە قوتابخانە تاوەکو تۆ دێتەوە، ئەو رۆژە هەر لە کۆڵان چاوەڕوانی باوکم بوو تاوەکو بگەڕێتەوە جل و بەرگەکەی لێوەربگرم، کاتێ بووە نیوەڕۆ باوکم بەدیارکەوت بەڵام هیچم لەدەستی نەبینی کاتێ نزیك بوویەوە سەیرکردنێك سەیری کردم خێرا تێگەیشتم لەوەی کە هیچ ئومێدێك نیە بۆ ئەوەی دڵی ئێمە خۆش بکات، بەڵام نەمزانی چی روویداوە باوکم جگە لەخەم هیچی تر لە چاوەکانی بەدی ناکرێت.

کاتێ چووە ژوورەوە بە دایکمی گووت ئەمڕۆ یەك قازانجی هێندە زۆرم کرد تا ماوین دڵخۆش دەبین.

دایکم گووتی چۆن پیاوەکە دەڵێ تۆ ئەمڕۆ تێکچوویت ئەی بۆچی هیچ جلێکت یۆ ئەو کوڕە نەهێناوە؟.

جلی چی ئافرەت ئەمڕۆ ئەوەی هەمانبوو نەمانبوو لەدەستمان چوو ئیتر دەبێ ئەو جلانەی بەریشمان بفرۆشین بۆ ئەوەی بژین.

ئەوە تۆ چی دەڵێیت چی روویداوە پیاوەکە بە روونی قسەبکە؟.

باوکم گووتی ئافرەت ئەمڕۆ دوایی ئەوەی ئەو بینایەمان تەختە ڕێژکرد سەبەیان تێکرد بەلاّم بەهەڵەیەکی ئەندازیارەکە بیناکە رووخا خۆشبەختانە هیچ کەسێك نەمرد، ئیتر هەموو دارەکانمان لە ناوچوو، هەتا زوو دەبێت خانوویەکی دوور بدۆزینەوە، ئەگەرنا لێرە ناتوانم کرێی خانوو بدەم.

جارێکی تر خۆشییەکانی من بوویەوە بە گریان و زاخاو ئیتر ئەو رۆژە گووتم تەواو هیچی تر ناگەڕێمەوە قوتابخانە، حلمیە دایکی باوکم کاتێ گوێی لەو هەواڵە بوو شەو هاتە ماڵی ئێمە بە باوکمی گووت کوڕم تۆ هیچ خەم مەخۆ من خۆم یارمەتیت دەدەم ئەمڕۆ هاتووم تاوەکو بمبەخشن لەو کارانەی بەرامبەر ئێوەم کردووە، بەهۆیی ئەوەی براگەورەکەت دەرمانم بۆ دەکڕێت خۆم لە هەموو تاوانەکان بێدەنگ کردبوو زۆر پشتی ئەو ژنەکەیم دەگرت بۆ ئەوەی لێم توڕە نەبن و دەرمانەکانم بۆ نەکڕێت.

روویکردە دایکم گووتی لەبەر خاتری خودا تۆش من ببەخشە زۆر ئازاری تۆم داوە.

دایکم گووتی لەدایکم زیاتر تۆم خۆش دەوێت، وابیر بکەوە هەر هیچ روویینەدابێت.

داپیرم گووتی ئێوە هیچ خەمێکتان نەبێت خۆم هێواش هێواش یارمەتی ئێوە دەدەم، ئێستا دەبێت بچمەوە ئەو بڕە پارەیەم بۆ هێناون بۆ خۆتان بیکەنە خەرجی منداڵەکانتان.

هەرئەوکات باوکم چوویە لای هاوڕێیەکی جل و بەرگی دەفرۆشت جلی بۆ من و خوشکەکەم کڕی.

ئەو شەوە تا درەنگانی شەو باوکم و دایکم دانیشتن قسەیان دەرکرد، باوکم گووتی کەواتە پێویست ناکات ماڵی خۆمان بگوازینەوە لەمەودوا دایکم یارمەتیمان دەدات.

وەك هەموو منداڵێك جل و بەرگەکانم لە پشت سەری خۆم دانا و لە خەیاڵی خۆم لەمەودوا داپیرم یارمەتیمان دەدات و بۆمان دەبێتە فریشتەی رزگارکەر، بەو خەیاڵەخۆشانەوە خەوم لێکەوت، بەیانی زووەکەی لەگەڵ دەنگی گریانی دایکم خەبەرم بوویەوە، گووتم دایکە چی بووە بەو بەیانیە زووە بۆچی دەگریت؟.

گووتی کورم داپیرت حلمیە باروودۆخی تێکچووە رەوانەی نەخۆشخانەکراوە، ئێستا هاتوون بەشوێن باوکتدا، ئێستا باوکت چۆتە نەخۆشخانە تاوەکو ئەو نەگەڕێتەوە هیچ شتێك دیارنیە.

لەو قسانە دابووین باوکم بە چاوی پڕ لەفرمێسك هاتە ژوورەوە گووتی جیهان خۆتان ئامادەبکەن دایکم مردووە.

ئەو فریشتەیەی دوێنێ شەو لە ئێمە پەیدابوو ئەمڕۆ لەدەستمان دا، ئەو خۆشییەی دوێنێ شەو هەمانبوو ئەمڕۆ بوو بەناخۆشی، ئەو پێکەنینەی دوێنێ لەسەر لێوەکانم بوو، ئەمڕۆ بوو بە فرمێسك بەچاوەکانمدا دێتە خوارەوە.

لەوکاتەدا دایکم دووگیان بوو خودا کچێکی تر پێبەخشین لەسەر داوای باوکم ناویان نا حلمیە.

ژیانمان کەوتە قۆناغێکی ترەوە خێزانێکی فراوان و داهاتێکی کەمی ئێمە ژیانی زۆر تێك دابووین، ناچار ماڵمان بۆ خانوویەکی زۆر دوور گواستەوە بە هۆی ئەوە کرێ کەی زۆر کەم بوو، من و خوشکەکەم دەبووایە چەندین کیلۆمەتر بە پێ ببڕین تاوەکو دەگەیشتینە قوتابخانە.

براکەم تا دەهات بارووددۆخی خراپتر دەبوو پێویستی بەوە هەبوو نەشتەرگەری دڵی بۆ بکرێت، بەداخەوە ئەو نەشتەرگەرییەی ئەو تەنها لە بەغداد ئەنجامدەدرا، جگەلەوەی پارەیەکی زۆری دەویست باوکم بەهۆی ئەوەی خزمەتی سەربازی نەبوو نەیدەتوانی بچێتە شاری بەغداد.

بەردەوام باوکم کاری دەکرد بۆئەوەی پارە کۆبکاتەوە تاوەکوو براکەم نەشتەرگەری بۆ ئەنجامبدرێت، دوایی ئەوەی کەمێك پارەی کۆکردەوەو بە مامم حوسێن گووت تۆ کارەکەت هەر لەبەغداد هاتوو چۆی ئەو شارە دەکەیت ئەمجارە ماهیر و جیهانیش لەگەڵ خۆت ببە بۆئەوە ڕۆژی نەشتەرگەری بۆ دیاربکەن.

دوایی ئەوەی چوونە بەغداد و ڕۆژی نەشتەرگەری بۆ دیارکرا و گەڕانەوە هەولێر، بەمشێوەیە دوایی مانگێك دەبووایە بچن نەشتەرگەرییەکەی بۆ بکرێت، بەڵام مام بەهۆی ئەوەی ژنەکەی ڕێگەی نەدا گووتی ناتوانم هیچی تر بەدوایی کاری ئێوە بکەوم، بەمشێوەیە نەشتەرگەری براکەم هەڵوەشایەوە.

نەماندەتوانی داوای هیچ یارمەتیەکیش لە ماڵی خاڵەکانم بکەین، ئەوانیش خۆیان خاوەنی هەزار و یەك کێشە بوو، بەتایبەتی شادی هیچ جاوازییەکی لەگەڵ شەیتان نەبوو، شادی بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ خۆی خۆش بکات شەوینی بە زۆری دایە پیاوێك و پارەی لێوەرگرت، هەروەها شیرینی دایە پیاوێکی خزمی خۆیان کە شیرین هەرگیز حەزی نەدەکرد هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو پیاودا بکات، لەلایەکی تر هەردوو کوڕە بچووکەکەی کاروان و علی کە تەمەنیان نەگەیشتبووە پانزە ساڵ ڕەوانە دەرووەی وڵاتی کردن، جگەلەوەش هەڵسا ژنێکی هاوشێوەی خۆی بەناوی شەونم لە شارۆچکەی پردێ بۆ هێرشی کوڕی دۆزییەوە، ئەوەی ڕاستی بێت بنەماڵە شەونم لەو شارۆچکەیە بە خراپترین بنەماڵە ناوبانگیان دەرکردبوو.

بەمشێوەیە شادی تەواوی بنەماڵەکەی پەرت و بڵاو کردبوویەوە، بەڵام وەك پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت هەر زاڵمێك زەواڵێکی هەیە، ئەو ژنەی بۆ هێرشی هێنا بوو بە زەواڵی شادی، شەونم بە قسە لووسەکانی هێندە هێرشی بۆ لای خۆی راکێشا، هێرشی هاندا بۆ ئەوەی دایکی بەشووبداتەوە، بەمشێوەیە هێرش هەڵسا لە بەرامبەر پاریەکی زۆر دایکی بە پیرە مێردێك دا، ئیتر خودا تۆزێك هەقی ئەو زوڵم و ستەمانەی ئەنجامی دابوو لێکردەوە.

لەڕاستیدا کێشەکانی ئەوان هێندە زۆر و ئاڵۆزبوون هیچ کەسێك نەیدەتوانی سەریان لێدەربکات.

ئیتر ئێمە نەماندەزانی پەنا بۆ چ کەسێك ببەین، گوڵنازی پوورم هێندە خراپوو لەگەڵ ئێمە گەیشتە ئەو رادەیەی گووتیە باوکم ئەگەر هاتیتەماڵی ئێمە تەنها خۆت وەرە منداڵەکان لەگەڵ خۆتدا مەهێنە، لەبیرمە رۆژێك بە میوانی چووینە ماڵی گوڵنازی پوورم، کاتێ گەیشتینە ماڵیان لەبەرامبەر ئێمە دەستی بە قسەی نەشیاو کرد، گووتی بۆچی ئێوە هاتوون؟، نازمی مێردم ئەمڕۆ چەند هونەرمەندێکی بانگێشتی ماڵەوە کردوە ئێوە ببنێت لێرە زۆر توڕە دەبێت بۆیە هەر ئێستا بڕۆنەوە ماڵی خۆتان، یەکەو پارچە خیارێکی دایە دەستە ئێمە لەماڵی خۆیان دەریانکردینە دەرەوە.

کاتێ گەڕاینەوە ماڵەوە دەستم بەگریانکرد گووتم دایکە بۆچی وا لەئێمەدەکەن؟.

گووتی کوڕم هیچ گوێی پێمەدە رۆژێك دێت ئەوان پەشیمان دەبنەوە وپێویستیان بە ئێمە دەبێت، بەڵام یەك وەسیەتم بۆ تۆ هەیە هیچ کاتێك لەگەڵ کچەکانی ئەو ژنە هاوسەر گیری مەکە.

لەدوایی ئەو رۆژەوە چاوەڕوانی ئەوە بووم ئەو رووداوە رووبدات، لەبەر ئەوەی ووتەکانی دایکم هەمووی وەك رۆژی رووناك دەهاتە دی، بەڵام رۆژ لەدوایی رۆژ باروو دۆخمان خراپتر دەبوو، ناچار ماڵمان بردە خانوویەك کەوا ئافرەتێك خۆی تیادا

سوتاندبوو، بەم هۆیەوە هیچ کەسێك نەدەچووە ئەم خانووە کرێکەی زۆر کەم بوو. ئێمەش بەترس و لەرزێکی زۆرەوە لەو خانووە دەژیان، کاتیٚ دەچوومە حەمامی ماڵەکە هەر لەخۆمەوە ترسێکی زۆر دادەگرتم، وێنەی کاتی خۆ سوتاندنی ئەو ئافرەتەم دەهاتەوە بەرچاو کە چۆن خۆی سوتاندبوو.

لەژیانی هەژاریدا هەندێك رووداوی خۆشیش هەیە، وەك ئەوەی هەندێکجار ماڵمان دەگواستەوە بەبیٚ ئەوەی باوك ئاگاداربێت، کاتیٚ باوکم دەگەڕایەوە دەچوویەوە هەمان خانووە کۆنەکەمان، ئەوکات دراوسێیەکان پێیان دەگووت ماڵتان چۆتە فلانە کۆلان.

ژیانمان بەمشێوەیە بەردەوامی هەبوو تا ئەوکاتەی خاڵم کاروان لەدەرەوەی وولات نەیتوانی بمێنێتەوە گەڕایەوە هاوسەرگیری لەگەڵ کچی خاڵەکەی فاتیمە دا کرد، بەم هۆیەوە هێرشی خاڵە گەورەم خانووەکەی فرۆشت و میرات دابەشکرد بەسەر خوشك و براکانی، شادیش بەشێکی میراتەکەی بەرکەوت، لەبەر پارەکە خاڵم ئەوی بە مێردە پیرەکەی بەتەلاق دان دا و هێنایەوە لای خۆی، ئێمەش بەشێکمان لەو میراتە بەرکەوت و توانیمان کەمێك خۆمان ریك بخەینەوە و بچینە خانووەیەکی باشتر، دڵمان زۆر خۆش بوو بەو پارەی وەرمانگرتبوو.

وەك هەمووجارێك ئەو دڵخۆشییەی ئێمە هەمانبوو زۆر درێژەی نەکێشا، ئەمجارە بەو پارەیەی وەرمانگرتبوو دایکم بڕیاری دا لەگەڵ مێردی پوورەکەم شیرین بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری براکەم بچێتە بەغداد، بەدەر لە چەندین جارە براکەم دەیگووت من ناچمە بەغداد دەتانەوێت من لەویٚ بمرم... نەخێر تۆ چۆن دەمریت دەمانگووت ئەگەر بچیتە ئەویٚ چاك دەبیتەوە دەتوانی بەدڵی خۆت هەموو یارییەك بکەیت، ئیتر ئەو رۆژە لەگەڵ مێردی پوورەکەم رێگای بەغدادیان گرتەبەر.

منیش چەندین رۆژبوو بەهۆی ئەوەی براکەم لە نەخۆشخانەبوو نەچوو بوومە قوتابخانە، جگەلەوەش من پانتۆڵی قوتابخانەم نەبوو هەرچی لە پارە هەمانبوو

هەموویمان لەسەر یەك دانا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی براکەم، ناچار من شەروالّم لەبەر دەکرد ئەگەرچی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەش مامۆستا عباس ئامۆزای باوکم بوو بەلاّم هەرکە منی دەبینی دەیگووت ئەجارە بەشەروالّ نەکەیت بێتە قوتابخانە، لەبەر ئەوە هەرکە ئەوم دەبینی خۆم دەشاردەوە.

بەردەوام دەمگووتە باوکم پانتۆڵێکم بۆ بکڕە بەمشێوەیە ناتوانم بڕۆمەوە قوتابخانە چەند رۆژێکیشە نەچوومەتە قوتابخانە هەر خەریکی ئاگادار بوونی ئەو منداڵانە بوویمە.

باوکم گووتی باشە ئەمرۆ دوایی نیوەڕۆ دەچمە بۆ بازار و پانتۆڵێکت بۆ دەکڕم.

لەدڵخۆشی ئەوەی باوکم بانتۆڵێکم بۆ دەکڕێت توند لەباوەشم کرد و ماچم کرد، گووتم ئیتر پێویست ناکات خۆم لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بشارمەوە، لەلایەکی تر دەمگووت براکەم دوایی نەشتەرگەری لەمەودوا دەتوانم بە دڵی خۆم لەگەڵ ئەوە یاری بکەم و بچمە دەرەوە.

ئەوە رۆژە هێندە دڵخۆش بووم تەنانەت نانی نیوەڕۆشم بۆ نەخورا، کەچی ناخۆشی بۆ من وەك دەردێکی درێژ خایەن وایە، نەدەرمانێکی هەیە چارەسەر بکرێت نە بەخێرایی و ئاسانیش رۆحم دەردەکات، هەرکە زانیم زۆر بەتوند لەدەرگای ماڵی ئێمە درا کە چووم دەرگام کردەوە بینیم مێردی پوورم شیرینە، گووتی باوکت لە کوێیە؟.

گووتم لەژوورەوەیە چوومە درەوە سەیرم کرد دایکم لە ناوتەکیسەیەکەدا براکەمی لە باوەوشدایە و نەهاتۆتە خوارەوە، سەیری روخساریم کرد فرمێسك بە چاوە جوانەکانی دێتە خوارە، ئەکات زانیم ئیتر براکەم لەژیاندا نەماوە نەمتوانی زیاتر سەیری براکەم بکەم تەنها یەکجار سەیرمکرد بینم رووخسارێکی جوانی پێکەنیناوی هەیە، هیشتا ئەو کانوونەیەی لە دەستی درابوو لێنەکراوەتەوە.

دەگریام فرمێسک وەک باران لە چاوەکانم دەهاتە خوارەوە دەمگووت براکەم تازە من چی لە خوێندن بکەم دکتۆریم بۆچیە؟ئەگەر تر نەبیت، بەڵێن بێت لە مەودوا بۆ دکتۆری نەخوێنم، دوونیام بەجارێك لەبەر چاو تاریك بوو، من بۆ ئەو منداڵانە هەروەك دایك و باوکم لێهاتبوو ئەوەندەی من خزمەتی ئەو منداڵانەم دەکرد باوك لەبەر کاری دەرەوە دایکم بەهۆی ئەوەی هەموو مانگێك لەگەڵ براکەم لە نەخۆشخانە دەمایەوە نەیاندەتوانی هێندە چاودێری ئەو منداڵانەیماڵەوە بکەن، بۆیە هەرگیز وەك خوشك و برا سەیرم نەکردوون وەك پارچەیەك وابوون لە جەرگی من.

ناخۆشییەکانیش وەك خۆشیەکان بەردەوامی نابێت، تەنها ئەوە نەبێت ئەگەر ناخۆشییەکان هەزاران خۆشی لەدوایان بێت ئەوان هەروەك یادگارییەکی تاڵ لەسەر دڵ و جەرگت دەمێننەوە، خۆشییەکان وانین هەرکە ناخۆشییەك بەدوایاندا بێت خێرا دەست بەنەفرەتکردن لەدوونیا دەکەیت.

دوایی مردنی براکەم و تەواو بوونی پرسەکەی ئەو پارەیەی بۆ نەشتەرگەرییەکەی ئەو کۆمان کردبوویەوە مایەوە، بۆیە باوکم خێرا چووە بازار و جلکێکی جوانی قوتابخانەی بۆ من خوشکەکانم کڕی، پێشتر لەبەر جلەکانم لەترسی بەڕێوەبەر نەدەچووم یاری لەگەڵ منداڵەکان بکەم، کەچی ئێستا خاوەنی جلێکی جوانم بەڵام دووبارە ژیان ڕێگەی نەدام وەك منداڵێك بژیم.

دوایی ئەوە لە نێو ئەو خانووە ناخۆشەی تیادا بووین چووینە خانوویەکی خۆشتر، لەبەر ئەوەی ئێستا براکەم نەما تاوەکوو هەموو داهاتی خۆمان بۆ نەخۆشی ئەو خەرج بکەین، دەمانتوانی بە ئاسانی کرێی خانوو کۆبکەینەوە و هەندێکیش خەرجی زیاتر بۆ ئێمەش بمێنێتەوە، هەروەها خودایی گەورە دوایی یەك ساڵ کوڕێکی جوانی پێبەخشین و ناومانننا زریان لەبەر ئەوەی ماهیری برام بەردەوام دەیگووت برایەکم ببێت ناوی دەنێن زریان.

کەمێك ژیان و بارودۆخمان گەڕایەوە سەر ژیانێکی کەمێك لە خراپ باشتر، بەلاّم زۆری نەخایاند ڕۆژێك بینم شادی لەگەڵ علی خاڵم کە لە دەرەوەی وولاّت گەڕابوویەوە هاتنە ماڵی ئێمە و گووتیان لەدەستی هێرشی برامان رامانکردووە، شادی گووتی دەیەوێت بەو بوهتانە ژنەکەی بۆ هەڵبەستووم بمکوژێت.

ئێمە خۆمان گەلێك کەم خاوەنی کێشە نەبووین کێشەکانی ئەوانیش دەهاتەوە سەر ماڵی ئێمە، هەرکە زانیمان خاڵم هێرش بە خۆیی و دەمانچەکەی دەستی بەروە ماڵی ئێمە دەهات، منیش لەسەربان بۆ ئەوە دانرابووم ئەگەر ئەو بێت ئاگادارییان بکەمەوە، خێرا چوومە خوارەوە هاوارم کرد هات هات.

گووتیان کێ هات؟.

گووتم خاڵم هێرش بەرەوە ماڵی ئێمە دێت، لەوکاتەدا شادی و علی شوێن نەما خۆیان تیادا بشارنەوە، دەمبینی دایکم بە رووداوەی بەسەر شادی هاتووە زۆر دڵی خۆشە، دڵنیابووم هەستی بەوە دەکرد کە خودایی گەورە تۆڵەی ئەوە لێیدەکاتەوە.

باوکم گووتی لەهیچ مەترسن ئێوە لەماڵی منن هیچ کەسێك ناتوانێت لێرە دەستان لێبدات.

کاتێ خاڵم گەیشتە ماڵی ئێمە لەگەڵ باوکم دانیشت و دەیگووت دەبێت ئەو دوو خوێرییە هەربکوژم، کاك تەها تۆ نازانیت چ خراپە کارییەك دەکەن علی ئارەق خۆر و شادی زیناکەر دەرچووە، رێگەم بدە هەردووکیان بکوژم.

باوکم گووتی خۆشت کەم تاوانت نیە دایکی خۆت لەپێناوی ژنەکەت و پارە بەو پیرە پیاوەدا، نەدەبوایە کاری لەو جۆرە بکەیت ئێستا ئەوان لەماڵی ئێمەن کاتێ دەرچوون هەرچیت دەوێت بکە لێر ناتوانیت هیچیان لێبکەیت.

خاڵم گووت بابڕۆن نامەوێت شادی ببینمەوە لە هەر شوێنێك ئەو ببینم دەیکوژم.

لەو رۆژە بەدواوە شادی لە ماڵی ئێمە چووە دەرەوە نەمبینیەوە، هەروەها علی خاڵم ئەوەیش تا ماوەیەکی زۆر لەلای ئێمە مایەوە، ئەو کاتەی لەلای ئێمە بوو چەندین کێشەی بۆ ناینەوە رۆژێك لەگەڵ کوڕێکی درواسێمان بەشەڕ هات کوڕەکەش دەیویست بەچەقۆ لە علی بدات نازانم چۆن دایکم خۆی دایە بەر دەستی کوڕەکە نەیهێشت لەخاڵم بدات، دوایی ئەو رووداوە خاڵم دەیویست بگەڕێتەوە دەرەوەی وولآت بەلآم پارەی تەواوی نەبوو بۆیە باوکم بڕەپارەیەکی دایێ و گەڕایەوە دەرەوەی وولآت.

دایکم بەهۆی ئەو رووداوە نەخۆشییەکی زۆر خراپی تووش بوو، بەم هۆیەوە جارێکی تر ناچار باوکم کەوتە کۆکردنەوە پارە بۆچارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی دایکم، جارێکی تر باوکم کەوتەوە ژێرباری قەرزکردن و چەندین کرێی خانووش قەرزاربووین.

کاتێ دایکم کەمێك باشتر بوو بەدزی باوکمەوە دەستی بەنان کردن کرد بۆ ماڵی خەڵکی، لەبەر ئەوەی باوکم رێگەی نەدەدا دایکم ئەو کارانە بکات، ناچار دایکم بەدزی باوکم لەگەڵ هاوڕێیەکی لەماڵی ئەوان نانی بۆ خەڵکی دەکرد.

نزیکەی دووساڵ ژیانمان بەو دەردەسەرییە بەڕێکرد، تائەوکاتەی ماڵی مامم دەیانەویست خانووەکەی خۆیان بفرۆشن، بۆ فرۆشتنی ئەو خانووە پێویستی بە واژووی باوکیشم هەبوو، بۆیە باوکم گووتی تاوەکو هەقی من بەتەواوەتی نەدەن واژووناکەم، بەمشێوەیە بەناچاری برێکی کەمی پارەیان دابەباوکم، باویکیشم هەرچۆنێك بوو لە دووری شار لەگەڵ ماڵی خاڵەکانم خانوومان دروست کرد.

ئەگەرچی خانووەکەمان زۆر باش نەبوو ئەوکاتەی کە چووینە نا خانووە تەنها سەقفی گیرابوو، ناوەوەی خانووەکە دەرگاکانی پێوەنەبوو تەنها دەرگای سەرەکی هەبوو، من ئە کات لەپۆلی شەشی سەرەتایی دەمخوێند، قوتابخانەی زۆری نەمابوو تەواو ببێت بۆیە لەو قوتابخانەی نزیك ماڵی خۆمان وەریانەگرتم، ناچار رۆژانە نزیکەی یەك کاتژمێر و نیو بەپیادە بۆ قوتابخانە بەڕێدەکەوتم.

هەرگیز ئەو رۆژە لەبیر ناکەم کاتێ ماڵی گوڵنازی پوورم هاتنە ماڵی ئێمە بەرلەوەی بگەن بەماڵی ئێمە منیان لەرێگا بینی گووتیان بۆ کوێ دەڕۆیت؟.

گووتم دەچم هەندێك نان بۆ نیوەڕۆ دەرکرم.

ئێمە نیوەڕۆ لەلای ئێوە دەبین هەندێك نان زیاتر بهێنە.

منیش گووتم باشە بەچاوان زۆر دڵم پێخۆش بوو کە ئەوانم بینی، لەدڵی خۆم گووتم رەنگە لەمەودوا ئیتر سەردانی ئێمەش بکەن، من لە سرەی نان هێندێك درەنگ کەوتم کە گەشتمەوە ماڵەوە بینیم هیچ کەسێك لەوان لەماڵی ئێمە نیە.

دایکم گووتی کوڕم ئەو هەموو نانە چیە هێناوتە؟.

گووتم ئەی ماڵی پوورم گوڵناز بۆ ماڵی ئێمە نەهاتن بە منیان گووت نانی زیاتر بهێنە نیوەڕۆ لە ماڵی ئێوە دەبین، ئەی ئەوان لەکوێت؟.

گووتی کوڕم منیشیان لە رێگا بینی هەروایان پێگووتم بۆیە چووم بەقەرز گۆشتی مریشکم هێنا، بەڵام ئەوان کە هاتنە ژوورەوە چاویان بە نێوەوەی خانووەکە کەوت گووتیان دەبێت ئێمە بڕۆین، تەنها دە دەقە دانیشتن پێیان شەرم بوو زیاتر دابنیشن.

زۆر تورە بووم لەو رەفتارەی ئەوان نەمدەزانی تورەی خۆم بەچی دەربڕم، ئەوکات دایکم گووتی هیچ خەم مەخۆ خودا چۆن شادی دایکمی ناچارکرد بێتە ماڵی ئێمە رۆژێك ئەوانیش ناچار دەبن لەدەرگایی ئێمە دەدەن.

دوایی تەواو کردنی پۆلی شەشی سەرەتایی منیش لەگەڵ باوکم دەستم بەکارکردن کرد، دوایی ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ باوکم خەریکی کۆکردنەوە پارە بوو توانیمان خانووەکەمان هەموو شتێکی بۆ بکڕین و لەوەش زیاتر کردمان بە دوو قات.

لەکۆتایدا پێم وابوو هەرچۆنێك بووە خودا ئێمەی سەرخست بەتایبەتی دوایی ئەوەی پارەمان کۆکردەوە توانیمان سەیارەیەکیش بکڕین، لەوکاتەدا خۆشترین ژیانی خۆمان بۆ ماوەی چەند مانگێك بەڕێکرد، تائەو کاتەی علی خاڵم لە دەرەوەی وولاَت گەڕاییەوە و لەگەڵ ماڵی خاڵەکانی ترم دانیشت، بەهۆی ئەوەی ماڵی ئێمەش لە ئەوان نزیك بوو هەموو ڕۆژێك علی دەهاتە ماڵی ئێمە و دەستی بەگریان دەکرد.

دەیگووت ژنی براکانم زۆر قسەی ناشرینم پێدڵێن، ئەگەر منیش ژنێکم هەبوایە ئەوام وام بەسەر نەدەهات، لەبەر ئەوە هێلین کچی حوسێنی کاتی خۆی لە من مارەکراوە دەبێت ئەوم بۆ بهێنن.

هەرچەندە دایك و باوکم گووتیان ئەو کچە بەکەڵکی تۆ نایێت کەسێکی زۆر خراپ و تەمبەڵە کەسێکی تر بۆ خۆت بدۆزەوە زۆر باشترە.

علی گووتی لەو کچە بترازێت من کەسێکی ترم ناوێت، یاخود من هەقی خۆم دەوێت دەبێت پارە بە من بدەن.

باوکم گووتی زۆرباشە من قسە لەگەڵ براکەم حوسێن دەکەم، من لەلایەن خۆمەوە رازیم بەوەی کە نیوەی پارەکە بدەم، ئەگەر ئەوەیش رازی بێت ئەوا نیوەی پارەکە بدات دەبێ ئەو کچەی بەمنداڵی تۆ مارەت کردووە تەلاقی بدەیت.

بەمشێوەیە باوکم چووە ماڵی مامەکەم و سەبارەت بەو بابەتە قسەی لەگەڵی کرد پێگووت علی داوای ئەوەی کردووە یان کچەی کەی پێبدەن یاخود پارەی دەوێت منیش لە ئێستا ئەوە هەموو پارەیەم لەبەر دەست نیە تۆ نیوەی پارەکەی بدە منیش نیوەی کەی تری پێدەدەم، ئەگەر وابێت بە ئاسانی یەخەی لە یەخەی ئێمە دەبێتەوە.

مام گووتی تۆ چۆن لە خۆتەوە قسەی لەو جۆرەت کردووە بەبێ ئەوەی پرسێك بەئێمە بکەیت، من رازیم بەوەی کچەکەی خۆم بەو کوڕە بدەم.

من ئاگاداربووم کچەکەی مام زۆرباش نەبوو جگەلەوەی زۆر تەمبەڵ بوو لەرووی رەوشتەوە بەهۆی ئەوەی زۆر نازی پێدرابوو باش نەبوو، مامیشم تابەهۆی ئەو کچەوە ئابڕووی نەچێت بڕیاریدا بیدات بەعلی، دایکم و باوکم لەو کارە زۆر دەترسان بە هۆی ئەوەی لەکۆندا لەپێناو ئەواندا ئەوکچە لەو کوڕە مارەکرابوو، دەترسان لەوەی ئەوان کێشەیەکیان هەبێت ئاژاوە و شەڕەکە بێتەوە ماڵی ئێمە، لەبەر ئەوە گووتیان ئەو کارەی ئێوە هیچ پێوەندییەکی بە ئێمەوە نیە.

منیش لەو کاتەدا تەمەنم تەنها پانزەساڵبوو هەرچەندە بەتەمەن زۆر گەورەنەبوو، کەچی بەهۆی ئەو هەموو سەختییەی لەژیانم بینی بووم وەك پیاوێکی بەتەمەن سەرم لەکارەکان دەردەکرد، منیش لەوە دەترسام کە ئەو خۆشییەی هەمانە بەهۆی ئەوانەوە لە ئێمە تێك بچێت، بەتەواوی ژیانمان هیچ خۆشییەکمان نەبینی بوو.

خاڵم هێرش بەهۆی ئەوەی ژنەکەی زۆر کێشەی لەگەڵ خاڵۆژنەکەی ترم دەنایەوە، بەقسەی ژنەکەی بڕیاریدا ماڵی خۆی بباتە تەك ماڵی باوکی ژنەکەی و هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ ئێمەدا نەمێنێت، لەبەر ئەوە ناچار هەموو کارەکان باوکم و دایکم بەدوایی کەوتن.

کێشەکان لەوەدا نەبوو ئەو خاڵەم ژن دەهێنێت، کێشەکە ئەوە بوو ئەوخاڵەم بەهیچ شێوەیەك خوڕەوشتی باشی نەبوو، ئەو کچە مامەشم بەهەمان شێوە هیچ رەفتارێکی باشی نەبوو، دەمانزانی ئەو دووەیان هەرگیز بەیەکەوە هەڵناکەن و کێشەو گرفتەکانی ئەوان دەگەڕێتەوە سەر ئێمە، بۆیە دایکم زۆر دەترسا لەوەی کە تەلاق بدرێت رێگەی دا بەوەی منداڵێکی تری ببێت، ئەگەرچی باوکم کەسێکی زۆر باش و لەسەرەخۆ بوو بەلاَم زۆر بەقسەی خەڵکی تێك دەچوو گوێی لەوە نەبوو بەقسەی براکان و خوشکەکانی دایکم تەلاق بدات.

هەرچۆنێك بوو دوایی یارمەتی دانێکی زۆری ئەو خاڵەم بووە خاوەن ژن و ماڵێکی خنجیلانە، جگەلەوەش ئێمە کچێکی ترمان بۆ زیات بوو ناومان نا ئاسیا.

یەك ساڵ بەسەر ژنهێنانی خاڵم رۆیشت ژیانمان هیچ کێشەو گرفتێکی نەبوو، بەلاٚم دوایی یەك ساڵ سەرەتایی دەست پێکردنەوەی کێشەو گرفتەکانی ژیانمان بوو، بەهۆی ئەوە شەڕ لەنێوان خاڵم و خاڵۆژنم دا روویدا، هەر کێشەیەکیش لە نێوان ئەو دوو شەیتانە روویدابووایە دەهاتەوە ماڵی ئێمە، هەرچەندە لەسەرەتا دایك و باوکم گووتیان ئەو کارە پێوەندی بە ئێمەوە نیە، بەلاٚم ماڵی مامم دەیانگووتە باوکم ئەو کچە بۆتۆ بە ژن دراوە پێوەیستە تۆش هەڵوێستت هەبێت، لەبەر ئەوە دایکم زۆر دەترسا لەوەی تەلاق بدرێت رێگەی دا منداڵێکی تری ببێت، بۆ ئەوەی بەمشێوەیە رێگە لە تەلاٚق دانی خۆی بگرێت، لەبەر ئەوەی قسەی سەر زار و بن زاری ئەو دوو بنەماڵەیە ببووە تەلاٚق بە تەلاٚق.

من ئەو کاتە تەمەنم گەیشتە حەڤدە ساڵ رۆژێك کێشەی نێوانیان زۆر گەورە بوو گەیشتە ئەوەی خاڵم ویستی هێلین تەلاٚق بدات، باوکم گووتی زۆرباشە تەلاٚقی بدە من بۆ محمدی کوڕم دەیهێنمەوە، من نەمدەزانی چی بکەم ئاخەر تاوەکو ئێستا من قسەی باوکم نەشکاندووە، هەتا ئێستاش بۆ ئەوەی باوکم ماندوو نەبێت دانێك کاردەکەم دانێکیش دەچمە قوتابخانە، ئەو کارەی باوکم گووتی سەری  نەگرت گووتم زۆرسوپاس خودایە ئەمجارەش منت لەو کێشەیە رزگارکرد.

کاتێ لە پۆلی سێی ناوەندی دەرچووم زۆرێك لە مامۆستاکانمان پێیان دەگووتم محمد تۆ برۆ بەشی زانستی دڵنیابە لەو بەشە سەردەکەویت، بەلاٚم بە هۆی ئەوەی ئەگەر من بچوومایە بەشی زانستی نەمدەتوانی لەگەڵ باوکم کاربکەم، جگەلەوەش هیچ کەسێك نەدەبوو پارەی جل و بەرگ و پێداویستیەکانی خوشك و براکەم پەیدابکات، لەبەر ئەوە بەگریانەوە بڕیارمدا بچمە بەشی ئەدەبی بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ژیانی خوشك و براکانم بکەم.

هەرگیز ئەو رۆژە لەبیرناکەم بەڕێوەبەری قوتابخانە کە ناوی مامۆستا یوسف بوو هاتە ماڵی ئێمە بەباوکمی گووت ئەو کوڕەی خۆت بنێرە بەشی زانستی لە دوارۆژ دەبێتە کەسێکی گەورە.

باوکم گووتی ئەوە ئارەزووی خۆیەتی من زۆرم لەو نەکردووە بچێتە بەشی ئەدەبی.

باوکم راستی دەکرد زۆری لە من نەکردبوو ئەو بڕیارەی منیش بەفرمێسکەکانی چاوم درابوو، لەلایەکی تر من دەموویست ژیانی برا نەخۆشەکەم رزگاربکەم بۆیە ئارەووی بوون بە دکتۆرم هەبوو، دڵنیا بووم لەوەی ئەگەر من بچمە بەشی زانستی ئەوا ژیانی تەواوی خوشك و براکانم لە پێناو خۆمدا دەکەم قوربانی بڕیارمدا هەرمن ببمە قوربانی هەموویان باشترە.

دەستم بەژیانێکی نوێی خوێندن کرد هەرچەندە زۆر ئارەزووی خوێندنی بەشی ئەدەبیم نەبوو بەلاّم هیچ کاتێك کۆڵم نەدەدا و زۆرم دەخوێند تاوەکو ئەنجامی کۆتایی ساڵم وەرگرتەوە لە هەموو دەرسەکان لێخۆشبوونم بۆ کرا کە نەچمە تاقیکردنەوە کۆتایی ساڵ، نەمدەزانی بۆچی هێندە دڵم خۆشە هەر بەراکردن گەڕامەو ماڵ بۆ ئەوەی ئەو هەواڵە بەدایکم رابگەێنم و دڵ خۆش بێت کە کوڕەکەی لە قوتابخانە لە هەموو وانەکان بەخشراوە، کە چوومەوە بینیم دایکم لە دەرەوە دانیشتووە و دەگریت، گووتم دایکە ئەوە بۆچی دەگریت؟.

گووتی کوڕم لەدوایی ئەوەی تۆ چوویتە قوتابخانە من باروودۆخم تێکچوو کاتی منداڵبوونم هات، منیان بەخێرایی بردە نەخۆشخانەو برایەکت بۆ زیاد بوو، منیش زۆر دڵم تەنگە بۆیە هاتوومەتە دەرەوە.

چۆن دایکە گیان تۆ ئێستا خۆت بارووددۆخت باش نیە بۆچی هاتوویەتە درەوە؟، لەوە باشتر هەیە تۆ بەسەلامەتی منداڵەکەت بووە، گەڕایتەوە ناو ئێمە.

ئاخەر کوڕم کارەکە وانیە.

ئاخەر چی دایکە دە پێم بڵێ خەریکە دڵم شەق ببات؟.

کوڕم دوایی لە دایك بوونی منداڵەکەمان دکتۆرەکان گووتیان ئەو کوڕە لە رووی ئەقلەوە تەواو نیە و مەنگۆلە، هەرلەبەر ئەوەیە منیش بەو باروودۆخەمەوە هاتوومەتە دەرەوە بۆئەوەی کەمێك مێشکم ئارام ببێتەوە.

وەك هەمووجارێك خۆشی یەکەم بوونم لە قوتابخانە بوو بەناخۆشی، جگەلەوە ئەگەرچی نە دەچوومە تاقیکردنەوەکان بۆیە ناچار لەگەڵ باوکم بۆ کارکردن دەچووم، ئەورۆژە کارەکەی ئێمە کەتبووە نێو کۆلێژی ئاداب، سەیرم دەکرد ئەو قوتابیانەی ئەوێ جل و بەرگی زۆر جوانیان لەبەرە و کاتێکی خۆش بەسەر دەبەن، منیش جل و بەرگێکی شڕ و دڕاوم لەبەر دابوو، لەوکاتەدا کوڕێکی گەمژە بۆئەوەی خۆی لە ناو هاوڕێیە کچەکانی بەدیاربخات من کە بەنزیك ئەوان دا رۆیشتم  پڕ بەدەنگی خۆی گووتی لێی دووربکەونەوە ئەگەرنا گڕوو دەبن یان پیس دەبن، ئاگاداربووم هەموو کچەکان دەیانگووت وای جل و بەرگێکی پیسی لەبەر دایە، پێمیان دەگووت کە نەزانە منداڵ لەتەمەنی ئەوەدا ئێستا لەتاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ دایە ئەو گەمژەیەش خۆی کردۆتە فلیم لێرە، ئەوان بێئاگا لەوەی من یەکەم بووم بۆیە نەچوومەتە تاقی کردنەوەکان، ئەو ووتە ناخۆشانەی ئەوان زیاتر هانی دام بۆئەوەی هەرچی نەبێت لە کۆلێژێك وەربگیردرێم.

لەوکاتەدا لەدڵی خۆم دەمگووت تۆبڵێت رۆژێك منیش وەك ئەوانە بە جل و بەرگێکی خاوێن و جوان بێمە نێو کۆلێژ، ئەوندەی لە نێو کۆلێژ کارمان هەبوو من هیچ خۆشیم نەبوو، لەلایەکی تر شەرپەریشتیاری کارەکە کەسێکی دەست رۆیشتووی نێو حوکومەت بوو، بۆیە پارەیەکی زۆری باوکمی لەلابوو دەگووت منیش زۆرم قازانج نەکردووە پارەکەت پێنادەمەوە، ناوی ئەو سەرپەرشتیارەم لەیاد نەماوە بەڵام بەهۆی دەست رۆیشتووی گوتیە باوکم هەر کێ دەناسیت و دەچیتە لای هەر کەسێك بڕۆ من یەك دینارت نادەمەوە.

باوکم ئەوە قسەیەی ئەو کردی زۆر نیگەرانی کرد، گووتی من کەسێك دەناسم لە هەموو ئەوکەسانەی تۆ دەیاناسیت بەهێزترە، بڕۆ من پارەکەم ناوێتەوە تەنها ئەوەندە دەڵێم خودا گڕووت بکات.

ئەویش پێکەنی گووتی دووعایەکی زۆر خۆشت کرد ئەگەر گەمژەکی وەك تۆ بەو دووعایانە پارەکەی داوا نەکاتە من رازی هەزاران دووعای خراپترم لێبکەیت.

من لەوکاتەدا زۆر بەبێدەسەلاَتی خۆمانم دەهاتە بەرچاو، بۆیە بڕیاری ئەوەم دا بخوێنم بۆئەوەی ببم بە ئەفسەری پۆلیس بۆ ئەوەی کەس نەتوانێت هەقم زەوت بکات، گووتم باوکە دەزانی ئەگەر ئێمە کەسێکی گەورەمان نە حوکومەت هەبوایە ئەو پیاوە نەیدەتوانی ماڵی ئێمە بخوا.

باوکم زۆر ژیرانە گووتی کوڕم من زۆرکەسی گەورەی سەر دوونیا دەناسم، ئەوەتا مامت زانا لە نێو پۆلیس ئەفسەرێکی گەورەیە، بەلاَم تاوەکو دەسەلاَتی خودا هەبێت ئەوانە چین داوایان لێبکەیت.

من ئەو قسانەی باوکم زۆرپێ باش نەبوو، لەبەرئەوەی ئێمە چەندین ساڵە داوا لەخودا دەکەین کێشەکانمان لەسەر لاببات بەلاَم هیچ کام لەدووعاکانی ئێمە گیرانەبووە، بەهۆی زۆری کێشەکانی ترمانەوە ئەو رووداوەم هەر لەبیر نەما.

دوایی چەند مانگ بەسەر تێپەڕبوونی ئەو رووداوە رۆژێك لە دەرگای ماڵی ئێمە درا، کاتێ چووم دەرگام کردەوە بینیم هەمان ئەو پیاوەیە کە پارەکەی لە باوکم زەوت کردووە.

گووتی کوڕم ئەگەر باوکت لەماڵەوەیە بۆمی بانگ بکە هەندێك کارم پێیەتی.

گووتم بەڵێ لەماڵەوە، دوایی ئەوە ی باوکم هاتە دەرەوە کابرا خێرا دەستی باوکمی گرت و ماچی کرد، گووتی لەبەر خاتری خودا مام تەها لێم خۆشببە، ئەوتا ئەو پارەیەی تۆم لەلابوو بۆتم هێناوەتەوە، باوکم گووتی چی بووە؟.

گووتی دوایی ئەوەی تۆ دووعات لەمن کرد من نەخۆشی گڕووبوونم گرتووە، دەستەکانم گڕووبوون زۆر دەترسم هەموو گیانم تووشی ئەو نەخۆشییەبێت، بۆ دەرمان

چوومەتە چەندین وولاَت هیچ چارەسەرێکی نەبووە، بیرم کردەوە کاتی خۆی ناهەقیم بەرامبەر ئێوەکردووە هاتووم هەقەکەتان بدەمەوە.

ئەو پیاوەیە زۆر بە سوپاسگوزارییەوە تەواوی پارەکەی بۆ گەڕاندینەوە، کاتێ گەڕاینەوە ژوورەوە باوکم گووتی ئەها کوڕم پێم گووتی ئەگەر خودا بییەوێت زۆر بەئاسانی ئەو پیاوە ناچاردەکات پارەکەمان بداتەوە.

ژیان ئازاری زۆرە و هەرگیز ئەو ئازارانەشی کۆتاییان نیە، وەك لەسەرەتا باسم کرد هەرچەندە دەوڵەمەند و شەهادەی بەرزت هەبێت وابیرمەکەوە بەسەر ژیان سەرکەوتوویت، بۆیە لەدوونیا تەنها کێشەی من ئەوە بوو وام لێك دەدایەوە ئەگەر من لەژیان بڕوانامەی بەرزم هەبێت ئەوا سەرکەتوو بویمە، من هەر بەوخەیالاَنەوە دەژیام تا ئەوکاتەی توانیم بچمە کۆلێژ، هێواش هێواش هەستم بەگەورە بوونی خۆم دەکرد کەچی زۆرماوە بگەم بەوەی کە لەخەیالّم دابوو، نەمزانی ژیانی کۆلێژ چۆنە لەبەر ئەوەی من هەر خەریکی کارکردن و خوێندن بووم، ئەگەرچی ئێستا کەمێك ژیانمان خۆشتربووە، بەلاَم بەهۆی ئەوەی تەنها باوکم لەماڵەوە کاری دەرکرد هیچ کەسێکی تر نەبوو یارمەتی بدات، ناچار من هیچ کاتێك لە کارکردن و خوێندن نەدەوەستام، هاوڕێیەکانم زۆر داوایان لێدەکردم لەگەلێ ئەوان بچم بۆ کافتریا، بەلاَم من بیرم لەوە دەکردەوە ئەو پارەی لە کافتریا بۆ خۆم خەرجی دەکەم، لەریگای چوونەوەم بۆ ماڵەوە هەندێك خواردنم پێدەکڕی بۆ خوشك و براکانم دەبردەوە.

کیشەی ماڵی خالّم علی هیچ کاتێك کۆتایی نەدەهات، خالّم و خالۆژنم هەروەك شەیتان وابوون، زۆر هەولّماندەدا کێشەکانی ئەوان چارەسەربکەین کەچی هیچ چارەسەرێکی نەبوو، ئەو دووانە نە لەگەلێ یەکتر دەگونجان نە بەبێ یەکتریش دەیانتوانی بژین، دایکم لەترسی ئەوان ریّگەی دا جارێکی تر دووگیان ببێت.

من لەدوونیا هێدە لە خۆشییەکانم دەترسام هیچ کاتێك لە ناخۆشییەکانم نەترساوم، لەبەرئەوەی لە دوایی هەر خۆشییەکی من ناخۆشییەك رووی تێکردووم، لەبیرمە ئەو ساڵەی لە کۆلێژ بەپلەی نایاب یەکەم بووم، خێرا دوایی ئەوە ناخۆشییەك یەخەی پێگرتم و خێرا من نەشتەرگەرییەکی گەورەی پشتم بۆ ئەنجامدرا، دایکم منی زۆر خۆش دەویست ئەگەرچی ئەو خۆی زۆری نەمابوو منداڵی ببێت، لەکاتی نەشتەرگەری من هەردەهات و دەچوو قەلەقییەکی زۆری پێوەدیاربوو، ئەو رۆژەی من نەشتەرگەریم بۆ کرا و هەموو دلخۆش بوون بە دەرچوونم نیوەی شەوی ئەو رۆژەی تێنەپەڕاند دایکیشم بەهۆی تێکچوونی باروودۆخی نەشتەرگەری منداڵبوونی بۆ ئەنجامدرا، دایکم باروودۆخی زۆرباش نەبوو منیش لەسەر جێگا کەوتبووم... نەمدەتوانی هیچ بکەم.

بەهەرحاڵ ژیان هەرچەندە ناخۆش بێت هەرتێدەپەڕێت، دایکم بەسەلامەتی لە نەشتەرگەرییەکە دەرچوو خودا کچێکی جوانی پێداین ناومان نا (ئایە).

هەرکارێکی خراپە بکەیت دڵنیابە دێتەوە رێگات، من ئەو یاسایەم لە ژیانی خۆمدا کارم پێدەکرد، هێندەم رووداو بەچاوەکانی خۆم دیبوو زۆر لەو دەترسام رۆژێك خراپەیەکی بچوکیش بەرامبەر خەڵك بکەم، ماڵی مام زۆر خراپەیان بەرامبەر بە دایکم کرد، وایان بەسەر هاتووە نان و خوێناویان بۆتە یەك، خاڵم لەگەڵ ئەوەی کێشەی زۆری بۆ ئێمە هەبوو، بەڵام خودا هەقی ئەو هەموو خراپەکارییانەی لێکردنەوە، مام حوسێن نەخۆشی دڵی گرت هەروەك براکەم بەدەست ناڵەو ئازارەوە دەیناڵاند.

ئێمە دڵمان وانەبوو لەگەڵ ئەوان بەتایبەتی دایکم خاوەنی دڵێکی زۆر پاك بوو، بەباوکمی گووت بە براکەت حوسێن بڵێ کار نەکات خانووەکەی خۆی بەکرێبدات بێتەماڵی ئێمە لە قاتی سەرەوە دابنیشێت، لەبەر ئەوەی ئەو نەخۆشی دڵی هەیە نابێت خۆی زۆر ماندوو بکات، ئەو کرێیەی وەریدەگرێت بۆخۆی دەتوانێت خەرجی ماڵەوەی پێبکات، بەڵام ژنەکەی مام هێندە رق لەدڵ بوو گووتی هەرگیز کاری وانابێت، ئیتر مام ناچار

هەرخەریکی کارکردن بوو تاوەکو رۆژێك هەواڵیان بەباوکمدا گووتیان براکەت بەهۆی نەخۆشی دڵ لەسەر کار کۆچی دوایی کردووە.

ئەوکات بۆم بەدیارەکەوت مرۆڤ هەرکارێکی خراپ بکات هەردەبێت بێتەوە رێگای، دڵنیاش بووم لەوەی رۆژێك دێت ماڵی پوورم گوڵنازیش بەهەمان شێوە ناچار بەئێمە دەبنەوە، هەروەك چۆن شادی دوایی ئەو هەموو خراپەکارییەی بەرامبەر دایکم کرد کەس نەیدەزانی ماوە یاخود مردووە، تەنها گوێمان لەوە بوو مێردی بە پیاوێك کردووە هەموو رۆژێك لێدانی بۆ دەکات، تەنانەت رۆژانە هێندە لێدان دەخوات ئێسکەکانی سینگی شکاوە، بەهەمان شێوەش غەریب کە ئازارێکی زۆری دایکی دەدا ئێستا چاوەکانی کوێر بووە هەروەك چۆن دایکی دووعای لێدەکرد هەروادەرچوو، بینیم خۆی ناتوانێت تاوەکو سەرئاویش بچێت دەبێت کەسێك دەستی بگرێت، منداڵە بچووکەکانی نەوەکانی رۆژانە گاڵتەیان پێدەکرد، محمد ی براشی نەخۆشی شێرپەنجەی گرت لەگەڵ ئەوەی هێندە دەوڵەمەندبوو دەیتوانی هەر وولاتێك بییەوێت بۆی بچێت بەلاَم هیچ ماڵ و سامانی نەما هەتا مردنەکەشی زۆر بەئازار بوو.

ئەو رووداوانەی دەمبینی هیچ دڵم پێی خۆش نەبوو، لەبەر ئەوەی ئارەزووم دەکرد ژیان بەو جۆرە نەبووایە کە ئێستا هەیە، ئەوەم دەویست هەموومان وەك یەك خێزان یارمەتی یەکتر بدەین، ئەوە مرۆڤەکانن دڵیان ئەو جۆرە ژیانەی ناوێت خولیایی ژیانی ئاژەڵی دەکەن.

من تەنها ئەوم دەویست ژیانێکی خۆش بۆ خۆم و خێزانەکەم دروست بکەم، بۆیە زۆر خۆم ماندوو کرد تاوەکو لە کۆلێژ پلەی یەکەمم بەدەست هێنا، لەبەر ئەوەی ئەوانەی پلەی یەکەمیان بەدەست دەهێنا راستەوخۆ لە نێو کۆلێژ دادەمەزرانەوە، بەردەوام بەدایکم دەگووت دایکە گیان سوپاس بۆ خوا ئەوا خوشکەکانم (حلمیە، ماردین، شاناز، چنار) مێردیان کردییە، ئیتر منیش دادەمەزرێم و پێویست ناکات تۆ کاری بەرگدووری بکەیت، من تەواوی پارەکانی خۆم دەدەمە تۆ.

بەمشێوەیە دڵمان زۆر خۆش بوو، بەلاّم ئەمجارە وەك هەمووجارێك ئەو دڵخۆشییەمان تاوەکو سەر نەبوو، بەهۆی ئەوەی دوایی تەواو کردنی کۆلێژ کوردستا رووبەڕووی قەیرانێکی گەورەی دارایی بوویەوە بەم هۆیەوە دامەزراندی من زۆر دواکەوت، ناچار من هەڵسام لەپشت ماڵی خۆمان عارەبانەیەکی خوادرن فرۆشتنم دانا، ئەگەرچی ئەو کارە بۆ من هیچ قازانجێکی ئەو تۆی نەبوو، بەلاّم بەهۆی ئەوەی لەدایکم نزیك بووم لەکارەکان دایکم یارمەتی دەدام زۆر دڵم پێی خۆش بوو.

رۆژێك پارەیەکی زۆرباشم قازانج کرد لە دڵخۆشیان گۆرانیم لەبەردەمی خۆم دەگووت هەرکە زانیم ژمارەیەکی زۆری پۆلیس هاتن بەڕێوەبەری شارەوانیان لەگەڵ بوو دەستیان بەسەر هەموو کەل و پەلەکانمدا داگرت.

ئەمجارەیان جیاواز لە جاران هیچ خەمێکم پێی نەخوارد لەبەر ئەوەی دڵنیابووم لەوەی هەردەبێت ئەو رۆژە ناخۆشییەك ببینم، تاکە قازانجی من لەماوەی ئەو کارەم ئەوە بوو کاتی ئەوەم بۆ رەخسا کتێبێك بنوسم و بلاّوی بکەوەمە.

بەردەوام دەمگووت دەبێت لەگەڵ ژیان بجەنگم و هیچ کاتێك چۆك بۆ ژیان دانەدەم، من نەمدەزانی هەرچەندە بەهێز بم لە کۆتایی ژیان هەردەبێت بمگرێنێت، هەرچەندە بتوانم خۆم لەبەردەم با بەهێزەکی ژیان رابگرم ئەو گەردەلوولەی بەهێزم بۆ دەنێرێت و لە رەگەوە هەڵمدەتەکێنێ، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا دەمگووت بەهێزم کاردەکەم ئێستا ئەو منداڵەی جاران نەماوم، من لەپێناو دایکم و خوشك و براکانم دادەژیم، ئێستا لەسایەی من هیچ کەسێك ناتوانێت هیچ بەدایکم بڵێت تەنانەت خالّم علی ناتوانێت هیچ بڵێت لەبیرمە جارێك زۆر خراپ لێمدا، ئیتر لەدوایی ئەو رووداوە دەترسا نەدەهاتە ماڵی ئێمە تەنانەت گووتم هیچ کەسێك بۆی نیە بەخراپە باسی دایکم بکات.

ژیانمان تادەهات بەرەوە گۆڕان دەچوو بەتایبەتی ئەو کاتەی لەنزیك ماڵی باوکم کارێکی زۆر باشی دەست کەوت، هەروەها منیش هەواڵی ئەوەم بۆهات کە دەست بەکاری دامەزراندنەکەم بکەم.

کاتێ دایکم گوێی لەو هەواڵە بوو نەیدەزانی چۆن دڵخۆشی خۆی دەربڕێت، لەبیرمە ئەوە شەوە تاوەکو بەیانی دایکم تەنها نوێژی کرد.

ژیان چەندە سەیرە من تاوەکو ئێستا خەریکی ئەوەم دابمەزرێم و ببمە خاوەن مووچەی خۆم، کەچی ئێستا من دوایی چەند هەفتەیەکی تر دادەمەزریم و تەنانەت باوکیشم بۆتە خاوەن کاری خۆم، بەڵام ئەوانە هیچ نین بۆ دڵخۆشی ئێمە لەبەر ئەوەی دایکم زۆر نەخۆش کەتووە، دایك واتا ماڵ کە دایکم کەوت واتا هەموو ژیانی منیش کەوت، ئێستا وەك جاران هەژارنین کەچی لەو کاتەی دایکم نەخۆش کەتووە خۆم بەهەژارترین مرۆڤی سەر زەوی دەزانم.

دایکم نەخۆشییەکی زۆر سەیری هەیە تەنها دەڵێت سەرم دێشێت چەندین جار چوینەتە لای دکتۆر هیچ ئەنجامێکمان دەست نەکەوتووە، لە کۆتایدا دکتۆر گووتی دەبێت ئیشاعەی سەری بۆ بگیردرێت، گووتی ئەمڕۆ چوارشەمە ڕۆژی شەمە وەرن ئیشاعەکەی بۆ دەگرین.

ئێمەش گووتمان زۆرباشە بەدڵنیاییەوە ڕۆژی شەمە دێنە نەخۆشخانە، ئەوەی ژیانی ئێمەی تێکدابوو تەنها ڕووداوە سودفەکان بوون، ڕۆژێك بەرلەوەی بۆ نەخۆشخانە بچینەوە، ڕۆژی هەینی تەلەفۆن بۆ باوکم هات گووتیان ماڵی شەرمین خوشکی دایکم لە سەیارە وەرگەڕاون و باروودۆخیان زۆر خراپە، بەمشێوەیە نەمانتوانی لە ڕۆژی دیاریکراو بچینەوە نەخۆشخانە، دایکم دوایی ئەو ڕووداوە باروودۆخی زۆر خراپ بوو لەبەر ئەوەی پوورم و منداڵەکانی هەموویان بۆ ژووری نەشتەگەری بردران.

بەمشێوەیە دەنگوباسی دامەزراندنی من بوو بە هەواڵی ناخۆشی گریان، ئەوەی دڵخۆش کەربوو ماڵی پوورم هیچ کامێکیان کۆچی دواییان نەکرد، زۆر دڵمان بەو هەواڵە خۆش بوو، بەڵام بێخەبەر لەوەی کارەساتێکی تری گەورە چاوەڕوانی ئێمەیە.

ئەو هەفتەیە ژیانی ئێمە هێندە سەیر بوو هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانمان تێکەڵی یەکتر ببوو، ئەو شەوە هەرگیز لەبیر ناکرێت کە باوکم زۆر بەتوندی بانگە منی کرد، محمد محمد هەڵسە لەخەو دایکت باروودۆخی تێکچووە، من لەسەربان ژووری خۆم هەبوو کە چوومە خوارەوە بینم دایکم هیچ جووڵەی نەماوە، بانگم کرد دایکە گیان هەڵسە من محمد، هێندە منی خۆش دەویست کە گوێی لە دەنگی من بوو چاوەکانی کردەوە گووتی من باشم دلت توندمەکە، باوکم چوو سەیارەکەی هەڵکرد منیش دەستی دایکمم گرت و بردم بۆ ناو سەیارەکە و چووینە نەخۆشخانە، دەمزانی دایکم ئازارێکی زۆری هەیە هێندەم خۆش دەویست هەستم بەئازارەکانی گیانی ئەو دەکرد، لەتەنیش ئەو دانیشتم و دەستم لەناو دەستی دانا زۆر بەتوندی دەستی ئەوم گرت دەمزانی کۆتاجارە، من لەخەمی ئەودا ئەویش لە خەمی من بوو، لەگەڵ ئەو هەموو ئازارەی هەیبوو دەگووت کوڕم هەڵسە لێرە دامەنیشە سەرمات دەبێت لێرە سپلیت پێکراوە، لەوکاتەدا ناوی هیچ کەسێکی لەبیر نەمابوو تەنهان ناوی منی دەهێنا، لەکۆتا جار کوڕم محمد هەندێك سەرم بەسینگی خۆت بکە دەمەوێت بۆنت بکەم، منیش هەڵسام سەری ئەوم هێنایە سەر سینگی خۆم، گووتی کوڕم من دەمرم هیچ خەم مەخۆ، ئیتر ئەوە کۆتا ووشەی ئەو فریشتەی ژیانم بوو بیستم، دوایی ئەوە رۆحی پاکی لە لاشەی دەرچوو، کۆتا ووشەی ئەو بۆمن ئەوە بوو کوڕم دڵی خۆت تەنگ مەکە.

لەکاتی پرسەی دایکم من زۆر باروودۆخم خراپ بوو بەهۆی ئەوە جامی نەخۆشخانەم بە دەستەکانم شکاند، هەردوو دەستم خوینی وەك ئاو لێدەهاتە خوارەوە ناچار دکتۆرەکان هەژدە تەقەڵیان لە دەستەکانم دوورییەوە، لەو کاتەدا پوورم گوڵناز لەماڵی

ئێمە گووتی تۆ بۆ وات لەخۆت کردووە، تۆ دەبێ بەهێز بیت و ژن بهێنیت، ئەوتا من کچم هەیە کامە کچت دەوێت من پێشکەشت دەکەم.

خێرا قسەیەکی دایکم بیرکەوتەوە کە دەگووت کوڕم ڕۆژێك دێت ماڵی پوورت گوڵناز بەناچاری دێنەوە بەر دەرگایی ئێمە، منیش هەردەمگووت کەی؟، نەمدەزانی ئەو ڕۆژە کەی دێت ئیتر بەچاوەکانی خۆم ئەو ڕۆژەم بینی بەناچاری هاتنەوە بەردەرگایی ئێمە، بەڵام نابێت هەرگیز ئەو وەسیەتەی دایکم لەبیر بکەم کە دەیگووت هەرگیز کچ لەوان مەهێنە.

ژیان لەدوایی دایکم زۆر سەخت بوو تازە من پارەم بۆچیە؟، کێ هەیە تاوەکو دەگەڕێمەوە ماڵەوە لە بەردەرگا چاوەڕێی من بکات، تێگەیشتم هاوار گریان تەنانەت خۆکوشتنیش چارەسەرێکی بۆ من نیە، دەبێت خۆم لەگەڵ ئەو خەمە گەورەی هەیە رابهێنم، چۆن بتوانم من خۆم بکوژم خۆ من لە پێناو خۆم دا ناژیم من بۆ خوشك و براکانم دەژیم دەمەوێت ئەوان خۆش بەخت بکەم، دەبێ ژیان فێری ئەوە بکەم لەگەڵ من نەجەنگێت لەبەر ئەوەی من ئێستا ئەو منداڵەی جاران نەماوم بەدڵی خۆی یاریم پێبکات منیش زۆر بەهێزم دەجەنگم تا ئەوکاتەی ژیانم مابێت چۆك بۆ دوونیا دانادەم.

ئەمجارە بە هێزییەکی زۆر زۆرەوە خۆم نیشانی دوونیادا، نەمدەهێشت دوونیا هەست بەوە بکات لەناخەوە هەناوم وێران بووە، بۆیە بەناخێکی رووخاوەوە دەستم بە کاری دامەزراندن کرد، دایکم خولیای بینیی ئەوە رۆژەی بوو بەڵام نەیبنی.

دوایی مردنی دایکم کەمێك کێشەی علی و ژنە شەیتانەکەی بۆ ئێمە هیچ کۆتایی نەهات، دوایی ئەوە لەگەڵ علی بوو بەدەمەقاڵێمان زۆر نامەردانە رۆژێك بەدزییەوە بەپلانی خۆی و ژنەکەی سەیارەکەی ئێمەی ئاگر تێبەردا، هەرچەندە زۆر دیار نەبوو کە ئەو ئاگری تێبەرداوە بەڵام دڵنیام بووم کە خاڵم ئەو کارەی کردووە، لەو رۆژە تەلەفۆنم

بۆ خالۆژنم کە لەهەمان کات کچی مامیشم بوو کرد گووتم تۆ دەدەم بەو خودایە علی ئەو کارەی کردووە.

گووتی نەخێر ئێوە بوهتان بۆ مێردەکەی من دەکەن.

گووتم زۆرباشە خودا هەموو شتێك دەبینێت و خۆی ئاگادارە، ئیتر ئەوەبوو سالێك بەسەر سوتانی سەیارەکەی ئێمە تێنەپەڕی، خالۆژنم بە هۆیی ئەوەی خالم هێندەی لێدابوو تەنانەت شیشەی داغکراوی لە سکی بردبووە ژوورەوە، ئیتر ئەویش لەو کارەی زۆر بێزاربوو بەدەستی خۆی ئاگری لە خۆی بەردا، ئەگەرچی نەمرد بەلام ئێستا ژیانی هەر رۆژەك و بەمردنێك هەیە، لەو کاتەی خۆی سوتاندبوو گووتی هەتا نەمردووم پێویستە راستیەك بلێم علی مێردم بوو سەیارەی مالی مامی سوتاند.

ژیان هەرگیز بەزەیی بەهیچ کەسێکدا نایێتەوە نە من نە تۆ نە هیچ کەسێکی تر، ئەگەر تۆزێك ژیان وەفایی هەبووایە ئەوا نەدەبوو ئەو خوشکە بچووکەم ئایە لە تەمەنی یەك سالێ و نیویدا بێ دایك ببێت، من نەمدەهێشت ئەو هەرگیز هەست بەبێ دایکی خۆی بکات، بۆیە لەبری دایکم کاتێ دەستی بەقسەکردن کردن بە منی دەگووت دایکە، منیش هێندە هەست و سۆزم بۆی هەبوو بەقەدەر دایکێك ئەوم خۆش دەویست، ئەگەرچی نازانم دایك چەند مندالەکەی خۆی خۆش دەوێت.

دووسالێ بەسەر مردنی دایکم تێپەڕی، من هەتا ئێستاش وادەزانم تازە دایکم لەدەست داوە و هیچ خۆشییەکم لەو شارەدا نەماوە، لەبەر ئەوە بۆ خوێندنی ماستەر حەزمکرد بچمەدرەوەی وولات، بۆیە لەرێگەی ئینتەرنێتەوە چەندین زەمالەی وولاتانم پڕکردەوە، ئیتر ئەوە بوو دوو زەمالەم بۆ دەرچوو یەکێکیان وولاتێکی ئەورووپی دوور بوو ئەوەی تر تورکیا بوو، بەهۆی نزیکیەوە لە مالەوە وولاتی تورکیام هەلبژارد.

ئەوکاتەی چوومە تورکیا دەستم بە خوێندن کرد، کەمێك دلخۆش بووم و ئازارەکانی ژیانم لەبیر دەکرد، بەلام بە هۆیی ئەوەی من لە میللەتی کورد بووم لە وولاتی تورکیا زۆر

ئازار دەدرام، کەچی لەنێوەخۆی وولاّتەکەم زۆر زیاتر ئازارییان دەدام رێگەی ئەوەیان نەدەدام بخوێنم مۆڵەتی خوێندنم رۆژ دوایی رۆژ دوا دەکەوت بەبەرچاوی من کەسانێك هەبووم بەهۆی ناسینی کەسێکی نزیك لە وەزیر مۆڵەتیان وەردەگرت، بەڕاستی ئازاری لەلایەن کەسانی میللەتەکەی خۆمەوە پێم دەدرێت زۆر ئازاری زیاترە لەوەی کە کەسانی بێگانە پێمی دەدەن، پێم خۆشە بێگانە گیانم بکێشێت و جەستەم پارچە پارچە بکات و بمسوتێنێ نەك کەمترین ئازار بدرێم لەلایەن هاو زمانەکانمەوە.

لەگەڵ ئەوە هەموو ناخۆشییەی هەمبوو دەست بەرداری خوێندنەکەم نەدەبووم، دەستم بەخوێندن کرد و دوایی ئەوەی کۆرسی یەکەمی زمانی تورکیم تەواو بڕیارمدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی مۆڵەتی خوێندنم بگەڕێمەوە کوردستانە پەشۆکاوەکەی عیراق، لەلایەکی تر خوشکم بەردەوام دەگووت دایکە کەی دەگەڕێتەوە؟، زوو وەرەوە بیری تۆ دەکەم، بۆیە ناوەی کۆمپانیایەکی گەڕانەوەم لە هاوڕێیەکم وەرگرت، بەلاّم کاتێك گەیشتمە تێرمینالّ هەرچەندەی گەڕام ئەو کۆمپانیایەم نەدۆزییەوە هاوڕێیەکەم پێدابوو، بۆیە ناچار لەگەڵ کۆمپانیایەکی تر گەڕامەوە.

ژیانی من هەمووی بۆتە سودفە و رووداوی زۆر سەیر بەسەرم داهاتووە و تەنها بۆ ئەوەی دڵی من پێیەوە تەنگ ببێت، ئەو پاسەی من لەگەڵی گەشتم کرد دەبووایە کاتژمێر دەی بەیانی بگاتە شاری دیاربەکر، بەلاّم بەهۆی ئەوەی من لە تێرمیانالّی شاری ئەنقەر کەمێك دواکەتم پاسەکەمان سزادرا و نزیکە یەك کاتژمێر و نیو وەستاین، بۆیە من لە دیاربەکر بە پاسی کاتژمێر دە رانەگەیشتم ناچار گەشتەکەم لەگەڵ پاسێکی تر بەرەو هەولێر دەست پێکرد.

لەنێو پاسەکەدا کچێکم بینی زۆر سەرنجمی بۆ خۆی راکێشا، لەسەرەتا من وامزانی ئەو کچە لە میللەتی کورد نیە، ئیتر من زۆر سەیری ئەوم دەکرد دەمگووت قسەی لەگەڵ بکەم یاخود نەکەم، ئاخەر من زۆر شەرم دەکەم و هیچ بیانوێکیشم نیە بۆئەوەی قسە لەگەڵ ئەو بکەم.

سەیرم دەکرد ئەو کچە هیچ کەسێکی لەگەڵ نیە، دەمگووت چۆن دەبێت کێچکی گەنجی وەك ئەوە بە تەنیا هاتبێتە وولاتی تورکیا، بەهەرحاڵ هەرچەندەی دەمویست قسەی لەگەڵ بکەم کەچی هیچ فرسەتێکی ئەوەم بۆ نەرەخسا.

دوایی ئەوەی گەیشتینە سنوری نێوان عیراق و تورکیا لە کاتی کۆنترۆڵکردنی پاسەپۆرتەکانمان کەوتینە بەرامبەر یەکتر، ئەفسەرە تورکەکە بەزمانی تورکی چەند پرسیارێکی لەو کچەکرد نەیزانی وەلآم بداتەوە، لەو کاتەدا منیش گووتم تۆ کوردیت؟.

بەڵی من کوردم.

زۆر دڵم خۆشبوو بەوەی کەوا کورد دەرچوو، ئیتر کە گەڕامەوە نێو پاسەکە چوومەلای پرسیم تۆچی دەکەیت لە وولاتی تورکیا؟.

گووتی من بۆ خوێندنی ماستەر هاتووەمەت ئێرە، ئێستا تەواومکردووە دەگەڕێمەوە عیراق.

گووتم پیرۆزە بێت بەهۆی ئەوەی زۆر شەرمم دەکرد زیاتر قسەم لەگەڵی نەکرد و گەڕامەوە شوێنی دانیشتنی خۆم و بیرم لەوە دەکردەوە چۆن بتوانم ناونیشانی لێوەربگرم، لەو بیرکردنەوانە دابوو، کچەکە ئاوەڕی منی دایەوە پرسیاری کرد تۆ لەکامە شاری تورکیا دەخوێنیت؟.

منیش بۆ ئەوەی خۆم زیاتر لێی نزیك بکەمەوە پرسیم لە تەك تۆ کورسییەکی بەتاڵ هەیە بێمە ئەویٔ؟.

گووتی بەڵی...

منیش چوومە تەنیش ئەو دانیشتم هەستم بەخۆشیەکی زۆر دەکرد، گووتم من ناوم محمد لە وولاتی لە زانکۆی ئولوداغ تورکیام ماستەر دەخوێنم.

ئەویش گووتی منیش ناوم سەنارییایە لەبەشی باخچەی ساوایان ماستەرم لە شاری العزیز لە تورکیا تەواوکرد و بۆ کاری بڕوانامەکە هاتبوومە تورکیا.

گووتم پیرۆزت بێت خۆشحاڵبووم بەناسینیت، بەڵام من زۆر سەردانی کۆلێژی ئێوەم کردووە بۆچی تۆم لەوێ نەبینیوە؟.

گووتی من ئێستا لەناو کۆلێژ کار ناکەم بەڵکو چوومەتە نێو وەزارە ئەوێ بۆ من زۆر باشترە.

گووتم خۆتان باشتر دەزانن بەڵام من هیچ حەز بە کاری نێو وەزارەت ناکەم.

بەهۆی ئەوەی پاسەکە ئێمە لە ڕێگا کەمێك کێشەی هەبوو، ڕێگا دوو هێندە درێژ بوویەوە زۆر حەزمدەکرد زیاتر دریژببێتەوە بۆ ئەوەی بەباشی ئەو کچە بناسم، پێم گووت من زۆر لە عیراق نامێنمەوە بەرلەوەی بگەڕێمەوە حەزدەکەم چاوم پێت بیکەوێت، بۆ ئەوەی پێوەندیمانە هەبێت ژمارەی مۆبایل و فەیسبووکەکەی خۆی بەمن دا.

کاتێکی زۆرم لەبەردەست نەبوو لەعێرق بمێنەمەوە، تەنها دەمویست کارەکانی مۆڵەتەکەم تەواو بکەم و دواتر بگەڕێمەوە، لەبەر ئەوەی سەنارِیا لە نێو وەرزارەت کاری دەکرد داوام لەو کرد یارمەتیم بدات، بەڵام ئەویش کەسێکی نەدەناسی بتوانێت کێشەکەی من چارەسەربکات، ئیتر زۆرم نەمابوو بگەڕێمەوە تورکیا داوام لە سەنارِیا کرد بێتە کۆلێژی ئێمە، بۆئەوەی بەر لەوەی بگەڕێمەوە تورکیا ئەو ببینم.

نامەیەکم بۆی نارد گووتم من لەکۆلێژم ئەمڕۆ دەگەڕێمەوە ووڵاتی تورکیا بەرلەوەی بگەڕێمەوە حەزدەکەم جارێکی تر تۆ ببینمەوە.

گووتی زۆرباشە منیش هەر لەناو وەزارەتم دێمەلات.

دوایی هاتنی بۆ کۆلێژ نزیکەی بیست خولەك پیاسەیەکمان بەیەکەوە کرد و کەمێك باسی ژیانی خۆمانمان کرد، ئەوەی راستی بێت ئەو بیست خولەکە لەدوایی مردنی دایکم خۆشترین بیست خولەکم بوو بیبینم.

بەرلەوەی یەکتر جێبهێڵین گووتم پرسیارێکم هەیە توڕەنابیت؟.

گووتی فەرموو...

گووتم تۆ تەمەنت چەند ساڵە

گووتی من لە ساڵی 1992 لەدایك بووم مانگی سێ ئەم ساڵ تەمەنم دەبێتە بیست و شەش ساڵ.

دڵم زۆر خۆشبوو لەبەر ئەوەی بە ساڵێك لە من بچووکتر بوو، ئەمە دواین قسەی من بوو لەگەڵ ئەو گووتی من دەبێت بڕۆم زۆر درەنگ کەوتووم.

گووتم زۆرباشە منیش چەند کاتژمێرێکم ماوە دەگەڕێمەوە تورکیا، بەڵام لەرێگەی فەیسبووەکەوە ئاگامان لەیەکتر دەبێت.

دوایی بینی سەناریا لەو رۆژەدا زۆر زیاتر ئەو کچەم کەوتە نێو دڵ، گووتم دوایی گەڕانەوە بۆ تورکیا هەموو شتێکی بەڕاستی پێدەڵێم، پێدەڵێم کە من تۆم زۆر کەوتۆتە دڵ هەر لەگەڵ یەکەم بینینی تۆ هەست دەکەم تۆم زۆر خۆش دەوێت، ئەگەر تۆ رازیبیت دێمە داوات، بەڵام من چۆن پێی بڵێم ئاخەر کەسێکی وەك من شەرمن چۆن دەتوانێت کارێکی لەو جۆرە بکات؟.

لەکاتی گەڕانەوەم بۆ تورکیا لەرێگا هەربیرم لەو کچە دەکردەوە، خودایە هەست دەکەم زۆر ئەو کچەم خۆش دەوێت ناتوانم بۆ یەك چرکەش لە بیری خۆمی دەربکەم.

هەست بەوە دەکەم ئەویش هەندێك سۆزی بۆ من هەیە، دەبێ من هەندێك وورە بدەمە بەر خۆم و هەستی خۆمی بۆ دەربڕم، هەست بەوە دەکەم ئەو کچە دەبێتە ئەو فریشتەیەی لە دوایی دایکم بەدوایدا دەگەڕام، بۆیە هەرچۆنێك بێت دەبێت زیاتر خۆمی لێ نزیك بکەمەوە و بتوانم سەرنجی ئەو بۆ لای خۆم رابکێشم.

ئیتر شەوێك قسەم لەگەڵ ئەو دەرکرد، ئەو گووتی من زۆر ماندووم بەیانی دەوامم هەیە دەبێت بنوم منیش گووتم زۆرباشە، کاتێ ئەو لەخەت نەما دوایی ئەوەی هەموو بوێری خۆم کۆکردەوە و نامەیەکم بۆی نووسی گووتم سەناریا من تۆم زۆر خۆش دەوێت، بۆیە ئەگەر رازیبیت کە گەڕامەوە دێمە داوای تۆ، لەکاتەدا زۆر لەوە دەترسام ئەو بڵێت نەخێر ئەو شەوە تاوەکو بەیانی هیچ خەو نەچوویە چاوەکانم دەگووت خودایە هەرچۆنێك بێت ئەو کچەش منی خۆش بوێت من ئەوم زۆر خۆش دەوێت ناتوانم هیچ لە بیری خۆمی دەربکەم ئەگەر ئەو گووتی نەخێر ئەوکات من چی بکەم؟، لە ترسانیش ئەو رۆژە تاوەکو دەمەو ئێوارە خەتی ئینتەرنێم نەکردەوە.

بۆ ئێوارەکەی بەترس و لەرزێکی زۆر خەتی ئینتەرنێتم کردەوە بینم نامەیەکی ئەو هاتووە من دەبێت بیرلەو بابەتە بکەمەوە و ئەوکات بڕیاری خۆم بدەم، ئیتر دوایی بیرکردنەوەیەکی چەند رۆژەی ئەو گووتی من رازیم شوو بەتۆ بکەم.

منیش ئەو کاتەی پێی گووتم تەواوی ژیانم بۆ ئەو روونکردەوە، گووتم ئەوانەی بۆ تۆم باسکردووە تەواوی ژیانی منە ئێستاش سەربەستی لەوەی کە وەڵامەکەت بگۆڕیت، بەڵام دیاربوو ئەویش منی  خۆش دەویست بۆیە گووتی من هەموو شتێکی تۆم قبوڵە.

نزیکەی مانگێك قسەمان لەگەڵ یەکتر دەکرد، رۆژێك پێوەندیم پێوەکرد کەچی زۆر بە ساردی وەڵامی منی دایەوە، منیش گووتم سەناریا گیان تۆم زۆر خۆش دەوێت ئەگەر دەزانیت شتێك رێگردەبێت بۆ ئەوەی بەیەك بگەین ئەوا من هەرگیز نابیتەوە، بەڵام لێت

دەپاڕێمەوە من عاشقی خۆت مەکە دواتر بۆیەکتر نەبین، من کەسێکم خۆش بوێت ناتوانم بە ئاسانی لەبیری بکەم.

لەوکاتەدا سەناریا گووتی پێویستە کەمتر قسە لەگەڵ یەکتری بکەن.

منیش گووتم ناتوانم قسە لەگەڵ تۆ نەکەم هەموو شتێکم لێداوابکە تەنها لە قسەکردن لەگەڵ خۆت بێبەشم مەکە، تۆ دەتوانیت قسە لەگەڵ من نەکەیت.

گووتی دەزانی تۆ زۆر لەسەر شت پێداگری دەکەیت من کە گووتم نا واتا نا.

منیش گووتم زۆرباشە تێگەیشتم دوایی ئەوە خەتی ئینتەرنێتم داخست و هەموو شتێکم لای خۆم سڕییەوە، ماوەی یەك هەفتە هیچ پێوەندییەکم بە سەنارياوە نەکرد، خەریك بوو بەیەکجار ئەو لەبیربکەم، بەڵام هەرکاتێك بیرم دەکەوتەوە وەك ئەوە وابوو خەنجەرێك بە نێو دڵمدا بچەقێنن.

هەرچۆنێك بوو خۆم راهێنا لەسەر ئەوەی قسەی لەگەڵ نەکەم، دوایی هاوڕێیەکی تورکم هەبوو ناوی رەحمان بوو، سەناریا ئەو کوڕەی دەناسی لەبەر ئەوەی زۆر باسی ئەو کوڕم بۆی کردبوو، رۆژێك رەحمان گووتی کچێك نامە بۆمن دەنێرێت دەڵێت من هاوڕێی محمد پێبڵێ پێوەندیم پێوەبکات، منیش کاتێك سەیرم کرد سەنارياببوو نامەی زۆری بۆ ئەوە هاوڕێیەم ناردبوو زرۆیش پاڕابوویەوە ژمارەی تورکیای من وەربگرێت.

لەوکاتەوە من پێوەندیم پێوەکرد گوێم لێیوو دەگریا، گووتم چی بووە سەناريا بۆچی دەگریت من هیچ شتێکی خراپم لەبەرامبەر تۆدا کردووە؟.

گووتی نا بەخوا هیچ کێشەك لەتۆدانیە کێشە لە منە بیرلەوە دەکەمەوە ناتوانم بێ تۆ بژێم ناتوانم قسە لەگەڵ تۆ نەکەم ئەو ماوەیەی قسەم لەگەڵ تۆ نەکردووە زۆر دڵتەنگ بووم، ئیتر لەمەودوا دەمەوێت هەموو رۆژێك گوێم لەدەنگی تۆ بێت.

گيانەكەم مەگری منيش تۆم خۆش دەوێت دەمەوێت هاوسەرگيريت لەگەڵ بكەم، ئەوە بەڵێنی منە دڵنيابە لەوەی من بەڵێنێك بدەم دەيبيگەێنەم سەر ئەگەر لەپێناويشدا بمرم.

بەمشێوەيە رۆژ لەدوايی رۆژ خۆشەويستيەكەمان زيادی دەكرد، رۆژێك پێوەندی پێوەكردم گووتی هەواڵێكی خۆشم بۆت هەيە، بەو زووانە دێمە شاری العزيز ئەوكات تۆش وەرە لەویێ دەتوانين يەكتر ببينين.

منيش گووتم زۆرباشە هيوايەتم بۆتە ئەوەی جارێكی تر تۆ ببينمەوە، ئەگەرچی پارەن نەبوو ناچارا چوومە لای هاوڕێيەكم و پارەم بە قەرز لێوەرگرت بۆ ئەوەی سەفەری ئەو شارەی پێبكەم.

شارەكەی من زۆر لەو شارەی ئەو دووربوو، كەچ تەنها بۆ بينی ئەوكەسەی وەك رۆحم خۆشم دەوێت هەژدەدە كاتژمێر لە نێو پاس بووم تاوەكو گەيشتمە ئەو، زۆر دەترسام لەبەر ئەوەی پێشتر هەرگيز لەگەڵ هيچ كچێك كۆنەببوومەوە، كە چاوم بە بينينی ئەوە كەوت لەشم كەوتە لەرزين، سەناريا گووتی ئەو چيتە بۆ وا دەلەرزەيت سەرماتە؟.

گووتم نەخێر من لەپێشتر لەگەڵ هيچ كچێك كۆنەبوومەتەوە، بۆيە كەمێك شەرم دەكەم هيچ نيە كەمێكی تر باشتر دەبم.

ئەوكات دڵم زۆر خۆش بوو بيرم لەوە دەكردەوە ئيتر ژيان دەستی لەسەر هەڵگرتووم جارێكی تر ناخۆشييەكانی خۆييم نيشانناداتا، دەمگووت سەركەوتوو بووم لەكۆتايی، ئەوەتا كەسێكم دۆزييەوە وەك دايكم بۆم بۆتە فريشتە هەر لەبيری منداية، سێ رۆژ لەو شارە مامەوە لەو ماوەيە چەندجارێك توانيم ئەو كەسەی خۆشم دەوێت بيبينم، نەمدەتوانی زۆر ئەو ببينم لەبەر ئەوەی دوو هاوڕێی هەبوو بەناوەكانی تامارا كە خەڵكی فەلەستين بوو لەگەڵ كچێكی تری خەڵكی شاری سلێمانی بوو بەناوی ئارێز، بەهۆی ئەوانەوە نەمدەتوانی زۆر چاوم بە سەناريا بكەوێت، سەناريا لەوە دەترسا ئەوان بەو پێوەنديیەی ئێمە بزانن، ئەگەرچی دايكی سەنارياش بەو پێوەنديیەی ئێمە ئاگاداربوو.

ئیتر کاتی ئەوە هات من شاری العزیز بەجێبهێڵم بگەڕێمەوە شارەکەی خۆم، هەرگیز ئەو ڕۆژە لەبیرناکەم کە لەگەڵ سەناریا بۆ تێرمینالّ چووم، بەرلەوەی ئەو پاسەی لەگەڵی دەگەڕێمەوە کاتی دەرچوونی بێت، گەیتشینە ناو تێرمینالّی شاری العزیز، بینیم سەناریا دڵی زۆر تەنگ بوو هەردەیگووت توخوا چۆن دەتوانیت من بەجێبهێڵت؟.

منیش دەمگووت ناچارم هەردەبێت بگەڕێمەوە بەهۆی خوێندنەکەم هیچم نەماوە تەواو بکەم خێرادەگەڕێمەوە و دیمە داوای تۆ.

کاتێ سەناریا بینی ئەو پاسەی کە دەبێت لەگەڵی بگەڕێمەوە هات دەستی بەگریانکرد منی لەباوەشکرد گووتی توخوا محمد لەبەر دڵی من زۆر زوو وەرەوە.

گووتم گیانە ئەو محمدەی تۆ دەیناسیت هیچ کاتێك بەڵێنی خۆی ناشکێنێت، سەناریا بەجۆرێك دەگریا وەك بڵێت جارێکی تر یەکتر نابینیەوە، دەیگووت تۆ زۆر دڵرەق دیاریت چۆن دەتوانی بەبێ گریان من بەجێبهێڵیت.

منیش لەناخەوە دەسووتام بەلآم بۆ ئەوەی هەرچۆنێك بووە دڵی ئەو تەنگ نەکەم دانم بەخۆم داگرت.

بەهەر حالّ ڕۆژ لە دوایی ڕۆژ زیاتر یەکترمان خۆش دەویست، تاگەیشتە ئەو رادەیەی ئەگەر ڕۆژێك قسەمان لەگەڵ یەکتر نەکردبا، بۆ ڕۆژی دواتر بەگریانەوە قسەمان لەگەڵ یەکتر دەرکرد، لەبیرمە ئەو ڕۆژەی کە نەخۆش بووم نەمدەتوانی وەلآمی نامەکانی ئەو بدەمەوە، نامەیەکی نارد نووسی بووی لێت دەپاڕێمەوە وەلآمم بدەوە من چی بکەم کەس نیە هەواڵی تۆم پێبدات.

منیش لەنەخۆشخانە کەوتبووم نەمدەتوانی وەلآمی بدەمەوە، بەلآم کاتێ ئەو نامەم بنی فرمێسکەکانی چاوم هاتە خوارەوە، گووتم خودایە زۆر سوپاس کەسێکت پێدام وەك دایکم فریشتەیە، خێرا بەبێ ئەوەی گوێ بدەمە قسەکانی دکتۆر خۆم کانوونەکەی

دەستم لێکردەوە و وەڵامیم دایەوە خوێنی شوێنی کانوونەکە دەڕژایە سەر مۆبایلەکەم بەڵام هێندە ئەوم خۆش دەویست وەك بڵێت هیچ ئازارێکم نیە دەستم لەنووسین هەڵنەگرت.

سەناریا گووتی ئەو بۆچی وەلامم نادەیتەوە خۆ هیچ شتێك نەبووە؟.

هەرگیز نەمدەویست دڵی تەنگ بکەم گووتم هیچ نیە گیانەکەم؟.

گووتی دەزانم شتێك بووە بۆیە وەڵامی منت نەدەدایەوە، لەبەر دڵی دایکت پێم بڵێ کەچی بووە؟.

گووتم هیچ نیە تەنها کەمێ نەخۆش بوو.

تەواو لە قسەکەم نەبوومەوە سەناریا دەستی بەگریانێك کرد، تەنانەت منیش خۆ پێنەگردرا لەگەڵ ئەو دەستم بە گریانکرد.

خۆشەویستیەکەمان رۆژ لە دوایی رۆژ زیادیدەکرد، تاوەکو کاتی ئەوەهات من بگەڕێمەوە، من و ئەو چرکەکانی ژیانمان دەژمار بۆ ئەوەی بگەین بەیەکتر، پێوەندیم بە سەناریا کرد گووتم هەوالێکی زۆر خۆشم بۆت هەیە، رۆژی هەینی پلیتی پاس دەربڕم رۆژی شەمە دەگەڕێمەوە عیراق.

ئەو گووتی ئەی بۆچی بە تەیارە نایێتەوە؟، بە پاس زۆر ماندوو دەبیت.

گووتم من لە سواربوونی تەیارە زۆر دەترسم، لەبەر ئەوەی نەمەدویست بزانێت پارەی ئەوەم نیە پلیتی تەیارە بکڕم.

گووتی نەخێر باوەڕت پێناکەم دەزانم پارەی ئەوەت نیە بە تەیارە بێتەوە.

گووتم ئەوەی راستی بێت هەروایە،تۆ هیچ دڵی خۆت تەنگ مەکە من راهاتووم لەوەی لە ژیان بە ئازارەوە بژیم بۆیە ئەوە هەر ئازار نیە لەبەر ئەوەی کە هاتمەوە ئیتر من و تۆ دەگەین بەیەکتر.

رۆژێك دوایی ئەوە نامەیەکم لە سەناریاوە بۆ هات گووتی ئەوە پارەی تەیارەم بۆ داویت تۆ بە تەیارە بگەڕێوە عیراق.

منیش زۆرم پێناخۆش بوو، گووتم بۆچی کاری ئاوات کردووە ئێستا چەند رۆژی تر جەژنە پێویست بە پارە دەبێت؟.

سەناریا گووتی شتێکم تاوەکو ئێستا لێت شاردۆتەوە پەیمان بدە کە لێم تورەنابیت کەپێت بڵێم.

گووتم چۆن بەڵێنت پێبدەم کە نەزانم شتەکە چیە؟.

ئەو دەیزانی کە من پەیمان بدەم هیچ کاتێك پاشگەز نابمەوە، گووتی تاوەکو پەیمان نەدەیت پێت ناڵێم.

گووتم من هەر لەو کاتەی خۆشەویستی تۆم کەوتۆتە دڵەوە پەیمانم داوە هیچ کاتێك لێت زوویرنەبم.

گووتی تۆ هیچ خەمی پارەت نەبێت ئێمە زۆر دەوڵەمەندین، ئەگەر ئەو دەوامەی دەیکەم تەنها بۆ خۆشی خۆمە نەوەك بۆ پارە.

دوایی ئەوەی گوێم لەو قسەیە بوو دڵم زۆر تەنگ بوو زۆر دەترسام ئەو دەوڵەمەندییەی ئەوان کێشە بۆ من دروست بکات، بیرم لەوە دەکردەوە رەنگە هۆکارێك دروست ببێت و پەشیمان ببێتەوە، هەرچۆنێك بوو دانم بەخۆم داگرت و دڵتەنگی خۆم نیشان نەدا نەکا ئەویش دڵی تەنگ بێت.

دوایی گەڕانەوە هەردووکمان چاوەڕانی ئەوەمان دەکرد جەژن تەواو ببێت و بۆمان ببێتە دوو جەژن، دوو رۆژ مابوو بۆ جەژن گووتم سەناریا دەمەوێت بتبینم، گووتی نەخێر یەکەم رۆژی جەژن دێم تۆ دەبینم، گووتم زۆرباشە هەرگیز ناتوانم دڵی تۆ بشکێنم تۆ چیت پێباشە با هەروا بێت.

لەدوایی مردنی دایکم هیچ جەژنێکی من خۆش نەبوو، بەڵام ئەو جەژنە بەهۆی ئەوەی فریشتەیەکی وەك دایکم هاتۆتە ژیانمەوە زۆر دڵم خۆش بوو، ئەو رۆژە بەیانییە زووەکەی هەڵسام و خۆم زۆر جوان کرد، ئەو جلەم لە بەر کرد کە سەناریا بۆی کڕیبووم.

من بێئاگا لەوەی کە نابێت دڵم خۆش بێت، ئەگەر دڵم خۆش بێت دەبێت خێرا ناخۆشییەك بەدوایدا بێت، وامدەزانی ئیتر چارەنووس دەستی لەسەرم هەڵگرتووە بەزەیی بەمن دێتەوە هیچی تر ئازارم نادات، من چی بزانم ئەو جارە ژیان پلانی کۆتایی خۆی بۆ داناوم دەیەوێت بە تەواوەتی هەموو هیوا و ئاواتەکانم لە ژێر گڵ بنێت.

لەو رۆژە هەر چاوەڕوانی ئەوە بووم سەناریا پێوەندیم پێوەبکات، بەیەکەوە بچینە دەرەوە ئەو چاوەڕوانەییەی من زۆری کێشا هیچ هەواڵێك لە سەناریا نەبوو، تەنانەت جەژنە پیرۆزەشی لێنەکردم زۆر ترسام لەوەی شتێك بووبێت، بەڵام وەك هەموو جارێك نەمدەویست ژیان بزانێت من لاوازم خۆم بە بەهێزی نیشاندەدا و دەمگووت رەنگە میوانیان هەبێت، بۆیە گیانەکەم ئاگای لەو کەسە نیە کە خەریکە بۆ هەواڵێکی ئەو وەك پشکۆی ئاگر گڕدەگرێت.

کات زۆر دەرنگی کرد نەموتوانی زیاتر خۆم رابگرم نامەیەکم بۆی نارد گووتم من هەر چاوەڕوانی تۆبووم گیانەکەم بۆچی نەهاتیت، ماوەیەکی زۆری پێچوو هیچ وەڵامێکی منی نەدایەوە، ماڵی ئەوانم پێنەدەزانی نەمدەزانی چی بکەم، ناچار نامەیەکی ترم نارد بۆی گووتم لێت دەپاڕێمەوە سەناریت گیان چی بووە بۆچی وەڵام نادەیتەوە؟.

هەرکە زانیم نامەیەکی ناردەوە گووتی مامۆستا محمد هەموو شتێك کۆتایی هاتووە، من و تۆ بۆیەکتر نابین.

کاتێ چاوم بە نامەی ئەو کەوت هیچ قسەم پێنەکرا فرمێسك لە چاوەکانم هاتە خوارەوە  و رەنگم زەرد هەڵگەڕا، کە چناری خوشکم بە باروودۆخەوە منی بینی دەستی کرد بەگریان گووتی چی بووە؟، بۆ وارەنگت زەرد هەڵگەڕاوە؟.

نەمتوانی هیچ وەلامی بدەمەوە تەنها ئەوە نەبێت گوێم لەوە بوو دەگریا و هاواری دەکرد باوکە محمد نەخۆشە سەیارەکە ئامادە بکە بیبەینە نەخۆشخانە.

لەبیرمە سێ رۆژ لە نەخۆشخانە مامەوە، لەکاتەدا لەسەر ئەو باروودۆخەی خۆمەوە دەمویست قسە لەگەڵ سەناریا بکەم، نەمدەزانی چ هۆکارێك رێگربووە لەوەی واز لەمن بهێنێت، بۆیە جارێکی تر پێوەندیم پێوەکردەوە بۆ ئەوەی لە هۆکارەکەی بزانم.

سەناریا گووتی بەڵێن بدە هەموو شتەکانی من لەلای خۆت بسڕیتەوە ئەوکات پێت دەڵێم بۆچی ناتوانیم بۆ یەکتر ببین.

منیش گووتم هەموویم رەشکردۆتەوە، دڵم رێگەم پێنادات من هیچ کارێکی خراپ لەگەڵ تۆ بکەم.

بە پێکەینەوە گووتی من ناتوانم لەگەڵ تۆ هاوسەرگیری بکەم لەبەر ئەوەی باوکم رێگەم نادات، دەڵێت دەبێت شوو بەکوڕی مامی خۆت بکەیت.

منیش گووتم ئەی بەڵێنەکانی تۆ چی لێدێت نەتدەگووت من بێ تۆ ناژیم، گوێبگرە من بێ تۆ ناژیم دەمرم.

گووتی تۆ لەگەڵ ئەو باروودۆخە رادێت هیچ خەم مەخۆ، بەلام بەڵێن بدە ئەگەر من شووم کرد تۆ هیچ کارێکی خراپ نەکەیت.

منیش گووتم سەناریا تۆ تەنها دڵت بۆ ئەوە تەنگ بووە نەهێڵم تۆ مێرد بکەیت و تۆڵەی خۆم بکەمەوە گوێ بگرە من نە بەبێ تۆ دەتوانم بژم نە دەتوانم وازت لێبهێنم، ئەی نەتدەگووت محمد ئەگەر منیش گووتم وازم لێبهێنە ئەوا تۆ باوەڕم پێمەکە ئەی ئێستا چی روویداوە؟، لەبیرتە یەکەم رۆژ چیت پێگووتم گووتت محمد ئەگەر بڵێم لە نێوان من خوێندنەکەت کامەمان هەڵدەبژێریت من گووتم ئەوە پرسیارێکی زۆر قورسە کاتی خۆی بێت من وەڵامت دەدەمەوە من ئێستا ئامادەبە لە پێناوی تۆ واز لە خوێندن بهێنم و نەگەڕێمەوە تورکیا، سەناریا گیان گەر تۆ رازی بیت من تاوەکو لە ژیاندا ماوم چاوەڕێی تۆ دەکەم دە تۆش کەمێك دڵت نەرم بێت بەرامبەرم.

گووتی لای من هەموو شتێك تەواو بووە، هیچ چاوەڕوانی من مەکە وابزانم تۆ ئەقلت زۆر تەواو نیە کەسێك بەمن بڵێت تۆم ناوێت من نەك هەر نامەوێت بەڵکو جارێکی تر نامەوێت ئەو هەر ببینمەوە.

ئاخەر من تۆم زۆر خۆش دەوێت لەبیرتە دەمگووت من کەسێکم خۆش بووێت ناتوانم لەبیری بکەم نابێت بزانم هۆکاری وازهێنانت لەمن چیە؟.

گووتی بەسە ئیتر محمد من بەهیچ شێوەیەك تۆم لەبیر نەماوە ئەو کارانەی لەگەڵ تۆمکردوون رووداوێك بوو تێپەڕی، ئەوە دایکم لەتەنیشتمە ئەویش دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات.

دایکی گووتی دەزانی تۆ زۆر پێداگری لەسەر شت دەکەیت ئەگەر سەناریا خۆشی رازیبێت ناهێڵم ئەو شوو بەتۆبکات، بۆیە لەبەر گۆڕی دایکت واز لەو کچەی من بهێنە.

لەوکاتەدا تاوەکو من وویستم بۆ ئەو بەدیاربخەم من کەسێکی باش و چاکم خۆمم لەبیرکرد کە من کێم، گووتم ئاخەر من چ گوناهێکم کردووە نازانم بۆچی ئێوە وادەکەن تەنها دەمەوێت بزانم بۆچی نابێت لەگەڵ من هاوسەرگیری بکات.

سەناریا گووتی من ناتوانم خزمەتی ماڵی ئێوە بکەم بۆیە بەدوایی کەسێکی تر بکەوە، من تۆ بۆیەکتر نابین.

دوایی ئەوە تەلەفۆنەکەی داخست و هیچی تر نەمتوانی پێوەندی پێوەبکەمەوە، ناچار زۆر لە ژیانی خۆم بێزاربووم هەموو رۆژێك بیرم لەو کچە دەکردەوە، وویستم خۆم بکوژم و لە دەست ئازارەکان رزگارم بێت، بەڵام بیرم لەوە کردەوە ئەوکات دوونیاش وەك سەناریا بەپێکەنینەوە دەڵێت من بەسەر تۆ دا سەرکەوتم.

ئیتر ئەوەی لە ژیاندا بینم بۆم دەرکەوت چۆن پشیلە رەشەکان بە دەگمەن عاشقی مرۆڤ دەبن پێوەندیان لەگەڵ مرڤ دەبێت، مرۆڤە دڵ رەشەکانیش هەروان ئەگەرچی عاشقیش بن وەك پشیلە سپلەییان هەر لەگەڵ دەمێنێت.

بۆم دەرکەوت لەو دوونیایە هەرچەندە بگەڕێم کەسێك نادۆزمەوە وەك دایکم منی بەبێ بەرامبەر خۆش بوێت، لەدوونیادا تەنها خۆشەویستی دایك خۆشەویستییەکی نەگۆڕە بۆ خۆشەویستی دایك نەیاسایەکی فیزیایی نە یاسایەکی ماتماتیك هەیە شیکاری بکات، جگەلەوەی کەسێك نەبوو لەو تاقیکردنەوەیە دەربچێت رووی راستەقینەی زۆر کەسیشم بۆ بەدیارەکەوت، ئەو کەسەی دەیگووت ئازاری رۆیشتنی دایکت کەم دەکەمەوە دۆری کرد، تەنانەت نەیتوانی لەچەند مانگێك زیاتر بەرگەی باس کردنی ئەو ئازارانە بگرێت کە من چەشتوومە جا چۆن دەتوانێت لەگەڵ من ببێتە هەڵگری ئازارەکان.

ئیتر ژیان وایە هەرکاتێك باسی مردنی خۆم لەلای خۆشەویستەکەم دەکرد دەستی بەگریان دەکرد و دەیگووت مەرگم پێش مەرگت کەوێت جارێکی تر باس لە مردن نەکەی، کەچی کاتێ لە من جیابوویەوە خۆی دووعای ئەوەی لێدەکردم بمرم نەوەك ببمە هۆکاری

کێشەیەك بۆ ئەو، ئەوە یاسایی ژیانە پێوەندی بە گۆڕانی مرۆڤەکانەوە نیە زۆرێکی وەك من هاتوون و رۆیشتوون لە یاسای مرۆڤەکان لە شکاندن زیاتر هیچی تر نەبووە.

من لەگەڵ ئەودا خەیاڵی ژیانێکم دەکرد کە لەرۆژە گەرمەکانی هاویندا لە پاڵ یەکتر بین و دەستمان لە ملی یەکتر ئاڵاندبێت، ئەوکات لەگەڵ دەنگی جریوە جریوی خۆشی چۆلەکەکان کە لە پەنجەرەی ژوورەکەمان دێنە ژوورە و لەگەڵ ووتە جوان خۆشەکانی تۆ تێکەڵ دەبن هەستێکی زۆر ساردی خۆش بۆ من دروست دەکەن نەك هەرجەستەم بەڵکو بگرە رۆح و هەناویشم لەگەڵی فێنك دەبێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو خەیاڵەی خۆشەویستیەکەی ئەو بۆ منی دروست کرد بەڕۆیشتنی بیٚ هۆی دۆزەخێکی بۆ دروست کردم کە گڕکامەکان لە چاو دۆزەخەکەی ئەو هاوشێوەی جەمسەرە بەستەڵەکەکانن، ئەگەرچی دۆزەخی تۆ ئاگرێکی راستەقینە نیە من بە جارێك بوسووتێنێت و لە کۆڵی خەمەکانم بکاتەوە، کەچی لە نێو ئەو دۆزەخەی تۆ هەموو رۆژێك وەك عەبدێکی سەرلێشێواو دەسووتێم و هەموو رۆژێك لەگەڵ مردن دەست لەملانێمە تاوەکو لە شەوە درێژەکانی زستان خۆر تروسکی خۆی بەدیار دەخات، ئەوکاتیش مردن وەك تۆ بێوەفا دەردەچێت و بەبیٚ هیچ هۆیەك و بیانوێك دەڕوات و بەجێم دەهێڵێت، ئەویش وەك تۆ دەزانێت ئەگەر یەك بیانووی رۆیشتنی هەبێت من هیچ ئازارێك ناکێشم.

سەناریا ئەو کچە بوو وەك فریشتەیەك هاتە نێو ژیانمەوە، بەڵام وەك شەیتانێك لە نێو ژیانم دەرچوو، هاوارم دەرکرد خودایە نازانم بۆچی هەرچی کەسێکم خۆش بووێت دەبێت لەدەستی بدەم ئیتر لەمەودوا تەنها رۆحی خۆم خۆش دەوێت بۆ ئەوەی ئەویش لەدەست بدەم.

چۆنی بۆ دەچوو هەروا دەرچوو، لەبەر ئەوەی دوایی گەڕانەوەم بۆ تورکیا بەهۆی بیرکردنەوەیەکم زۆرم لە سەناریا هەستم دەکرد دڵم زۆر ژان دەکات، بۆیە ناچار چوومە لای دکتۆر دوایی پشکنینێکی زۆر دکتۆر گووتی تۆ بەهۆی زۆر خەمخواردنەوە دڵت تووشی نەخۆشییەك بووە هیچ چارەسەرێکی لەسەر رووی زەوی نیە، ماوەیەکی زۆرت

لەژیاندا نەماوە، ئیتر سەناریا بەهۆی تۆوە مەرگم ناسی هەر بۆیە مەرگیشم خۆش دەوێت.

لەوکاتەدا من هیچ بیرم لەخۆم نەکردوە خێرا بیرم لە خێزانەکەم کردەوە کە دوایی من کێ یارمەتیەکی خێزانەکەم دەدات، لەکاتەدا من هێند بیرم لە خێزانەکەم دەکردەوە بیرم لە نەخۆشییەکەم نەدەکردەوە، ئەی خوشکە بچوکەکەم لەدوایی من بەکێ بڵێت دایکە، باوکە پیرەکەم چۆن بتوانێت خەرجیماڵەوە دەربکات، ئەو ئافرەتەی وەفریشتە هاتە نێو ژیانمەوە تەنها ژیانی منی لەناو نەبرد ژیانی یەك خێزانی لەناو برد.

لەگەڵ هەموو ئەو کێشانەی رووبەرووم بۆتەوە هەرگیز چۆك بۆ ژیان دانادەم، رێگە نادەم ژیان بەکەوتنی من بێتە قاقای پێکەنین، سەرناریا هەرچەندە ئازاری زۆری دام لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی دوعای خراپی لێبکەم، تەنها ئەوە نەبێت دەمگووت ژیانی من لە دوایی تۆ چۆنە ژیانی ئەویش هەروەك منی لێبێت، زۆر زیاتر نەمتوانی لە وولاتی تورکیا بمێنمەوە دکتۆر ماوەیەکی زۆری بۆ دانەناوم، لەبەر ئەوە گەڕامەوە عیراق بۆ ئەوەی هەرچی نەبێت لە نێو خێزانەکەی خۆمدا بمرم، بەرلەوەی رۆح لەگیانم دەربچێت جارێکی تر ئەوان ببینمەوە.

رۆژ لەدوایی رۆژ هەستم بەلاوازی زیاتر ناخۆشتر دەکرد، بۆیە بڕیارمدا بەرلەوەی بمرم ئەو رۆمانە بنووسمەوە، لەکاتی نووسینەوەی رۆمانە زۆر هەستم بە بێتوانایی دەکرد، زۆر بیری سەناریا دەکەم لەگەڵ ئەوەی ئەو ئازارێکی زۆری منی داوە، بەڵام هەست دەکەم تاوەکو ئێستا ئەوم هەر خۆش دەوێ، هێندەی وێنەکانی ئەو ئازارم دەدات هیچ ووشەیەکی ئەو هێندە ئازاری نەداوم من لەشەو تاوەکو بەیانی قسەم لەگەڵ وێنەکانی دەکەم ئەوان بەبێدەنگی ئازارم دەدەن، لەلایەکی تر نەخۆشییەکەم پەیتا پەیتا لاواز و بێهێزم دەکات، دەزانم ژیان دەیەوێت بە چۆکم دابدات و پێم پێبکەنێت، لەبەر ئەوە دەمگووت دەبێت بەرلەوەی بمرم لە داخی ئەو بە پێکەنینەوە بڕۆم.

بارووده‌خم تا ده‌هات خراپتر ده‌بوو هیچ بیرم له‌ نه‌خۆشیه‌كه‌م نه‌ده‌كرده‌وه‌ ته‌نها بیرم له‌لای خێزانه‌كه‌م و سه‌ناریا بوو، له‌وكاته‌دا پوورم شه‌وین هاته‌ ماڵی ئێمه‌ و چاوی به‌من كه‌وت گووتی محمد ئه‌وه‌ بۆی ره‌نگت وا گۆڕاوه‌ ده‌زانم هه‌ربیر له‌و كچه‌ ده‌یكه‌یته‌وه‌، ئیتر ئه‌و كچه‌ له‌بیر بكه‌ ئه‌گه‌ر ئه‌و تۆی به‌ڕاستی خۆش بویستایه‌ ئه‌وا هه‌رگیز تۆی به‌جێنه‌ده‌هێشت.

هیچ شتێكێت هێنده‌ دڵی ته‌نگ نه‌ده‌كردم ته‌نها ئه‌و قسه‌یه‌ نه‌بێت ده‌یانگووت ئه‌گه‌ر ئه‌و كچه‌ تۆی به‌ڕاستی خۆش بویستایه‌ نه‌یده‌توانی تۆ به‌جێبهێڵێت، گووتم ئاخه‌ر پووریێ چۆن شتی واده‌بێت مرۆڤه‌كان به‌درۆ یه‌كتریان خۆش بووێت.

گووتی كوڕم هیچ كاتێك خۆت به‌ دۆڕاو مه‌زانه‌، سه‌یری ژیانی من بكه‌ زانیوته‌ برا كه‌مو كورته‌كه‌م هێرش دوایی بیست ساڵ چووته‌وه‌ نازه‌نینی ژنی هێناوه‌ته‌وه‌، ده‌ڵێت ده‌بێت مێرده‌كه‌ی ته‌لاقی بدات من ئه‌و ده‌هێنمه‌وه‌ و تۆڵه‌ی ئه‌وكاتانه‌ی بۆ ده‌كه‌مه‌وه‌ كه‌ ئازاری زۆرم داوه‌، نازه‌نینیش له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هێرشی خۆش ده‌وێت هاتۆته‌وه‌ لای.

چی پووریێ ئه‌وه‌ شتێكی گه‌لێك سه‌یره‌ چۆن شتی واده‌بێت؟.

پوورم گووتی دوایی ئه‌وه‌ی من و نازاه‌نین ته‌ڵاق دراین، فاخیری برای سه‌ره‌داوێكی له‌ باره‌ی مردنی دایك و باوكی به‌ده‌ست كه‌وت، بۆی روون بوویه‌وه‌ كه‌ داپیری ده‌ستی هه‌بووه‌ له‌ كوشتنی دایك و باوكی، داپیری فاخیر دایكی فاخیری زۆر خۆش نه‌ویستووه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ پلانی ئه‌وه‌ داده‌نێت كه‌ چۆنی ژیانی ئه‌و ئافره‌ته‌ فریشته‌یه‌ وه‌ك شه‌یتان تێك بدات، له‌وكاته‌دا دایكی فاخیر كوڕی خوشكی خۆی كه‌ له‌ته‌مه‌ن هێنده‌ی دایكی فاخیر ده‌بێت رێگه‌ی بۆ خۆش ده‌كات بۆ ئه‌وه‌ی هه‌رچی نه‌بێت سكسی له‌گه‌ڵ بكات و دواتر تاوانباری بكات، ئیتر رۆژێك باوكی فاخیر ده‌چێته‌ ده‌ره‌وه‌ و ئه‌و كوڕه‌ ده‌چێته‌ ماڵی فاخیر، داپیر فاخیر بۆ ئه‌وه‌ی كوڕه‌ خوشكه‌كه‌ی به‌ئاسانی كاره‌كه‌ی خۆی بكات فاخیر و خوشكه‌كه‌ی به‌ بیانوێك ده‌باته‌ ده‌ره‌وه‌، دوایی ئه‌وه‌ی ماڵه‌كه‌ بۆ ئه‌و كوڕه‌ چۆڵ ده‌بێت

دەیەوێت دەستدرێژی سکسی بکاتە سەر دایکی فاخیر، بەلآم دایکی فاخیر زۆر بەرگری لەخۆی دەکات و چەقۆیەك لە کوڕەکەدەدات و بریندار دەکات، ئەو کوڕەش لەترسی ئەوەی کارەکەی ئاشکرا دەبێت دایکی فاخیر دەکوژێت، دوایی ئەوە بڕیاردەدات باوکی فاخیریش بکوژێت رابکات، ئیتر باوکی فاخیر کاتێك دەگەڕێتەوە ماڵەوە لەلایەن ئەو کوڕەوە بە چەکوش لەسەری دەدرێت و گیانی دەردەچێت، ئەو کارە لەنێوان داپیری فاخیر و ئەو کوڕە دەشاردرێتەوە، بەرلەوەی ئەو کارە ئاشکرابێت ئەو کوڕە خودا هەقی لێوەردەگرێتەوە دەکوژرێت، ئەوکوڕە بەرلەوەی بمرێت دەزانێت مردنی نزیك بووە هەمووشتێك ئاشکرادەکات، بۆیە فاخیر دەچێت وەك تۆڵەکردنەوەیەك داپیری خۆی دەکوژێت، مامی فاخیر دەڵێت لێت خۆش نابم تاوەکو پارەی خوێنی دایکم نەدەن، لەوکاتەدا بۆ ئەوەی فاخیر نەکەوێتە بەندیخانە، هەڵدەستێت نازەنینی خوشکی بە پارە دەداتە پیاوێکی زۆر پیری دەوڵەمەند، ئیتر ئەو ژنە لەلای ئەو پیاوەیە تاوەکو ئێستا، بەلآم ئێستا هیرشی برام ئەوی هێناوەتەوە دەڵێت دەبێت مێرد بە من بکەیتەوە، سەیرکە لەبەر ئەوەی نازەنین هێرشی زۆر خۆش دەویست ئێستا رازی بووە بەوەی بگەڕێتەوە لای ئەگەرچی هێرش ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆری دەدا، ئێستا هێرش لەگەڵ کوڕەکانی پیرە پیاوەکە تووشی کێشە بووە، جگەلەوەش کوڕەکەی هێرش هەڵساوە بە گوللە لێدان لە پیاوێك ئێستا هەلآتوون و هەر رۆژێك و لە خانوویەکن بینوتە خودای گەورە چەند ریسوای کردوون، تۆ سەبرت هەبێت خودا هیچ هەقێك لەسەر کەس ناهێڵێتەوە.

بۆ خاتری خودا وامەڵی پووریێ حەزناکەم سەناریا هیچی بەسەر بێت، سەناریام تاوەکو ئێستاش خۆش دەوێت، ئەگەرچی ئەو منی خۆش ناوێت بەلآم من بەجۆرێك عاشقی ئەو بوویمە ناتوانم دوعایی خراپی لێبکەم.

ئیتر ماوەیەکە لەگەڵ نەخۆشییەکەم دەجەنگم بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك هەست بەدەردەکانی من بکات خەریکە دوونیا بەجێدەهێڵم، نەخۆشییەکەم هێندە زۆری بۆ هێناوم ئێستا ناتوانم بە پێیەکانی خۆم بە رێگادا بڕۆم، هەست دەکەم ئەمڕۆ کۆتا رۆژی

ژیانمە بۆیە داوام لەخوشکم کرد من بەرێتە سەر گۆڕی دایکم و دواتریش بچین بۆ سەر رووبار تاوەکو ئەو رۆمانە بخەمەناویەوە و هیچ کەسێك سەبارەت بەژیانی پڕ لەئازاری من خەم نەخوات نەبمە هۆیی ئەوەی هیچ کەسێك دڵی تەنگ ببێت، لێرەدا کۆتا ووشەکانی ژیانم دەنووسم :

ئێستا ژیانم زۆر نزیکە لەمردن گەورەترین خەمی من ئەوەیە لەدوونیا خەمم لە هەمووشتێك و هەموو کەسێك خوارد تەنها خۆم نەبێت لە کۆتایدا بۆم بەدیارەکەوت تەنها خۆمم گرنگ نەك شتی تر.

ژیان هیچ کاتێك خۆشی تیادانیە هەروەك گووتم هیچ کاتێك سەرکەوتن لە ژیاندا بوونی نیە، لەبەر ئەوەی هەریەکێك لە ئێمە لەنێو ترس و کێشەیەکدا ژیان بەسەر دەبات، هەرکەسێك و بە دەردێکی خۆیەوە دەناڵێنێت، دکتۆرێکم بینی زۆر سەرقاڵبوو تەنها بیری لای کۆکردنەوە پارە بوو کەچی خێزان و منداڵەکانی سواڵی سۆز و خۆشەویستیان دەرکرد، مامۆستایەکم بینی کەمی مووچەکەی ژیانی لێ تاڵ کردبوو، بازرگانێکم بینی هێندە بە پارە و تەلەفۆنکردنەوە خەریك بوو هاتبووە لای دکتۆر دەیگووت مێشکم ژان دەکات، خزمەتگوزارێکی پاکرەوەم بینی گەرمی هەتاو ساردی ژیان لەگەڵ ئەودا فرمێسکی بەچاوەکانی دەهێنایە خوارەوە، پیرێکم بینی نەخۆشییەکانی تەنگی پێهەڵچریبوو، پیاوێکی ئاینیم بینی ترسی خودا و جەهەنەم وەك شێتی لێکردبوو، گەنجێکم بینی بەهۆی دەردی دووری خۆشەویستەکەی دڵی هیچ ئارامی نیە و دوونیا لەبەر چاو کەوتووە و کەوتۆتە سەرچۆك و هیچ هێزێکی نەماوە، زیندووە بەلاٌم ژیانێکی وەك مردووی هەیە، ئەوکات تێگەیشتم دەردی عیشق لە هەموو دەردەکان گرانترە، زۆر کەسم لە میللەتی جیا جیا بینی هەموویان خاوەنی یەك دەرد بوو ئەویش عاشق بوون بوو بەکەسێك یاخود بەدەستی عیشقی کەسێکەوە دەیان نالاٌند، بۆیە عیشق بەر بلاٌوترین دەردی جیهانە کە هیچ چارەسەرێکی نیە جگە لەگەیشتن بە مەعشووق.

ژیان وەك پاسێك وایە هەروەك چۆن لە خاڵی دەست پێکردنی پڕ لە خەڵك دەبێت، هەرلەگەڵ گەیشتنی بە خاڵی کۆتایی ئیتر بەتاڵ دەبێت، کەسەکانی نێو پاسەکە هەریەکە بە ئامانج و مەبەستێك سواری ئەو پاسە بووە، هەرکاتێك کەسێك دەگات بە مەبەستەکەی خۆی دادەبەزێت، کەسانێکیش هەن بە هەڵە سواری پاسەکە دەبن ئەوان هەرگیز بەو ئامانجەی هەیانە ناگەن و بەناچاری دڵ شکاوی پاسی ژیان بەجێدەهێڵن، بۆیە لە هەڵبژاردنی پاسی ژیانت هەڵەکردن زۆر کوشندەیە، لەبەر ئەوەی لە کۆتایی بەناچاری دادەبەزیت و بە ئامانجەکەشت نەگەیشتووی، منیش هەروابوو وابزانم پاسێکی هەڵەم هەڵبژارد بۆیە بەناچاری بەرلەوەی بە ئامانجەکانم بگەم دەبێت دابەزم.

بەڕاستی ژیان تۆ زۆر بێبەزەیی من تەنها ئەوکاتەی منداڵ بووم یاریم بە تۆ کرد، کەچی تۆ تەمەنێکی دوورو درێژە یارم پێدەکەیت هێشتا بیزار نەبوویت لە یاری پێکردنم.

ئەوەیە کۆتایی ووتەکانی من هیچ کاتێك دڵتەنگی ئەو نەبوویمە دوونیا بەجێدەهێڵم تەنها دڵتەنگی ئەوەم لە دوایی مردنم سەناریا دەڵێت من لەسەر هەق بووم ئەوە خودا تۆڵەی منی لێکردەوە، کەچی ئەو نازانیت ئەوەی من بەرەو مردن برد جێهێشتنی تۆبوو، ئیتر دەڕۆم و داواکارییەکانم لەمەودوا بەخودا دەڵێم، بزانە من چۆن بووم بۆ تۆ تا لەژیانمدابووی دلخۆشم کردیت، ئێستا بە مەرگیشم هەر دڵخۆش دەبیت...

لەژانمدا تەنها رژانی دوو فرمێسك زۆر ئازاری داوم... فرمێسکێك کە بۆ بەلەدەستدانی دایکم رشتم زۆر ئازاری دام بەڵام بەرەومەرگی نەبردم، فرمێسکێك کە بۆ خۆشەویستەکەم رشت ئازاری زۆر زیاتر بوو تەنانەت ئەو فرمێسکە منی لە لێواری مەرگ نزیك کردۆتەوە هەر بەهۆی ئەویشەوە دەمرم، فرمێسکم یەکەمم بۆ کەسێك رشت کە شایەنی رژاندنی فرمێسکی هەبوو، فرمێسکی دووەم بۆ کەسێك بوو نەشایەنی ئەو دڵە پاکەی منی هەبوو نە شایەنی فرمێسك رژانی هەبوو، بۆیە فرمێسکی یەکەم ئازارەکەشیم خۆش دەوێت، کەچی فرمێسکی دووەم فرمێسکی مەرگم بوو بۆ کەسێکی هەڵە...

بەشەرمەوە دەگەڕێمەوە بارەگای خودا، لەبەر ئەوەی گەر خودا پرسیارم دەربارەی مرۆڤەکان لێبکات چ وەلأمێکی ئەو بدەمەوە، بلێم شەیتان دەست بەرداری کاری خراپبووە و مرۆڤەکان لەجیگای ئەو بوون بەشەیتان کاری خراپ دەکەن....

لەگەڵ تەواو بوونی رۆمانەکە هەموو راستیەکی ژیانی ئەو کوڕە داماوەم بۆ بەدیارکەوت، بەلأم دەمگووت ئەوە تەنها رۆمانێکە و دوورە لەڕاستی چۆن دایکێك هەیە بەم شێوەیە مندالی خۆی خۆش نەوێت، من سەیری دایکی خۆم دەکەم وەك فریشتەیەکە بۆ من تا ئێستاش هیچ دایکێکی لەو جۆرەم نەبینیوە،  یاخود چ کەسێك هەیە خەمی دابڕانی خۆشەویستەکەی بەرەو مەرگی ببات، تۆ بلێت ئۆندەرش وەك ئەو کوڕە منی خۆش بوێت، نەخێر باوەڕناکەم خۆ ئەوە تەنها رۆمانێکە.

ماوەیەکی زۆرە لە ژوورەکەی خۆم نە چوومەتە درەوە، بە تەواو کردنی ئەو رۆمانە ئازارێکی زۆرم چەشت بەلأم بەوە دلی خۆم خۆش دەکرد دەمگووتی شتی لەو جۆرە لە راستیدا بوونی نیە، بڕیارمدا بۆ ئەوەی ئارامم ببمەوە رۆمانەکە بگەڕێنمەوە شوێنی خۆی.

دوایی ئەوەی رۆمانەکەم دانایەوە نێو قووتووەکە و  خستمەوە نێو رووبارەکە لەسەر ئاوەکە وەستابوو نقووم نەدەبوو وێنەی ئەو کچەم دەبینی وەك شەیتان وابوو، ئەگەرچی من تەنها پێم رۆمانێك بووی بەلأم لە ناخی دلم نەفرەتم لەو کچە دەکرد.

رۆمانەکە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر من بەجێهێشت و لەوە دەترسام ئەو گۆڕانکارییەی ئەو دەیگووت لە ژیانمدا رووبدات، بەلأم دوایی گەڕانەوەمان بۆ شار زۆر بیرم لە ئۆندەر دەکردەوە پڕ بەدلْ حەزم دەکرد ئەو ببینم بزانم ئەوە باروودۆخی چۆنە، بۆیە بڕیارمدا بگەڕێمەوە بەریتانیا گووتم ئەگەر هەرچی رووبدات دەبێ بەرگەی بگرم وەك محمد بەهێز بم و نەکەوم.

سەبارەت بەگەڕانەوەم بۆ بەریتانیا لەگەڵ دایکم قسەمکرد، گووتی رێگەت نادەم بەتەنیا بگەڕێتەوە ئەو شارە، من چی بکەم ئەگەر ئەو کوڕە زیانت پێبگەیەنێت، بۆیە بە ماکوانی کوڕی خوشکم گووتووە لەگەڵ تۆ بۆبەریتانیا بێت.

چی دایکە ئاخەر چۆن دەبێت من لەگەڵ ئەو کوڕە بچم بۆ دەرەوە، دواتر خەڵك چ قسەیەك بە ئێمە دەڵێن؟.

خەڵك هەرچی دەڵێن بابیڵێن من بڕیاری خۆم داوە یان دەست بەرداری خوێندنەکەت دەبیت یا دەبێت ئەو کوڕەت لەگەڵ بێت.

منیش بۆ ئەوەی خوێندنەکەم لە دەست نەچێت جارێکی تر هەواڵێکی ئۆندەرم هەبێت، گووتم زۆرباشە با لەگەڵم بێت بەڵام ئەو کچانەی لەگەڵم دەمێننەوە رێگە نادەن ئەو کوڕەیان لەگەڵ بێت لە ماڵەوە.

دایکم گووتی من بیرم لەوەش کردۆتەوە ئێوە ماوەیەکی زۆر لەوێ نامێننەوە بۆیە ژورێکم لە هوتێلێکی خۆشی ئەو شارە بۆگرتوون.

واتا چۆن دایکە من ئەو کوڕە لە یەك ژوور چۆن دەبێت بخەوین؟.

کچم ئەوە کوڕی پووری خۆتە چۆن دەتوانێت خراپە بەرامبەر بە تۆ بکات دواتر ئەو کوڕە دەوڵەمەنترین کەسی ئەو شارەیە هەرکچێکی بوێت دەتوانێت بیهێنێت.

من نامەوێت لەگەڵ ئەو کوڕە برۆم، دواتر من ئەو کوڕەم هیچ خۆش ناوێت.

دایکم گووتی ئەوە بڕیاری منە دەچیتەوە دەبێت لەگەڵ ئەو کوڕە بچیت.

ناچار من خەریك بوو شێت دەبووم هیچ هەواڵێکی ئۆندەرم نەبوو هەرچەندەی پێوەندی پێوە دەکەم هیچ وەڵام ناداتەوە، بۆیە بە هەموو شتێك رازی بووم تەنها بۆ ئەوەی هەواڵێکی ئەوم هەبێت.

بەهەرحاڵ لەگەڵ ماکوان دەستم بەو گەشتە ناخۆشەکرد، بەڵام لە رێگا ماکوان زۆر بە شێوازێکی سەیر تەماشای منی دەکرد زۆر دەترسام بەردەوام دەستی لە دەستم نزیك دەکردەوە منیش دەستی خۆم دووردەخستەوە ئەویش بەردەوام خۆی لەمن نزیك دەکردەوە.

دوایی گەیشتنمان بە هوتێل ماکوان لە پێش چاوی من جلەکانی خۆی گۆڕی، منیش زۆر شەرمم کرد، لەبەر ئەوە بەسەریدا هاوارم کرد گووتم هەر ئێستا دەچیت ژوورێکی جیام بۆ دەدۆزیتەوە.

لەدوایی ئەوە من چوومە نێو کافتریای هوتێلەکە، زۆری پێنەچوو ماکوان هاتە لام و دوو پەرداخ شەربەتی لەلابوو، پەرداخێکی دایە دەستی من و گووتی زۆر بمبورە من پێم شتێکی ئاسایی بوو، ئیتر لەبەر ئەوەی تۆ زۆر شەرم دەکەیت داوام لە خاوەنی هوتێلەکە کردووە ژووری جیامان بۆ دابنێت، بەڵام گووتی تاوەکو بەیانی دەبێت چاوەڕێ بکەم، من بەڵێنت پێدەدەم کە جارێکی تر کاری لەو جۆرە نەکەم، ئەگەرچی دوونیا زۆر ساردە بەڵام لە بەردڵی تۆ ئەمشەو لە دەرەوەی ژوورەکەمان دەخەوم.

منیش دوایی ئەوەی بەڵێنی دا وامزانی ئەویش کوڕێکی هەروەك ئۆندەریە بەڵێنەکانی دەباتە سەر، بۆیە گووتم ئەم شەو لە هەمان ژوور دەنووین بەڵام بەیانی دەبێ هەر چۆنێك بێت ژوورێکی تر بدۆزیتەوە یا هوتێلێکی تر بدۆزیتەوە، گووتی زۆرباشە زۆر سوپاست دەکەم کە متمانەت بەمن هەیە.

دوایی خواردنەوە شەربەتەکە خەوێکی زۆر قورس دایگرتم منیش وامزانی بەهۆ ماندوویەتی رێگایە بۆیە گووتم من دەچمە ژوورەوە و دەنووم.

گووتی زۆرباشە ئازیزەکەم.

ئەو وەڵامەی ئەوم زۆر لەلا سەیر بوو بەڵام بە جۆرێك بووم نەمدەتوانی لەسەر قاچەکانی خۆم بووەستم.

بەیانی کە خەبەرم بوویەوە بینم هیچ جلێکم لە بەردا نەماوە و ماکوان لەتەك من خەوتووە، زانیم هەموو شتێك کۆتایی پێهاتووە، بۆیە زۆر بەتوونی هاوارمکرد و دەستم بەگریان کرد، زۆرم قسەی ناشرین بە ماکوان گووت، ئەویش دەگووت زۆرم شەڕاب خواردۆتەوە بە بێئاگایی ئەو کارەمکردووە.

لەکاتەدا هەموو کەل و پەلەکانی خۆم کۆکردەوە و بەبێ ئەوەی بە ماکوان بڵێم دەچم بۆ کوێ چوومەوە لای هاوڕێیە کۆنەکانم، دوایی گەیشتنم بە شوێنی خۆم هاوڕێیەکانم زۆر بەسەیری تەماشایان دەکردم، من خۆ لەلایەك دڵم خەریك بوو شەق بەرێت ئەوانیش بە سەرکردنی من و سەیرکردنی یەکتر پێدەکەنین، گووتم چی بووە بەچی پێدەکەنن.

گووتیان وەك هەموو جارێك تورە دیاریت بەڵام ئەگەر خۆشەویستەکەت ببینیت تورەییەکەت نامێنێت، ئێمە زۆر لێت تووڕەین بۆچی بە ئێمەت نەگووتووە کوڕێکی واجوان بەوەفا خۆشەویستە خۆزگە خۆشەویستەکانی ئێمەش وەك هی تۆ بیریان لێمان دەکردەوە.

زۆر سەیرم پێهات ئەوان چۆن زانیویانە گووتم کوا دەزانن ئەو لەکوێیە؟، زۆر دەمێکە پێوەندیمان نەماوە.

گووتیان چەند رۆژێك لەوەی تۆ رۆیشتیتەوە ئەو کوڕە بەردەوام بەو کەش و هەوا ساردە لە بەردەرگا پاڵدەکەوت، تاوەکو رۆژێك زۆر بەخراپی نەخۆش کەوت و جۆنی هاورێت ئەوی برد بۆ نەخۆشخانە.

ئیتر دەستم بەگریان کرد لەلایەك کوڕە پورەکەم دەستدریژی کردە سەرم لەلایەکی تر نازانم ئۆندەری خۆشەویستم چی بەسەر هاتووە، لەوکاتەدا تەلەفۆنم بۆ دایکم کرد هەموو

کارێکی کوڕە خوشکەکەیم پێگووت، کەچی ئەو گووتی ئەوە پلانی خۆمان بوو بۆئەوەی تۆ هاوسەرگیری لەگەڵ کوڕە خوشکەکەم بکەیت، دەمزانی ئەگەر بگەڕێتەوە بەریتانیا چاوت بەو کوڕە سواڵکەرە بکەوێت عاشقی دەبیتەوە، من هەر لێرە لەدڵی تۆ دەگەیشتم بۆیە نەمدەویست تۆ لەدەست بچێت.

ئەوکات خێرا رۆمانەکەم بیرکەوتەوە کە وامدەزانی دایکەکان و ئافرەت وەك فریشتەن، بەڵام بۆم بەدیارەکەوت کە هەندێك ئافرەت وەك شەیتان وان، ئەوا منیش یەکێکم لەو شەیتانانە، ئاخەر من چۆن توانیم ئەو کوڕە بەم شێوەیە عاشقی خۆم بکەم و دواتر وازی لێبهێنم، لەوکاتەدا هیچ قسەیەکم لەگەڵ دایکم نەکرد تا هەست نەکات زۆر لەو پەستم، وا خۆم دەرخست بەو کوڕە رازیم دەمەوێت شوو بەو کوڕەبکەم، کەچی ئاگری تۆڵەکردنەوە لەناخمدا وەك گرکان دەسوتا.

هەرچۆنێك بێت گووتم دەبێت بە هێزبم و ئۆندەر بدۆزمەوە پێی بڵێم من تۆم زۆر خۆش دەوێت من ئەو شەیتانەم ئێستا دەمەوێت پەشیمان ببمەوە، بۆیە پێوەندیم بە جۆنی هاورێمەوە کرد، گووتی منیش دوایی ئەوەی ئەوم برد بۆ نەخۆشخانە لەرێگا گووتی من هیچ پاریەکم نیە بۆیە ناچارم بگەڕێمەوە وولاتی خۆم نامەوێت بڕۆمە نەخۆشخانە تەنها پارەی ئەوم هەیە بگەڕێمەوە هەولێر، لێرە لەخوێندن بەردەوام نابم.

کاتێ زانیم ئۆندەر دەست بەرداری خوێندن بووە و گەڕاوەتەوە عیراق منیش بڕیارمدا بگەڕێمەوە عیراق بۆ ئەوەی بەدوایی ئۆندەردا بگەڕێم و ئەو بدۆزمەوە، لەلایەکی تریش دایکم بەگەڕانەوەی من زۆر دڵخۆش بوو هەموو کارێکی هاوسەرگیریمی لەگەڵ کوڕە خوشکەکەی ئامادەدەکرد، منش بیرم لەوە دەکردەوە چۆن بتوانم بە سەخترین شێوە تۆڵەی ئەو کارەی لێبکەمەوە.

بەهۆی ئەوەی لە هەولێر نەمدەزانی ماڵی ئۆندەر لەکوێیە، دوایی گەڕانێکی زۆر توانیم ماڵی ئەوان بدۆزمەوە، کاتێ بە سەیارە گرانبەهاکەم بۆ ماڵی ئەوان دەچووم خەڵکی ئەو

ناوچەیە بەشێوەیەکی زۆر سەیر سەیری منیان دەکرد، کە نزیك بوومەوە لەماڵی ئەوان دەمگووت چۆن لە دەرگایی ئەوان بدەم، ئەگەر ئۆندەر دەرگایی کردەوە چی بەو بڵێم؟، کاتێ گەیشتم بەماڵی ئەوان بینیم خانوویەکی زۆرسادە و جوانیان هەیە، خوزگەم دەخواست لەگەڵ ئۆندەر لە نێو ئەو خانووە بژیم، زۆرم لەدەرگادا هیچ کەسێك دەرگای نەکردەوە منداڵێکی دراوسێیان هاتە دەرەوە بەمنی گووت دادە تۆ ناسیاویی ئەوماڵەیت وەرە دایکم کاری پێتە.

دوایی ئەوەی چوومە ژوورەوە بینیم پیرە ژنێکی زۆر بیتوانا دانیشتووە و منداڵێکی زۆر جوانی لە باوەشدابوو.

گووتی کچی شیرینی ئەو ماڵە هیچ کەسێکیان لەماڵەوە نیە، تەنها ئەو منداڵەی باوەشم نەبێت لێرەیە، ئەو پیاوەی ئەو ماڵە زۆر دەمێکە نەخۆشە لە نەخۆشخانە پاڵکەوتووە، هەتاوەکو ئێستا کەسێك نەهاتووە هەواڵی ئەوانە بپرسێت ئەو تۆ یەکەم کەسیت لەو دەرگایە دەدەیت، ئەوەی راستی بێت من ناتوانم خەرجی ئەو منداڵەبکەم و خزمەتی بکەم، تۆ دەبێت ئەو منداڵە لەگەڵ خۆت ببەیت.

منیش گووتم ئەی باوکی لەکامە نەخۆشخانەیە؟، دوایی ئەوەی ناونیشانی تەواوم وەرگرت بە خێرایی منداڵەکەم هەڵگرت و ئەو پیرێژنە هێندە بیزاربوو بەبێ ئەوی بپرسێ من کەچی ئەوماڵەم منداڵەکەی پێدام.

هەر ئەوکات بەرەو ئەو نەخۆشخانەیە چووم کە باوکی ئۆندەری تیادا پاڵکەوت بوو، زۆربەترسەوە چوومە نێو نەخۆشخانەکە لەدڵی خۆم دەمگووت ئێستا لەناکاو ئۆندەر لەپێشم پەیدادەبێت، بەڵام هیچ لەو خەیاڵانەم راست دەرنەچوو، گەیشتمە نزیك ژووی باوکی ئۆندەر زۆر بەهێواشی دەرگام کردەوە و بینم پیرەپیاوێکی ریش سپی زۆر بەبێ بایەخم لەسەر یاتاخەکەی کەوتووە، کەنزیك بوومەوە چاوی بە کچەکەی کەوت گووتی کچم زۆر سوپاس بۆ تۆ کاترینای کچە جوانەکەمت بۆ لام هێنا، دەترسام لەوەی بمرم

جارێکی تر ئەو نەبینمەوە، لێم نزیك بەرەوە تۆ دەناسم ئۆندەری کورِم هێندە باسی شێوازی تۆی بۆکردووم دەزانم تۆ ناوت ئاریانەیە.

مامەگیان تۆ چۆن من دەناسیت ناوم لەکوێ دەزانیت، ئەی ئۆندەر لەکوێیە ئێستا؟.

کچی شیرینم ئۆندەر زۆر باسی تۆی بۆ کردووم، ئەو دڵنیابوو لەوەی کە تۆ رۆژێك دیتەوە لای بۆیە گووتی باوکە ئەگەرهات من ئەوکات لە ماڵ نەبووم تۆ ئەو کەل و پەلانە بەو کچە بدە، ئەو قەرزێکە بە لێنم پێیدابوو بۆی بگەرِێنمەوە، گەر ئەویش نەهات تۆ خۆت بیدۆزەوە و پێیبدە، کچی شیرینم من نەخۆش کەوتووم نەمتوانیوە خزمەتی ئەو منداڵەش بکەم، ئۆندەرش ئێستا لەلای دایکیەتی ئەوە ناونیشانەی ئەو گۆرِستانەیە کە دایکی ئۆندەری لێیە، برِۆ بۆ ئەوەێ چاوت بە ئۆندەر دەکەوێت.

سەیری کەل و پەلەکانم کرد بینیم ئەو شتانەیە کە من بۆ ئۆندەرم کرِیوە لەگەڵ نامەیەکی تیادایە، بەڵام هێندە بەپەلە بووم بۆ بینینی ئۆندەر گووتمە باوکی ئۆندەر من ئەو کچە لەگەڵ خۆم دەبەم لێرە تۆناتوانیت چاودێری بکەیت.

باوکی ئۆندەر گووتی ئەو کچەی من سپاردەی تۆیە ئاگاداری بە.

گووتم وەك چاوەکانم ئاگاداری دەبم، دەبێت ئێستا برِۆم دوایی بەخێرایی دەگەرِێمەوە، کاتی ئەو پیرەپیاوەم بەجێهێشت بینیم سەیری من و کچەکەی دەکات و فرمێسك بەچاوەکانی دێتە خوارەوە وەك بڵێت ئەو فرمێسکی کۆتاییە جارێکی تر ناتوانێت ئێمە ببینێتەوە.

حەزم نەدەکرد ئەو بەتەنیا بەجێبهێڵم بەڵام ناچار بۆ بینینی ئۆندەر ناخم وەك گرِکان گرِی دەگرت بەدڵتەنگییەکی زۆرەوە ئەوم بەحێهێشت، لەرێگا هەربیرم لەوە دەکردەوە چۆن چۆنی داوای لێخۆش بوون لە ئۆندەربکەم، بۆ ئەوەی ئەو جارێکی تر منی خۆش بووێتەوە، تۆ بڵێت جارێکی تر ئەو منی خۆش بوێت ئاخەر ئەو بەهۆی منەوە وازی

خوێندنی هێناوە، دەی پێدەڵێم ئێمە دەوڵەمەندین دەتوانین دواتر بە پارە بچینە دەرەوەی وولآت و بخوێنین، دڵت تەنگ مەکە ئەوتا منیش لەبەر تۆ وازم لە خوێندن هێناوە و گەڕاومەتەوە.

بەو خەیالآنەوە بەرەو گۆڕستان دەڕۆیشتم و بەهیوا بووم وەك جاران ئەو منی خۆش بوێتەوە و لێم خۆش بێت، کاتێ گەیشتمە گۆڕستان  کاترینام لەباوەشکرد و بەرەو ئەو ناونیشانە چووم کە لە کاغەزەکە نووسرابوو، خەیالم وابوو ئۆندەر بەم شێوەیە بمبینێت دڵنیام لە من خۆش دەبێت، بەو دەڵێم ئیتر ئەو خوشکەت من خۆم خزمەتی دەکەم دڵنیام گوێی لەو قسەیەی من بێت دڵی خۆش دەبێت، کاتێ ناونیشانەکەم دۆزییەوە بەتاسەوە سەیرم گۆڕەکانم دەکرد دەمویش بزانم ئۆندەر لای کامە گۆڕ دانیشتووە، کەچی تەواوی ناوچەکەم سەیرکرد ئۆندەرم نەبینی خودایە ئۆندەر دەبێت لەکوێ بێت؟، من تامەزرۆی بینینی ئەوم کەچی ئێستا ئەو نادۆزمەوە، کاتێ تەواو لە گۆڕەکەی دایکی نزیك بوومەوە بینم گۆڕێی تازە لە تەك دایکەوە هەیە، منیش هیچ بیرم بۆ ئەوە نەدەچوو ئەو گۆڕە هەمان گۆڕی ئەو کەسە کە خۆشم دەوێت و من وەك شێت بە شوێنی دا وێڵم. بەتاسەوە نزیك بوومەوە لەگۆڕەکە بینم ناوی ئۆندەر لەسەر گۆڕەکە نوسراوە باوەڕم بەچاوەکانی خۆم نەدەکرد لەوکاتەدا زۆر خولیای مردنم هەبوو لەبەر فرمێسکەکانی چاوم نەمدەتوانی ناوەکە بەتەواوەتی بخوێنمەوە هاوارێکم لەناخەوە پێدەگووتم تۆ خیانەتت کرد بۆیە ئۆندەر مرد تۆ خیانەتکاری ژیانی ئەو بنەماڵەیەت وێرانکرد، ئەو کوڕەی دڵ و گیانی تۆ بوو ژیانت وێران کردوو و بۆ گۆڕت نارد، چی بەو کچە بچووکەی باوەشت دەڵێت؟، پێی دەڵێت من هۆکاری لەناوچوونی خێزانەکەی تۆ بووم.

دوایی گریانێکی زۆرم لەسەر گۆڕی ئەو کەسەی تەمای دیداریم هەبوو، ئێستا من چی بەو بڵێم؟، تەنانەت فریای ماڵئاوای کردنیش نەکەوتم، دوونیا بەرەو تاریکی دەچێت وەك چۆن خولیا و ئاواتەکانی من ئاوابوو ئاواش خۆر خەریکە ئاوادەبێت، ناچار بەخەم و پەژاریەیەکی زۆرەوە گۆڕستانم بەجێهێشت و گەرامەوە نەخۆشخانە بینم کریکارەکانی

شارەوانی خەریکی گواستنەوەی تەرمێکن بۆ گۆڕستان، منیش گووتم دەبێ چ کەسێکی داماو بێت و هیچ کەس و کارێکی نیە لەگەڵ تەرمەکەی بچێتە گۆڕستان و بەخاکی بسپێرن؟، زۆر بەدیار تەرمەکەوە نەوەستام بەرەو ئەو ژوورە بەڕێکەوتم کەباوکی ئۆندەری تیادا خەوێنرابوو، چوومە ژوورەوە سەیرم کرد هیچ کەسێکی لێنیە، دڵم زۆر ترسا و چوومە لای سکرتێرەکە گووتم ئەو پیاوەی لەو ژوورە خەوێنرابوو ئێستا لەکوێیە؟.

سکرتێرەکە گووتی داماو پیاوی پیر تەنها کوڕێکی هەبووە ئاگاداری بێت، بەلأم بەهۆی ئەوەی کوڕەکەی لەلایەن کچێك وەك شەیتان خیانەتی لێکراوە کۆچی دوایی دەکات، ئەو پیرە پیاوە داماوە بەرگەی مردنی ئەو ناگرێت و جەلتەی دلّ لێدەدات، ئەوە داماو ماوەیەکی زۆرە لێرەیە هیچ کەسێکی نەهاتووە بۆسەردانی ئیتر ئەمڕۆ کۆچی یەکجاری کرد، کەمێك پێش ئێستا بردیان بۆ ئەو گۆڕستانەی خۆی داوای کردبوو لەوێ بنێژرێت هەڵە نەبم خێزان و کوڕەکەشی هەر لەوێ نێژراون، تۆ چ پێوەندییەکت لەگەڵ ئەودا هەیە؟.

من من هیچ... نەمدەزانی چۆن وەلأمی بدەمەوە، ئێستا گەر بڵێم من ئەو شەیتانەم ژیانی ئەو بنەماڵەیەم تێکداوە دەبێت چی بەمن بڵێت؟، لە نێو ئەو نەخۆشخانەیە نەمدەزانی چۆن بچمە دەرەوە سەرم لێشێواوە هەرکەسێك سەیرم دەکات وادەزانم هەست بەو تاوانە گەورەیەی من دەکەن، هەست دەکەم بە چاوەکانیان بە من دەڵێن تۆ تاوانباری، سەرم لێشێواوە نازانم رێگەی چوونە دەرەوە چۆنە، ئەومنداڵەی باوەشم هەردەگری وەك بڵێت ئەویش دەزانێت کەوتۆتە باوەشی شەیتانێك ئیتر نایەوێت لە نێو ئەو باوەشە بمێنێتەوە.

پاش ئەوەی لە نەخۆشخانە دەرچووم بەرلەوەی بگەڕێمەوە ماڵەوە چوومە باخچەیەکی نزیك ماڵی خۆمان و ئەو نامەیەم بیرکەوتەوە کەباوکی ئۆندەر بەمنی دابوو،

خێرا چوومە ناوسەیارەکە و نامەکەم دەرهێنا گووتم ئۆندەر دەبێت کۆتا ووشەکانی چی بێت بۆمی نووسیبێت، نامەکەم هێنا بەر لەکردنەوەی تێر تێر بۆنی نامەکەم کرد هەست دەکەم ئۆندەر ئەونامەی بە فرمێسك بارانێکی زۆرەوە نووسیوە، دەستم بەخوێندنەوە نامەکەکرد کە تیایدا نووسرابوو.

ئاریانەگیان من تۆم زۆر بەراستی خوش ویست و نەمویستووە هیچ کاتێك دڵتەنگت بکەم، بەڵام کاتێك ئەو نامە بەدەستی تۆ دەگات ئەوکات من لە دوونیاکەی ترم، باوکم خوشکە بچووکەکەم لە من زیاتر هیچ کەسێکی تریان نیە، باوکم جگەلەوەی زۆر بەتەمەنە باوەڕناکەم ئەویش بەرگەی مردنی من بگرێت، بۆیە داواکارییەکم لە تۆ هەیە کە ئەوە دواین داواکاری منە، دەمەوێت ئەو خوشکە بچووکەم ببێت بە دکتۆر بۆ ئەوەی بتوانێت ژیانی خەڵکە هەژارەکان رزگاربکات، بەداخەوە من ناتوانم ئەو هیوایەتە و ئاواتەی هەمە نە بەدی بهێنم نە بتوانم بیبینم، بۆیە داواکارم لەتۆ ئاگاداری ئەو خوشکەبچووکەی من ببیت، دڵنیابە بەمردنی خۆشم هیچ رق و کینەیەکم بەرامبەر بەتۆ نیە خۆشم دەوێت...

ئیتر بڕیارمدا بەرگی شەیتان لە بەربکەمەوە ببم بەمرۆڤ مرۆڤێك یارمەتی تەواوی خەڵکی هەژار بدەم و هەموو هیوایەت و ئاواتەکانی خۆشەویستەکەم بەدی بهێنم، وەك چاوەکانم خزمەتی خوشکە بچووکەکەی بکەم، کەچی کاتێ گەیشتمە ماڵەوە دایکم ئەو منداڵەی لەباوەشی من بینی خەریك بوو شێت ببێت.

گووتی چۆن منداڵی خەڵك بەسەر خۆتدا دەکەیتە بارگرانی تۆ زۆرت نەماوە لەگەڵ ئەو کوڕە هاوسەرگیری بکەیت، ئەمشەو تاوەکو بەیانی ئەو منداڵە لێرەدەبێت بەیانی زوو دەیبەیتە خانەی بێسەر پەریشتیاران.

کاتێ گوێبیستی ووتەکانی دایکم بووم زۆر دڵگران و تووڕە بوو ئاخەر ئەو چۆن ئافرەتێکە هیچ هەیست سۆزی نیە بۆ منداڵێك کەنازانێت کێ دایك و باوکیەتی نازانێت هیچ قسەیەك بکات، دایکم تەنانەت هەست و سۆزی بۆ منیش نەبوو دەبێت تۆڵەی خۆم لە

تۆبکەمەوە، بۆیە پلانی ئەوەم دانا هەر ئەم شەو پارەیەکی زۆر و خوشکی ئۆندەر لەگەڵ خۆم ببەم و ئەو ماڵە بەجێبهێڵم، کاتێ شەو نیوەی تێپەڕاند کارەکانم جێبەجێکرد و نامەیەکم بەجێهێشت نووسیم من بۆ دەرەوەی وولآت رۆیشتووم.

ئیتر لە پێناوی هێنانەدی خەونەکانی ئۆندەر دەست بەرداری هەموو کەس و کارەکەم بووم رۆیشتم بۆ شوێنێکی نادیار و بەهۆی ئەوەی پارەیەکی زۆرم هەبوو خوشکەکەی ئۆندەرم لەداداگا ناوی ئەوم خستە سەر ناوی خۆم.

گووتیان چ ناوێکی بۆ دابنێین؟.

لەوکاتەدا هیچ ناوێکم بە خەیاڵدا نەهات تەنها ناوی سەناریا نەبێت ئەو کچە شەیتانەی نێو رۆمانەکە خوێندمەوە، بڕیارمدا ئەگەرچی کچێك بەناوی سەناریا وەك شەیتان هەبووە، دەبێت ئەو سەنارییە ببێت بە دکتۆر و تەنها یارمەتی خەڵکانی هەژار بدات، ئەو کچە دەبێت ببێت بە فریشتەیەك هەموو خەڵك بە میهرەبانی و بە دڵسۆزییەکەیەوە بیناسێتەوە خوشیان بوێت، دەبێت شەیتانێکی وەك من فریشتەیەك پەرەوەردە بکات هیچ کەسێك نەزانێت لەلایەن شەیتانێکی زۆر خراپەوە پەروەردەکراوە.

چەند ساڵێکە بەسەر ئەو رووداوە تێپەروە هیچ هەواڵێکی خانەوادەکەم نیە نازانم دایك و باوکم ماون یاخوود نەماون، لەدوایی مردنی ئۆندەرش نەمتوانیوە هیچ کوڕێکی ترم خۆش بوێتەوە ئەوەی ئێستا بەلای من گرنگە سەناریای کچم بەسەرکەوتووی توانی بچێتە کۆلیژی پزیشکی، دڵنیام لەوەی فریشتەیەکم پەروەردەکردووە یارمەتیەکی تەواوی هەژاران دەدات، ئیتر سەناریا فریشتەیەك دەبێت بۆ رزگارکردنی گیانی خەڵکانی هەژار...

کۆتایی

2018-12-10

Roman

# Senaria

## Le nêwan Frîşte bwn u Şeîtan bwn da

Muĥemed Teĥsin Husên

